# فەرهەنگی خەم

## سەرجەمی شیعرەکانی

# **حەسیب قەرەداخی**

بەرگی دووەم



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی رۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان:
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر
س. پ. ژمارە: ١
www.araspublisher.com



**حەسیب قەرەداخی**

١٩٩٧ - ١٩٢٩



بەڕاسپاردە و ڕێنوێنیی سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان

W½«“–UÐ ÊÙÑdOâ}½e| ˙WÐ

دیوانی فەرهەنگی خەم

سەرجەمی شیعرەکانی: حەسیب قەرەداخی

بەبۆنەی فیستیڤاڵی یادی شاعیر لە ڕۆژانی ٦ و ٧ی ئاداری ٢٠٠٢ لە هەولێری

پایەتەختی هەرێمی کوردستان

چاپ کراوە

# قەڵەم و بارزانی

هۆ... کوردستان، کەی بانگ دەدەی
بێم بۆ جەژنی ئاوەدانیت؟
شیعر بکەم بەشاباشی ئەو شاییبە و
ببمە کاکە مەمی خانیت!
لە میحرابی بارزانیدا نوێژ دابەستم
بەرماڵەکەم گۆمی وان بێ،
ئاگرەکەی باوەگوڕگوڕ هەتوانی گلی چاوان بێ!
کوردایەتی بۆ هەموومان، ماڵە گەورەکەی باوان بێ
شکۆداربێ یادی نەمران
ئازادی بۆ ئازادی خوا و هەژارانی کوردستان بێ!
ئازادی بۆ ئازادی خوا و بەشمەینەتی کوردستان بێ.
تەقدیسم بۆ بارزانی بێ و خۆشەویستیم بۆ (بارزان) بێ.



ناوی کتێب: فەرهەنگی خەم – سەرجەمی شیعرەکانی: حەسیب قەرەداخی
بەرگی: دووەم
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ١٢٢
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: شکار شێخ عەفان نەقشبەندی
خۆشنووسیی بەرگ: هونەرمەند محەمەد زادە
پۆرترێتی بەرگ: ئازا حەسیب قەرەداخی
پیت لێدان: ئاراس ئەکرەم + نادیە عەزیز + دلاوەر صادق ئەمین
هەڵەگری: بەهات حەسیب قەرەداخی + ئازا حەسیب قەرەداخی + ئەمیر داود + شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر– ٢٠٠٢
تیرێژ: ١٦٠٠ دانە
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (١٤)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

## بۆ شێخ محمودی نەمر

١٩٩٢/١١/١

(وەک شێخ محمود نەک میزەرم پێڵاوەکەم توند دەهاوم
بۆ ئەو کەسەی لەسەر گۆڕی باوەگوڕگوڕ بێژنک دەداتە بەرچاوم)
حەفتا ساڵە بەستەی ئێمە دێوانەیە
دێوانەی ئەو داستانەیە...
شێخی نەمر نووسیویەتی لەسەر تەوێڵی بازیان.
لە پێدەشتی ئاوباریکا،
لە ڕۆژگارێکی تاریکا،
من لە هەمان کۆڕی زیکرا بووم بەدەروێش...
پەرچەمی شێخی خۆم هەڵگرت دەستم دا بەکەللەی دەفا بووم بەسۆزێ،
هۆ هۆ باوکە، هۆ هۆ باوکە وا من سووتام...
هەروام بەدوای لەشکرتەوە، وەک بێچارە هەڵنەتووتام!
هەرچەند دەمویست دەستم بگاتە خنجەرت، سەرپەنجەیان دەقرتانم
باری هەزاران تۆمەتیان دەخستە سەر دەفەی شانم!
من دەروێشی بارەگات بووم... هۆ باوەگیان هەر ئەوەش بوو هەتا ئەمڕۆش،
ژەمی بێ خەم نەخرایە سەر سفرە و خوانم
هەر ئەوەش بوو، ژەمێ تێربم... دەیانی بێ ئاو و نانم!
حەفتا ساڵە خنجەرەکەت لە کێلانا ژەنگ لێی دەدا،
مێژوو بازی بۆ هەڵدەدا...
وەکو پێویست نەئەو لە زاخاو دراوە...
نەبازێکمان بۆ گیراوە!
حەفتا بەردەقارەمان تۆماری ڕوودا و دەکات...
خۆی هەڵدەخات
جار بەجارێ ئاوازێکی نوێ سەر دەخات
بەبەستەوە داستانەکەی تۆ دەبێژێ،
بڕوای بەمێژوو نەماوە، داخی دڵی لای شاعیران هەڵدەڕێژی
هۆ باوەگیان، ئەو بوو بۆمی گێڕایەوە:
هەر ئەو ڕۆژەی تەخت و تاجی میری میران پێچرایەوە...
– من بەستەکەم لە دەم وەرگرت وتم ئیتر:



لەو ڕۆژەوە وشەم بوو بەهەتاو و تین
بەستەم بوو بەشێوازی دین
مامە خەمەی ڕێی بێ بەشیت ڕووی کردە ئەو هەندەرانە.
مافی گەلانیان بەش دەکرد،
ڕووی خۆیان و باوباپیریان تیا ڕەش دەکرد!
تفی کرد لە ئەگەرەکان، لەمەرجەکان کە بۆ تۆیان داڕێژابوو
دەستی برد بۆ سەری تاڵێ لێفەی درۆی پیادرا بوو!
سوورەی چاوکاڵ ڕێی لێ گرتی، سوورەی چاوەکاڵ ڕێی لێ بڕیت...
موشیرێکی سلێمانی زۆری کڕیت!
لەو ڕۆژەوە شۆڕەسوارێکی قارەمان، گۆچانەکەی ئەحمەد پاشای کرد بەقۆڵا،
دەستەویەخە. لەگەڵ سوورە چاوکاڵەکان ڕووبەڕوو بوو...
زۆر بێژەکان زۆیان ڕێساو کەمیان پێ بوو.
ئەم دیویان کرد، ئەو دیویان کرد...
– هەلوور بلوور تەکامە... زەرد و سوور و شەمامە
ئاوە بارە... دەنکە زەرە... مێخیان کوتا مێخ هەڵبەزی
تیکەی ڕاستیان کوردی گەزی!
وتیان شێخمان سەرە ڕویە...
(ساحێب، ساحێب... بمان بەخشە ئێمە ڕوومان هەر لە تۆیە)!
سوورەی چاوکاڵ. شاری کرد بەموشیراوا،
تۆزی ژێرپێی ئەسپی سوارەی شێخی شۆخی دا بەئاوا
شێخمان وەکو شێرێ پێکراو کەوتە ناو داو،
چاوکاڵەکان موشیرەکان تێی ورووکان...
خستیانە بەر شالاوی پرس، بۆچی، بۆ وا؟
وەڵامی شێخ بوو بەنرکە و تەقییەوە...
مشکی و جامانەکەی لوول کرد وەک نارنجۆک...
هەڵی دا بۆ سوورەی چاوکاڵ
بوو بەهەڵۆی بێ چنگ و باڵ!
لە ڕۆژەوە مشکی و جامانە پیرۆزە،
لەو ڕۆژەوە موشیرەکان لەعنەتین و پاش دزەکان ڕەنگ کراون،
لە دەربارا تووتکەی کلک و گوێ بڕوان!

لەو ڕۆژەوە خنجەرەکەی شێخی نەمر وەکو پێویست،
هیچ کەس نەی کرد بە بەرۆکا.
لەو ڕۆژەوە هەر موشیرە و لەبەر دەمی داگیرکەرا دێ بەچۆکا.
لەو ڕۆژەوە دامودەزگا، بەهیمەتی چاوکاڵەکان،
دەمەزەردی تەوران دەکات...
لەو ڕۆژەوە داخم سەد داخ...
تەوری کلکدار بەڕووە، لق و پۆپی داران دەخات!
لە دەفتەری داستانمانا، کۆڕێ گیرا بۆ بارزانی...
منیش خۆم و کەشکۆڵ و دەف بووین بەکەسێک لە میوانی.
ڕووم کردە گشت سوارەکانی هەڵەت و بەردی ئەم ڕێیە،
وتیان ئاخۆ، کاکی دەروێش چ بەزمێکی تازەی پێیە؟!
هاوارم کرد دامەبەزن... دامەبەزن ترسم هەیە،
بوومەلەرزە لەڕێتاندا سەرباتەوە!
کێ بارزانی بەڕابەری خۆی دەزانێ، جارێ پشتێن نەکاتەوە!
خۆپەرستی و منمنانێ لە دڵیا بەچ نەخاتەوە!
دوێنێ چوومە سەر مەرقەدی ئاو باریک و
لە میحرابی دەربەندەکەی بازیاندا چوومە سوجدە
نێوچاوانم خستە سەر بەردە قارەمان،
بێهۆشییەک وەکو حاڵی دەروێشان بوو، داپیۆشیم و خەوم لێ کەوت...
عەقڵم سرەوت...
تەماشام کرد وا شەڕ گەرمە... دەربەند گەرووی جەهەنەم بوو،
شێخمان سواری ئەسپە شێ بوو
تاوێ بەرەو کەورگ و شاخ تاوێ بنار،
ماوزەری خۆی دەخستەکار
تێکرژان بوو، پیاهەڵچوون بوو
شریخە و شاخ، هاوار و ئاخ، بگرەوبەردە...
دڵی دەربەندی هەڵتەکان
بەشێخیان وت، بادابەزێ...
گەرووی دەربەند دەکەینەوە بۆ کوێ دەچێ؟!
شێخی نەمر دانەبەزی...



بورکان لە نوێ تاوی سەند و دڵ و دەمی زەوی پڕا،
ئای سوار گلا، ئای خوێن ڕژا!
شێخی ئێمە دانەبەزی، فەرمووی: نەفرەت لە دابەزین!
تەختی لەندەن کەوتە لەرزین!
بەڵام... ئەم بەڵامە ڕەزا قورسە...
هەر مەپرسە و لێم مەپرسە.
دوژمن ڕێگەی دۆزییەوە، کە بگاتە ناودەست و پێی ئەسپەکەی شێخ.
چاوی موشیر بوو بەڕەسەد...
دەم و لەوسی بوو بەپێڵاو
دڵی موشیر بوو بەزێراو
گەرووی موشیر کرابووەوە، وەک لوولە تۆپ
پاشی موشیر بوو بەجێ باسی شڵپ و شۆپ!
گەدەی موشیر بوو بە بەرمیلی پاشخوانی سیخ و گورگە...
تف لەو چاوە، تف لەو دڵە، تف لەو ورگە!
ئەسپەشێمان هەڵەنگوت و برینی شێخ موبارەک بوو
برینی شێخ بۆ ئەم بەزمە، ئەم ڕەزمەمان تەدارەک بوو!
دانەبەزی... حاڵ بەری دام... لەعنەت بارانی، موشیر بوو...
شۆڕەسواری قارەمانمان لەسەر پشتی ئەسپەشێ بوو کە یەخسیر بوو!
هەر گیرفان بوو، بوو بەداوێنی دێڵە شڕ،
هەر لەگەن بوو چاوی لەدەمی کەوگیر بوو!
شێخ یەخسیر بوو
کێ دەڵێ شێخ بەموستیلەی سلێمانی خەریکی میر و گزیر بوو؟!
دەرس وەرگرن، پێشڕەوەکان...
مەبن بەباسی کەوەکان!
مەبن بەڕازی ڕەوەکان...
ڕەوێک و دوان، ڕەومان ناوێ...
ئێمە فێری ڕەشبەڵەکین. خەومان ناوێ!
هۆ باوە  شێخ مەلیک محمود!...
ئەگەر شیعرێ بەداستانی بەردە قارەمان نەکێشرێ
سەنگین نییە!

هەر تابلۆیێک خنجەرەکەی تۆی تیا نەبێ ڕەنگین نییە!
ئەگەر باخێک  بەجۆگەلەی ئاوباریکمان نەهاتە بەر،
نامۆ بەرە
هەر نەوەییێک مێزەرەکەت لەسەر نەکات، بێ ڕابەرە!
هەر مێژووییێک پاکنووس بکەین... جێ دەستی تۆی تیانەمێنێ،
بێ خەبەرە...
بێ دەبەرە...!!
***

## پێش تۆ

١٩٩٠/٩/٨

پێش تۆ هەبوو...
لەپێش تیلەی چاوەکانتا نیگا هەبوو
پێش تەقینی گۆپکەی لێوت، چپە ماچی لێوان هەبوو!
لەپێش تەخت و بەختی سینەی پڕی تۆدا،
زەردوکاوی کێوان هەبوو!
پێشی خەندە و دەم و دووی تۆ...
بەیان هەبوو، ژیان هەبوو...
پێش بۆنی تۆ، بۆنی پەڵە و بۆی کەنێرە و بەهار هەبوو!
پێشی ئەوەی خەت و خاڵی خۆت بڕێژی،
نزار هەبوو، کەوبارِ هەبوو
پێشی ئەوەی، بێ بەخەونم،
خەجم هەبوو. شەمم هەبوو
پێش خەمی تۆ، ئاخم هەبوو، باخم هەبوو، چەمم هەبوو
خۆزگە پێش تۆ، دەرگای دڵم سەرمۆر دەبوو،
خۆزگە پێش تۆ، نە کەم دەبوو... نە زۆر دەبوو!
دڵم هەر تۆ دەتکردەوە،
ئەو گرەوەی لەناخمدا گەورە دەبوو...
هەرتۆ، هەرتۆ دەتبردەوە!
جێگەی هەموو خەمەکانی ئەمڕۆ و دوێنێ...
خۆت بەتەنها دەتگرتەوە!
***



## یەهووداکان

١٩٩١/٧/٢٢

زەمانێک پێش... یەهووداکان هێندە زۆربوون...
هەر مرۆڤێک، تێکوشەرێک، مەسیحێکی سەردەم بوایە،
هەر دار گوێزێک، دار بەڕوویێک، بۆ خاچێکی نوێت دانایە...
یەهووداکان زۆریان بەبێ خاچ و مەسیح دەمانەوە!
هەر بۆیەکیش لەداخاندا، جار بەجارێ،
بەخۆشیاندا دەڕشانەوە!
***

## چاو زەردەکان

١٩٩١/٧/٢٢

زەمانێک پێش... بەڕۆژ خۆمان دەشاردەوە
ئاردی کۆنمان بەئاشی کۆن دەهاردەوە!
شەو دادەهات،... ئۆخەی دەڵێین:
شەو وەک قەڵای مەردان وایە...
هیچ کەس چاوی تۆ نابینێ و ڕەنگە نەشزانێ چی تیایە!
کەچی کەسە چاو زەردەکان، سەگی ترسیان تێ بەردەدای...
مەلی خەویان پێ بەردەدای!
***

## های ترێ

١٩٩١/٧/٢٢

زەمانێک پێش... گوند نەمابوو،
بەست و تەبارەی باخان و ڕەزی مێوان ڕەمێنرابوون
مێو فرمێسکی تاڵی دەڕشت
هەرمێ و هەنجیر لە تینوانا خۆیان دەکوشت!
گوێزی بالآبەرز، بێ بەر بوو...
ئیتر لە جیاتی های ترێ و های هەنجیریش:
های هیتلەر بوو!
***

## بڵندگۆ

١٩٩١/٧/٢٢

زەمانێک پێش... مینبەرەکان،
جێگە ستایشی بت بوون!
ئەگەر دەتوت، ئەی خوا کوانێ؟
ئەوەندیان پەڵی زل زل، دەسرەوانە سەر و چاوت
بەبڵندگۆ...
نەتۆ خودات بۆ دەبینرا، نە خوداش تۆ!
***

## من شاعیرم

١٩٩١/٧/٢٢

زەمانێک پێش... هەر کە وتم: من شاعیرم،
پەنا بەخوا پەڵ داباری!
گەردەلوولی ناتۆرەی ڕەش، دای بەسەرما
وەکو خوێ بم،کرابمە زامیانەوە،
بێ یەک و دوو، بەدەفتەرما ڕشانەوە!
شەرمی وشە نەیگرتبوون، تا ئەوساتەش کشانەوە!
***

## جوانکیلە یەک

١٩٩١/٧/٢٢

زەمانێک پێش... جوانکیلەیەک لەناخی دڵما نیشتەوە...
دەرسات، دڵم بوو بەهێلانەی چۆلەکەی سەرتۆپی گوڵ
هەتا ئێستاش، هەڵسوکەوتی لەناخمدا شێتانەیە،
تا ئەم ساتەش دڵم وەک خۆی، وەک هەوەڵ ڕۆژ هێلانەیە!
***



## پێپیلکە

١٩٩١/٨/٢

گابەردێکی لارێ گرتوو، پاڕایەوە...
– خەبەر وایە ئالێرەوە دەمگوێزنەوە بۆ ناو پارکێ!
دەمکەن بەپەیکەری سوڵتان...
مەخابنە پیاوی چا بە، پیکێ بێنە...
دامگرەوە تا ورد دەبم، دەبمە کوچک و کوڵۆو دانە
یا بمتاشە وەک پێپیلکە بۆ بەر دەرگای قوتابخانە!
***

## ئەی هاوارە

١٩٩١/٨/٢

گۆرانی بێژێ تێپچڕان، ئەی هاوارە، ئەی هاوارە!
شنەی شەماڵی ڕێگەی دوور دەنگی یارە...
ئەی من چ بکەم چۆن هاوار کەم؟،
پەنجا ساڵە هەر عاشقی ئازادیم و
لە سایەیدا جێ ژووانێکم هەر نەدی!
کەسیش ناڵێ لەڕێی خوادا...
ئەم عاشقە چلۆن ماوە وچلۆن دەژی؟!
***

## گلەیی و ئازاد

١٩٩١/٨/٢

هەتا منت ڕاگرتبوو، وەک شاعیری دەباری خۆت...
ئای کە جوان بووی!...
وەکو نانی گەرم و ئاڵی ئێوارانی دەستی شوان بووی
تۆ، بۆ، منت فەرامۆش کرد لەناو لیستەی یارەکانتا ؟!
بۆ، جێ دەستت کوژانمەوە دەتۆ لەناو جاری جارەکانتا ؟!
ئەوە دنیا باڵاڕوانە و دەتۆ تەماشای خۆت بکە:
کە خۆت بینی باشێت نەبی، دەست و پێی خۆت لە کۆت بکە!
***

## لەعنەت... لەعنەت

١٩٩٦

ئەگەر شایە، گەر ئەتایە...
ئەگەر–صدام–ی بەڵایە!
هەر کەسی تر، ئەگەر وەکو ئەم سیانەبن،
خۆیی بن، بێگانە بن!
ئایەت بن یا حیکایەت بن!
فەقیهی سەر تەخت و بەخت
یا بەتەمای ویلایەت بن!
ئەربەکان بن یا چیلەر بن...
پاتاو خۆری خوانی خوێناویی هیتلەر بن!
هەر هەموویان بەناو و باو،
بەقوربانی (بێشکچی) بن!
بەدیار کەلاکی زوڵمەوە چەتەوڵی ئێشکچی بن!
هەرهەموویان بەناو و باو...
بەقوربانی ئافرەتێک بن لەو گەرمیانە
وا هەشت ساڵە چاوەڕوانە...
چاوەڕوانی خوشک وبراو مێرد و بابە!
هەرچی سروود و دروشمە
لای ئەو وەکو...
بڵقی سەر چاوی سەرابە!
هەموو یادێک بۆ زامی بێ پەترۆی ئەوان
وەکو سوێراو و تێزابە!
سەد و هەشتا هەزار لەعنەت...
سەد و هەشتا هەزار جنێو!
هەرچی قسەی سووک و سوێری ئەم دنیایە
لە هەمووتان... ئەنفالیست و
لە هەمووتان... ئەی ئەوانەی
بۆ باسی ئەم کارەساتە
بۆڵەیەکتان لێوە نەهات، نقەیەکتان لێوە نایە!!
لە هەمووتان ئەی ئەوانەی بۆ ئێمەی کورد





بڵندگۆیەک ناهەژێنن!
منداڵێکی چاو ئێشاومان بەلانکەیێک
ناخەوێنن!
***

## هێمن ئاسا

١٩٩٥/٥/٢٣

هەر کە بادەی دەستی تۆم دی دەرکی تەوبەم وا ڕما...
باڵی ئەندێشەم کراوە و، شەوقی شیعرم تیا جما!
من لە یەئسا خۆم دەبینی و گیانی ئەفراندن دەنوست،
بۆیە چاوتم گرت بەچاو و، بووم بەهاوڕازی تەما!
من مەیی ئەو دەست و جامەت نەشئەیێکم پێ دەدا
وادەزانم شوعلەیێکم وام لەناو عەشقی شەما!
جامت پڕبێ و، خەندە، لێوت تەڕ بکات و دەرکەوێ...
چش لە مووی چەرمووی سەروڕیش، دێمە هەڵپەرکێ و سەما!
یا دڵۆپێک عارەقەی تۆ بێتە سەر لێوی حەزم...
بۆی دەچم، ئەوسات و کاتە، وام لەسەر باڵی هوما!
سەردەمێک هاوڕێی عەزیزی سەرموغی ساڵانی بووم،
تۆ کە دەرکەوتیت، خەمێک بووی، بێجگە تۆ چم پێ نەما!
ئەی کەسی من، بێنە دەستت، جێ تەوێڵی سوجدەمە
خۆت دەزانیت ڕۆژی کۆڕەو، پیاوی بێکەس جێ دەما!
ئەو دەمەت بێنە بەقوربان، باقومێکی لێ بدەم
لێو بەبارم زەخمی تیلەت وا لە مۆخی پێشەما
چاوەکانم باخەوانن، باخی سینەت وازبکە...
وەختێ زاری تۆ دەپشکوێ، دەست لەوێ بێ و دەم لەما!
تۆ دەبینم وادەزانم بەخت و جەختم دێتە دی،
نەغمەیێکی لارولەنجەم، وام لە نۆتەی سەردەما!
***

## تۆڵە باران

١٩٩١/١٢/٢٨

وەختێ دەچم بەسوجدەدا، بۆ شەهیدان نوێژم گەرمە،
گەردی داوێنی مەزاریان فەرقی سەرمە!

ئەی هاوارە... شەهیدەکان!
پەیڤ و قەڵەم، شیعر و وتار،چەند داماون؟
وەکو منی بێ دەسەڵات
ئەوانیش دەست لەسەر چاون
برا بەخوا زۆر لە دوواوەین،
شۆڕە سوارە شەهیدەکان، جێگە ناڵی ئەسپەکانیان،
سەرتەوێڵی مانگە شەوە...
دار بەدەستێکی داوی ڕەوە،
کەچی دەرویشی شیعر و خەم، چاو لە خەوە
من چی بڵێم...
من چ وێردێ...
من چ زیکرێ، بکەم بەسۆزی ڕۆژانەم؟!
بەمەشخەڵ و چراوگی ئەم زامانەم
لەوێ پیری تۆڵەی پیرۆز، خەڵوەتییە و
ئاسمان بەرەو خۆی کێش دەکا و...
لەبەر شیپی قەمچیی دەستیا ڕایکێشاوە و،
دەڕوانێتە چاوی شاران...
چاوی یاران...
لەگەڵ هەموو قەمچییەکدا. لێی دەپرسێ:
کە(دڵشاد) و (شاکر فەتاح) شەهید کران...
بۆ، لێزەمە و شەستی تۆڵەی دا نەباران؟!
***

## ئەنفالەکان لە حەوت وێنەدا یا لە حەوت قیرائەتا

١٩٩٣/١٠/٦

١– من ژنێکم، ئەنفال هات و مێردەکەمی لەبن دەست ناو،
بردی و بردی...
لە هاوارێک– لە گەرووما بەتاساوی گەڕایەوە–
زیاتر منیش چم پێ نەکرا
پێشم وابوو ئەوە هەناسەم بۆ بارەگای خودایش نەبرا!



٢–من مێردێکم، ئەنفال هات و ژنەکەمی وەکو سێوێ
لەدرەختی باوەشمەوە خستەخوارێ...
بەیانی بوو... چاوەڕێم کرد تا ئێوارێ...
نەهاتەوە
نەم دەزانی ئاخۆ چلۆن نانێ دەخوات؟!
ئەی چۆن ئاوێ دەخواتەوە!
لەناو نێرە گورگی شەڕا چۆن لە ڕووی دێ،
کە ناچار بوو، کراسی خۆی هەڵباتەوە؟!

٣– من دایکێکم، ئەنفال هات و،
کوڕەکەمی پەلکێش کرد و لێی دابڕیم...
زووتر فرمێسک لە چاومدا هەڵدەقوڵی...
وشکایی هات!
چاوم چووە تەوقی سەرم، ڕێگەی بینایی لێ بڕیم
لەپێک خامی شینکراوم لەسەر مەمکم مراندبوو،
ونجڕ ونجڕ بەچنک بڕیم...
نە من زانیم بۆ کوێی دەبەن،
نە ئەو زانیی چیم پێ دەکەن!

٤– من باوکێکم، ئەنفال هات و کچەکەمی پێچایەوە
کچ چ کچ بوو: سینگ و مەمکی هەڵگڕابوو
چرای خۆزگەی دەیان لاوی لەبەرپێدا هەڵکرابوو!
چەتەوڵێکی چڵکن بوو،(سوورە)ی ئەنفالی لەبەر بوو،
عوگڵی عورووبەی لەسەر بوو!
بردی و بردی...
ئێستەش هەرخۆم بەخۆم دەڵێم:
باوکی نەگبەت! چۆن نەمردی؟!
٥–منداڵێک بووم... لای بەیانی،
ئەنفال ڕووی کردە دێکەمان...
دەرگای ڕۆژی لێ داخستین
باوەشی جاش و عسکەری بۆ ڕاخستین!

کام کچ جوان بوو،
کام ژن، نەرمەگۆشتی ڕان بوو...
کام کوڕ (کێری) بەئێسقان بوو...
دایاننەبەر
تا ڕووخاننە نێو پێچاڵی دوایین تەماشای ڕاگوزەر!
ئەوان لەمن بێ ئاگا بوون،
منیش لە باسیان بێ خەبەر...
وەک ڕووداوێکی بێ تەتەر
بوون بەلەعنەت بۆ سەرچاوەی زشتی قەدەر!

٦-من گوندێک بووم لەو گەرمیانە...
بەیانییەک بەتیشکی خۆر چاوی خۆم ڕشت
شەوێکی کەی ترس و خەمم پێچایەوە،
دەمی ڕێ و بان کرایەوە
لەو شوێنەوە کە خۆر هەڵدێ،
لەو خەتەوە کە قیبلەیان بۆم شەخل کرد...
ڕمووزنی ئەنفالەکان سەریان کێشا،
وەکو غەزای پێشینانیان، وەکو زریانی خوێناوی...
هەرچیم تیابوو ڕایانماڵی...
نێر و مێیان دا بەکۆڵا!
ڕێچکەی خوێنیان کرد بەخۆڵا!
ئێستە من شوێن پێی تاوانم...
نوغرۆیەکم ناوی زامانم نازانم!

٧- ئەمن کوردم... زۆر لە مێژە. ئەنفالێک هات
وتی (إنيّ) ڕابەرتانم!
ئەنفالێک هات خۆی وتی: «مەن خودی مەن» پدەرتانم!
ئەنفالێک هات و خۆی وتی: «بەن»
تاک سوڵتان و سەروەرتانم!
ئەنفالەکان! هەر هەمووتان لەعنەتین و قێزەونن
ئێوە بەقەوڵی کتێبان، لەناو مەلاسێکا ونن



ئێوە هەر بەچ دەخەنەوە
ئێوە زێیەکی بێ بنن!
نەوسنێکی چاو لە منن
کوا خەنجەرەکەی باوکمان؟
کوا دەسرازەی سەر ناوکمان؟
کوانێ مافمان؟
کوانێ سەری بەرتەنافمان؟
کوا سەرپۆشی ڕەشی دایە؟
سوخمە و کراسی دادڕاو؟
کوا سوننەتی بەقەپ بڕاو؟
مێژوو باسی لە چیدایە
بۆ ئەم ڕۆژگار و دنیایە؟

**تێهەڵکێش**

دێڵە شڕێکی نەخۆشە -مێژوو-ی ناوە!
سەدان ساڵە خۆی دەفرۆشێ...
بەکتێبی زلە زلە عەیب و عاری دادەپۆشێ!
کە -لۆزان-یان کرد بەسەگ و بەندەکانی
سیڤەریان کوشت...
بۆ دوژمنانی ئەم گەلە، قەحبەی مێژوو
کەوتە سەرپشت!
وەکو بلێیی گەلێک نییە (کورد)ی ناوبێ...
ئەگەر بشبێ ڕەنگە لالێکی بێ چاو بێ!
پەتای ئەنفال، پێشی هەزار و هەنێک بوو،
کێ هێنایە ئەم دەبەرە؟
پەڕاو؟ پرتووک؟ نێزە؟ شمشێر؟
یا پڕزانگی مالۆسێکی تەرەکیو بوو...
لە ڕیسالەی ئەلوەحدەوە هاتەدەرێ؟
وتیان دەبێ ئەم مالۆسە، ئەم پڕزانگە،
هەتا دەشتی گەرمیان بەرێ و...
ئەنفالی نوێ بخاتەوە

سەری زێرابی– البعث–یش لەنێو دەروونی صدام دا،
هەڵبا تەوە...!
تۆڵەی حەیفا و یافا و غەززە،
لە سێوسێنان بکاتەوە!
ئەی سیستمی بازاڕی حوڕ،
ئەنفالی ناو قوتووی تیایە!
بۆ ئەم کایە؟!
ئەرێ خودا مەینەتیی کورد ئیتر تاکەی دوایی نایە؟!
ئەنفال... ئەنفال!
ئەنفال... ئەنفال!
***

## هێشتا...!

چل ساڵ دەبێ ئاسەوارت لەناو شاری،
شیعرەکانما دەسڕمەوە، هێشتا ماوی!
چل ساڵ دەبێت و زیاتریش...
من تۆوی تۆ لە کێڵگەما بژار دەکەم،
تۆ هەر سەوزیت و پاراوی!
بۆ چل ساڵی ڕەبەق دەچێ، یادەکانت دەکوژێنمەوە،
هێشتا دەفتەرم هەوەڵیە...
بۆ چل ساڵی تەواوە، چاوی خۆمت لێ گێڵ دەکەم...
کەچی تۆ، هەر لەبەر چاوی!
چل ساڵ دەبێت و زیاتریش من سەرچاوەی،
باس و خواسمان وشک دەکەم...
کەچی هەر دەتەقێتەوە.
من ماندوو بووم، هێندە سەرپۆش بدەم بەسەر خۆری تۆدا!
بانگی هەڵهاتنی لە نوێ لە چاوانما دەرگای لەسەر دەکرێتەوە!
من خەریکم لە ژیانم بێزار دەبم...
تۆ عەشقێنیم بەبەر دەبڕیت
هەموو دونیا دەمگرییێنێ و بەتامی ماچێکی دزەت،
لێوی وشکم بەخەندەی نوێ بۆ دەڕێژی...
من خۆم بۆ خەم دەکێڵم و تۆ ئاهەنگم تیا دەنێژی!



من دەمەوێت لە بیرم چی، کەچی بانگت لە هۆشمایە...
چل ساڵ دەبێت و زیاتریش ساوای بۆنت،
ئەو لانکەیەی بۆم بەستبوو هێشتاکە هەر لەکۆشمایە!
ئازیزەکەم! کوانووی کپی ئەم عەشقەی تۆ
هێشتا پشکۆی لەناخایە!
زەمەن وەرزی گوڵقڕانە...
چاوەزارێکم بۆبکە، من گوڵی تۆم لەباخایە!
***

## بۆ شاعیری جوانەمەرگ– محمد حسین هەڵەبجەیی

١٩٨٩/٦/٢٧

هۆ... برالەی هەڵەبجەیی کاکە حەمە!
ئەم کۆچەی تۆیش چەشنی کۆچەکەی (کەژاڵ) بوو...
کۆچی ڕۆژێکی تاریک و کۆچی ساڵێکی ناساڵ بوو
خۆ هەڵەبجە وێرانەیە و باخی میریشی خنکاوە،
کانییەکەی عاشقانیش بێ عاشقە و... لا دیواری خەم و خوێنی تێ ڕماوە!
ئەی تۆ ئەمڕۆ بۆ کوێ دەچیت، سەفەرەکەت بۆ کام لایە؟
سەفەرەکەت ڕێکەوت هێنای– یا وەک دەڵێن... کاری خوایە؟!!!
ئاکام دەبوو هەر هیچ نەبێ، لەم تاوانە، لای بدایە
بۆ کوێ دەڕۆی برای هەژار... شیعر و گریان پێوەستی تۆن؟
وردیلەکان بێ ناز مەکە...
هەر چاوەڕێی نانی گەرمی سەر دەستی تۆن!
بەلآم هەی داخ...
ڕێی سەفەرت ڕێی کۆتایی وڕێی نەهاتە
ڕێی کوشتنی خەونی خۆشە، ڕێی کوشتنی سەد ئاواتە
ڕێبوارەکەی ڕێگەی نەهات!
لێم وەرگرە شیعرم پێیە...
نووسیمەوە بەئەشکی سوور، وەکوو توێشوو بۆ ئەم ڕێیە!
***

١٩٨٨/٣/١٩

## هەڵەبشیما

وا هەڵەبجە بوو بەشاری (هەڵەبشیما)!
وەڵام چییە، گەر بپرسین:
لە ئاین و لە فەلسەفە، تلّپە نەبێ ئیتر چیی ما؟
کە هەڵەبجە بوو بەشاری هەڵەبشیما و
کوردێک سێ پێیی لێ بگرێ...
لەناو دەست و پێی چارەوێی زۆردارانا
بێ ئابڕوویی بۆ جاڕبدەن لە کووچە کووچەی شارانا!
وا هەڵەبجە بوو بەشاری هەڵەبشیماو
خەبەر لێمان بێ خەبەرە...
(مؤذّن)ی منارەکان، هەڵەوەڕیی ئێستگەکان...
های هیتلەرە، های هیتلەرە!
کە هەڵەبجە بوو بەشاری هەڵەبشیما،
ئەهریمەن بێ و تاشێ ئەتۆم بێنێ و بیدا بەزەویدا...
دەرگا لەسەر ئەدێڤەی مەرگ بکاتەوە،
قەپاخ لەسەر توونی ڕەشی ڕشانەوە هەڵبّاتەوە...
دەڵێم چ بکەم وا کراوە،...
ئەی بۆ، شاری شاعیرانم: هەڵەبجەی جوان!
گۆڕستانی ڕاخراوە؟!

***

## تێهەڵکێشێ

با ئەندێشەم ژان بیگرێ و
داوای دایکە هەڵەبجەکا
دایکە هەڵەبجە مامانی شاعیرانی شۆڕەسوارە
دایکە هەڵەبجە دایەنی کۆرپەی شیعرە هی بەهارە!
دایکە هەڵەبجە هاوسەری باڵانبۆیە و
شارەزووری لەبەردایە...
دایکە هەڵەبجە شوخێکە وا لەجیاتی پۆیلە و کڵاو،



هەورامانی لەسەردایە!
دایکە هەڵەبجە گووارەی زەڵم و سیروان لەگوێیی دایە
دایکە هەڵەبجە بەهەشتە و (ئەحمەد موختار) لەتوێیی دایە!
شیعر لەکوێ خۆی بناسێ دایکە هەڵەبجەی تێدایە
دایکە هەڵەبجەی باڵابەرز، تاجی سەری ستەمکاری لە پێدایە!
دڵم ناهێنێ -خوانەکا- بڵێم لەکات و ساتایە...
تەختی هەزار شێت و گومڕا بەقوربانی تۆ بێ... دایە!
ئەی بۆ، گوندی (سێوسێنان) و دێیی (دوکان) و
جافەرانیش، ژاری مەرگیان لێ باریوە؟
بۆچی خودا هەتا ئێستا بەم ڕەهاتەی نەزانیوە؟!

## تێهەڵکێشێکی دی

بەرماڵەکەی ئیمام هەمزە بپێچنەوە...
با پیس نەبێ!
کوێخا نەجم لەخەو هەڵسێ، باسوار سوار بێ...
با (نارامسین)- لە (دەربەن گەور) بەرەو دەمی،
(بەلەک جاڕ) بێ!
وا تاعوون هات، تاعوونی ڕەش...
شێخ ڕەسووڵی-سۆڵە-ی ئەوبەر،
بەئاگری- دایەگەورە- لە کارەسات دەدا خەبەر
ڕەش سوارەکانی تاعوونی ئەم بەهارە،
چەمی- دێوانە- دەشکێنن
دەیانەوێ -وەکو دەڵێن- سەر بە (زەردە) دانەوێنن!
بە، گۆرانی، شاعیر بڵێن گەشتێ بکا بۆ قەرەداخ؛
هەتا دەگاتە- دوکان-ی
گوندی شۆڕەبی و ئاووباخ...
شمشاڵژەن سۆزی هەر باوکە ڕۆیە
چۆپی کێش تۆزی هەر باوکە ڕۆیە
تاعوون دەبارێ و، دێیی شێواو هەی ڕۆ!
سۆز و هاواری لەناکاو، هەی ڕۆ...

مەستی بێ شەراب هەرزەکار، هەی ڕۆ!
پیری دار بەدەست، کەفتەکار، هەی ڕۆ...
زاوای بەر دەرگای چاوەڕوان، هەی ڕۆ...
بووکی ڕازاوە، پێ و پاوان، هەی ڕۆ!
ئەڵقەی چۆپی ڕۆ، شمشاڵ لێدەر، ڕۆ...
ئاسمان، ئەستێرە، دێ، دەشت و دەر، ڕۆ...
لە کلکەی -کەڵوەش- بەڕاستا واسە
لە سێوسێناندا، ئاخۆ چ باسە؟!
باوکەڕۆ لەجێی ئامان لەرزانە...
سەرمۆری شینی باڵا بەرزانە!
سەر بێ پووشێن لە قوڕ گیراوە،
ئەڵقەی شیوەنە و لەپڕ گیراوە،
نقێم بێ ورشە و هەیاسە سوورە
سەرەتای تاعوون لە شارەزوورە!
ڕێبواری مانووی چۆپی و ڕمبازی،
بەمەرگی خودای ناوجێگە ڕازی...
وا دەتلێتەوە لە ژەهر و ژارا...
بەرەو دەشتایی و لەبەر بنارا!
ڕێگەی ڕاکردن هەر تاعوون سوارە،
ڕێی گەڕانەوەیش هەر مەرگ و ژارە!
گۆڕ هەڵتەکێنە بنوارە -گۆڕان-
هەڵپەرکێ و شمشاڵ، چاو جوانیش تۆران!
ئیتر تا ماوی، ڕابورد... سێوسێنان...
پیشانی تۆی بات، هەڵپەڕکێی چاو جوان!
– سەهۆڵی باڵای ژنێکی، کوڵ بەکۆڵی نەدایە بەرتینی هەتاو!
بەکرێوە کوژاینەوە لەبەر پێیدا، ڕچەی شکاو!

### تێهەڵکێشی سێیەم

کرێوەیە، ڕێ شەختەیە
(ئەی دایکە کورد)– بۆ کوێ دەڕۆی؟!



کوێرە ڕێکان کوژانەوە
دەخیلت بم، بۆ کوێ دەچی، تۆ و دوو کۆرپەت بەشانەوە
دڵی گەرمت ئەم دوو کۆرپە دەگرێتە خۆی؟
دادە، ئەی تۆ بەرەو دڵی گەرموگوڕی...
چ گوندێکی ویران دەڕۆی؟
خەونەکانت کام بن بەردێ، دەکات بەدەفتەر و دیوان؟
تۆ، بەم کۆچەت سۆزی مەرگی (کەژەو بەهار)ت هەڵگیرسان
ئەی، سەوزەی تۆ -ئەگەر من مام-
داخۆ بڵێی بیناسمەوە؟!
لە دامێنیا لە قوڕنیشم بەخۆم و شیعر و باسمەوە!؟
من کوردێکم کارەساتێک هۆش و هەستی
جام کردووم و
ڕێی باوەڕ و ئایدۆلۆجیای لێ گرتووم و
دەستم دایە، یەخەی خامە...
ڕەنگە بتوانێ ئازارێک لە هەڵەبجە دەرباز بکا...
من، بای ئیفلیجی لێی داوم
بەشکو ئەوێم بۆ باس بکا!...
لێوم وشکە و، چاوم بوو بەچەمی بێ ئاو...
شیعر و هیوا و باوەڕیشم،
بوون بەشووشەی پڕ و شکاو
هەرچی ئەشکی ئەم دنیایە کۆیکەنەوە و من بیڕێژم،
هەرچی وشەی ئەم دنیایە ببێ بەبەیتی شیوەن و
من بیبێژم...
بۆ مناڵێ لە سێوسێنان.
بۆ نۆ بووکی هەڵەبجەمان...
هێشتا هیچە و هێشتا کەمە!
مرۆڤ! مێژوو! فەلسەفەکان!
ڕاستە، دەڵێن: خوا بێ خەمە؟!
ڕاستە، دەڵێن: برینی کورد کوێرە برینی بێ دەمە؟!
ڕاستە، دوژمن پێمان دەڵێت: چیتان دیوە!

هێشتا هەمە؟!

***

کە هەڵەبجە بوو شاری هەڵەبشیما و
وتیان... هێشتا ئەهریمەنە و نازناوی خوای پێ دراوە!
ئەو باوەڕە، ئەو فەلسفە...
پاشا خوری کای خوراوە
نەفرەتی مەرگی هەڵەبجە و سێو سێنانی تێکراوە!

## دوا تێهەڵکێش

دەخڵ دروێنە و، خەرمان، شەنیەوێ
سووری خەرمانیش شەخت و مەنیەوێ
ڕێگەی ئازادی و پێشڕەوی کارا...
عاشق و بووکی بێ پەچە و تارا...
ئاواتی کورد و دەستی سەرخەنجەر،
شۆڕش و چەک و باوەڕ و سەنگەر!
لە نێوان گەل و هەر ستەمکارێ
ئەگەر پردێ ما، بەردی لێ بارێ!
لە هەڵەبجەوە ئیتر لەمەو دوا،
دەڕوانینە خەڵک. دەڕوانینە خوا!

## پیاچوونەوەیەک

هونەرمەندانی ئەم دنیا بێ ئاگایە!
ئادەی چیتان لەباردایە؟
مەزەنەتان هیرۆشیماو جێرنیکایە؟
مەزنەی وا زۆر بچووکە و بێ نیگایە
من چمکێکی کارەساتم لەسەردایە:
دایک ژەهر سووتاندوویە
ساوای، مەمکی لە دەم دایە!
ژێرزەمینی جمەی دەهات
هەموویان دەستە و دۆعابوون!
کە پرێشک و پارچەی بۆمبا...
بەسەریانا مەرگ هەڵنەدات



لە چرکەیەکی کاتێک دا
باڵی چاویان هەڵپڕووکا...
وزەی بینین کەوتە خوارێ.
نەیانزانی هەوری مەرگە و بەسەریاندا دائەبارێ!
لافاوی مەرگ، بەسەر شاری بێ باواندا تلی ئەدا،
ڕۆژی ڕەشی عاجباتییە
ژیان، بوو بە، دژواری مەرگ
بەم بیرۆکە نالەبارە، هەموو ملێ، ملی ئەدا!
چیتان لە توانادا هەیە؟
سەردەم ئێجگار نامەردانە،
دەست و پێی لێ هەڵبڕیوە.
دوا دواییە،
گل بوونەوەی بێ باییە...
ماتریاڵی... ئایدیایە!
ئایدیایشی، بێ بەهایە!
هەرچی وا لەتوێی کتێبی... زەرد و سوورا،
لە عاستی ئەم کارەساتە
هەڵمی ناو دەرپێی (وەعضیکی) ناڕەوایە!
هەزاران گیان لە هەڵەبجە...
بوون بەگەردی دەم ڕەشەبا
دەنگوباسی سێوسێنان و گۆپتەپەیشی نەخرایە سەر
دەپێم بڵێن، کوانێ خەبەر؟!
ئەو گوندانەی (نارامسین) و (لۆلۆ) و (گۆتۆ)
ڕەشبەڵەکیان تێدا دەگرت
ئەو گوندانەی ئەسکەندەر و هۆلاکۆیان دایە بەر بەرد!
لەناو گەرووی ئەم خاکەدا...
بوون بەهەناسەیەکی سەرد!
کەسیش نییە لێی بپرسێ، کوا ئایین و کوا فەلسەفە؟
کوا شێخ و پیر؟
نزا و تکا؟
گەوهەری تاک، بۆچی شکا؟

کوا هونەرتان هونەرمەندان...
بنووسەکان کوا خامەتان...
باتەشتێ قوڕ بگرینەوە
بۆ ئەم خەون و ئاکامەتان...!
جانەوەرێک سەرە ڕێگەی دواهەنگاوی
سەدەی بیستی لێ گرتووین و...
حیکمەتەکانی تەئریخی لەلا بایە!
لە کۆچەڕێی خەلیقەتدا لەهەر کوێیەک
زێراب هەیە،
مەفاهیمی ئەمی تیایە!
هەرچۆنێک شی بکەیتەوە، یەک ئەنجامە
پرسی ئێمەیش هەمان پرسە...
ستەم زۆڵی نەوت و چەکە،
بەری ئەم دۆخ و بارەیە...
گەدەی کوردی خۆفرۆشیش...
کیسەی بێ بنی پارەیە!!
***

١٩٩٢/٦/٢١

## جوانییت...

ویستم شتێک ڕەچاوبکەم وەک تۆ جوان بێ...
خونچەی نەودەم... گوڵی نەوڕەس...
هیچم نەدی... کەسم نەدی!
نەخێر هیچ کەس...
بڵێم بەرخۆڵەی چاوڕەشی، مەستە فرۆی؟
شووڵەنەمامی نەودەمی، تازە چرۆی؟
یا وەک خەندەی ئاسۆکانی؟!
وتیان نەخێر... تۆ لە جوانی هیچ نازانی!
وتم: بەهار؟
وتیان: بەرگی کۆنی ئەوە!
وتم: بەهەشت؟



وتیان: تەنها بۆنی ئەوە!
وتم: شیعر؟
وتیان: ڕەزمی لەنجەی ئەوە!
-ئەی (تۆپی گوڵ)؟
وتیان: دەست و پەنجەی ئەوە!
وتم: پشووی دوای ماندووبوون؟
یان خۆشترین خەون و خەویت؟
وتم: خاکمان؟
وتیان: خۆ تۆ کاکڵەی ئەویت!
وتم: نانیت! لەناو دەستی هەژارانا؟
تیشکی خۆریت لە دڵۆپی پاش بارانا؟
وتیان، هێشتا نەمزانیوە...
خواوەند کاڵای باڵاکەی تۆی چۆن چنیوە!
وتم: باوەڕ؟
وتیان: ئەویشی ناگاتێ!
– کێ پسپۆڕە، کێ دەتوانێت وەک من حەقی خۆت بداتێ؟!
وتم ئەگەر تۆ نەناسم...
گەردوون لە خۆم دەئاڵێنم!
بەبارسایی خەم و خەونم دەناڵێنم!
تۆ جوانتری لەو سروەیەی بەیانیان
چیە دەکات لەگەڵ نەرمەی لق و چڵان!
لەگەڵ گۆپکەی خونچە و گوڵان!
کە دەست دەنێمە پەناگوێم حەیران دەڵێم...
بۆ جوانیی تۆ
شیعرم لەجێی خۆیدایەتی...
وەکو کورد و کوردایەتی!
وەک گەردانە و بەرگەردنت،
وەکو گۆنا ئاڵکردنت
وتیان، دەبێ شتێک بکەم بەپێوەری نەوای نێوت
وتم: بەجوانیی تۆ قەسەم،

خۆشە وەکو ماچی لێوت
وتیان، دەبێ شتێک بکەم بەپێوەری ناز و خەمت...
وتم: بەجوانیی تۆ قەسەم...
جوانن وەکو ئەو نا، نا، یەی
جار جارێ دێتە سەردەمت!
***

## ژن و خاک و من

١٩٩٦/١/٦

وتیان: خۆ تۆ لەم سەر خاکە، نە خۆشیت دی
نە... ژیانیشت ژیان بوو!
بۆ وا شەیدای، ئەی بۆ سەری خۆت هەڵنەگرت؟
وتم: خاکێ ئەو ڕەحمە بێ. ڕۆژێ بەتۆ دووگیان بووبێ!
من چۆن نەبم بەقوربانی؟!
من چۆن نەبمە بریسکەییێک وەک ئەستێرەی نێو چاوانی؟
*
وتیان: خۆ تۆ لەم سەر خاکە، ڕۆژێک نەبوو ڕانەچڵەکێیت؟
شەوێک نەچوویتە نێو پێخەف، دڵت بەخەم نەسووتابێ؟
بۆ وا شەیدایت، بۆ نابیتە خەڵوە نشین؟
وتم: خاکێک، ئەو کلە بێ کە چاوی تۆی پێ ڕێژرا بێ،
من چۆن نەبم بەسەر گەردی؟
نەبم بەدار نەبم بەخۆڵ، نەبمە چیا و چەم و هەردی!
*
وتیان: خۆ تۆ لەم سەر خاکە، ڕۆژێک ئەمەکێکت نەدی
کەسێک نەبوو ئافەرینێک بکات بەمیدانی یەخەت!
وتم خاکێک کە هێلانەی مەلی خەونی خۆشی تۆبێ
من چۆن نەبمە پاسەوانی؟
من چۆن نەبمە وا بولبولێک جێ نەهێڵم گوێ ئاوانی؟
*
وتیان: خۆ تۆ لەم سەر خاکە، کیشەییێکی بێ ئەنجام بووی
چامەییێک بووی،



کەسێک وەهای نە خوێندبییەوە کە خودایشی لێ ڕازی بێ
ئەی بێ توێشوو!... ئەوە ڕێیەک و دووا و سیان،
خوا حافیزت
وتم: خاکێک، بەئاوی پاکی کانیاوی لێوی تۆیان تەڕ کردبێ،
هاژەی تافی تاڤگەکانی بانگیان بەگوێی تۆدا دابێ...
گەر بەهەشتم لە ڕێگەدا بۆ ڕابخەن،
من نایەڵم گیانم لەم جەستە جودابێ!
*
وتیان: خۆ تۆ لەم سەر خاکە، خەم و داخت بەبەر برا
ڕۆژت بێ تینی هەتاو بوو، شەوت کوێر و سینگ گیراو بوو...
ژەمت کەم و خەمت زۆر و هیوات پووشی سەر گێژاو بوو!
ئەی بۆ نابیت بەگەڕیدە و دەفێک بگریت بەدەستەوە
لە هەر شارێک بەزمێ بلێیی؟
وتم: خەڵکە ئێوە سەیرن...
جا، من خاکێک تۆ باخی بی و زەکێ ئالکان مەشخەڵی بێ و
بێشکچی بێ خەم نووسی ئەو،
ئەو سوجدەیەی بۆم بردووە، کفرە ئەگەر قیامی بێ!
لە دوای مەرگم، دەبێ بەستەم سۆزی گەرمی پەیامی بێ
گڵ و گیانم بگرنەوە، بۆ هەتوانی سەر زامی بێ
*
وتیان: خۆ تۆ لەم سەر خاکە جامی بادەت ئاوارەیە
هەر خۆتی و خۆت دەخۆیتەوە،
تۆ چەند ساڵە، لەم بازنەدا بۆ خۆت دێیت و دەڕۆیتەوە؟
بەڵغی جەستەت دەشۆیتەوە؟
بۆ، قومێکی وا هەڵنادەیت ئارامت کا؟ بەهەولێکی ناکامت کا؟
وتم: بەسە... کە ئەم خاکە، جامی باڵای تۆی نازداربێ،
جێ ماچی لێوی ئاڵت بێ
کە ئەم خاکە (جۆبیتەرە) (ڤینۆسی) تۆی هەڵگرتبێ...
وەکو تاجێک بەسەرەوە،
کە ئەم خاکە دەرو، ناو بێ... من چۆن دەژیم لە دەرەوە؟!
*

ئازیزەکەم، لەو ڕۆژەوە، تۆم ناسیوە،
لەو ڕۆژەوە، تۆم زانیوە...
وەکو ڕاز و وەکوو ناز و وەکو جوانیی
من وەکو ساڵی قاتیم و هەر تۆش وەک ڕێژنەی بارانی!
تۆ هەر خۆتی و بێ هاوشانی
من گوندێکی وێرانەش بم، تۆ وڵاتی ئاوەدانی!
شیعرم بووکێکی ناکامە و هەر تۆی کە،ماڵەباوانی
هۆ ژنەکە، هۆ کچەکە، هۆ پەیامی عەشق و جوانیی!
ئەوەندە ئێوەم خۆش دەوێ، ڕەنگە بڵێن...
یاشێخ، شاعیری ژنانی!
***

## نامەی... نارین

١٩٨٩/١١/٢٤

تەلەفزیۆن کرابوەوە... دەنگوباس بوو
جەنگ بوو، جەنگی بەرد باران بوو...
لە لادێ بوو لە شاران بوو
سەربازێکی چەک بەدەستی تەپلە تەپیو،
سەر کۆڵانێکی گرتبوو
باری کەرێ جبەخانەی لە نارنجۆک و لە فیشەک... هەڵگرتبوو.
بەردێ دای لەپشتی چاوی
ئیتر بۆ خۆی تاو نەتاوێ بەناو خەڵکا...
دەسرێژێکی لێ دەهاوی
کیژۆڵەیەک لەو نزیکە ڕاوەستا بوو
وابزانم خڕکە بەردێکی شاراوەی لە دەستا بوو
-نارین- کیژی دووساڵەمان حەپەسابوو
خەو لە چاویا جێی نەما بوو،
کەوتە گەڕان گلۆمتکێکی دۆزییەوە...
بۆ شاشەکە دەستی کێشا... ها، (عەتی کە)!
کیژۆڵەکەش لەو ساتەدا لای کردەوە
وەکو بڵێی گلۆمتەکەی لێ وەردەگرێ،



دەستی بادا...
دەرسات، لەسەری سەربازە، خوێنی ڕادا!
نارین چەپڵەی بۆ لێ دەداو...
منیش کردم بەم نامەیە،
کە سۆز و پەیڤی خامەیە
دەستە خوشکی فەلەستینی!
ساڵێک شیعرێکت بۆ ناردم
ئێستەش لە دڵما هەر ماوە
منیش بەردێکی (شێرکوژ)ت بۆ دەنێرم...
ئەمجارەیان لەگەڵ بڕیاری تۆڵەدا
وەک نارنجۆکێ بیهاوە!
زەیتوونەکان، کۆش پڕ دەکەن،
باخی پرتەقاڵ و لیمۆ، خۆ خڕ دەکەن
پۆلە مەلی کێوی (جەلیل) دەدەنە باڵ
لەناو مەزاری شەهیدانا، دەبن بەخاڵ
لەسەربانی مزگەوتەکان،
بانگی نوێیە، دەبێ بە(شەرقی) بۆ مناڵ!
لە شوێن ناوی فەلەستینا...
نەخشەی دەوڵەت ڕەنگ دەڕێژن،
بەناو نەخشەی سەر زەمینا
***

## داری حەد

١٩٩٤/٥/٩

هۆ شێخەکەم، من دەروێشی کەمەندکێشم
من ئازار و عەشق و هۆشم
ئەمن ڕەزمی زیکر و فیکرم
من ئەندێشەی نێو نەزەرگام،
من وێڵێکی پەڕەوازەم، قەلەندەرێکی بێ نەوام
هۆ شێخەکەم دەستی من و دامانی تۆ
ڕۆحی من و چاوانی تۆ
لەتۆ زیاتر من کێم هەیە...

ڕێگەم بدە بێمە ئەڵقەی باوانی تۆ
منم حەودەنگەی خوێندنەوەی سەرانسەری قورئانی تۆ!
من تۆم ناوێت زولەیخا بی، من یوسف نیم...
من یەعقوبی گرێنۆکم!
لەپێش دەمی قەبەسێکی چاوی تۆدا
هەتا دەمرم لەسەر چۆکم!
هۆ شێخەکەم دەخیلت بم...
وەکو قفڵی ڕازەکانم
چەند چاوەڕێی کلیلت بم؟!
خۆ تۆ لەسەر تەختی عەشقم خاوەن شکۆی
تاجی موڵکت لەسەر ناوە
قەت بیر لەوە ناکەمەوە، تۆ تەختی خۆت بڕووخێنی،
بۆ سەر کێڵگەی ئەو زامانەی کە عیشقی تۆم تیا چاندووە
جۆگەی سۆزی خۆت نەهێنی!
گڕم خۆش کە... شیعر لە چاوگەی ئەشکمدا، پتر نۆشکە!
من ئەم میحرابە بەرنادەم، پێشی سوجدەم ئێجگار قووڵە...
من خۆم دەڵێم وەڵڵا مەستم... سزای مەستیش،
هەشتا شووڵە!
نەبا، گیانی وا بەستەییم بچێتە خەو...
شووڵ کوتی کە، بامن لەسەرخۆ نەچمەوە!
هەمان عاشقە مەستەکەم...
بەداری حەد نوێ دەبمەوە!
***

## گەڕانەوە

١٩٩٥/٧/٣١

لەشێعرێکەوە دێمەوە
وام دەزانی لە ئافاتی ڕێ شێواندا،
لە گێژاوی ڕێ پێواندا... سەرگەردانە...
خۆم دێمەوە، بەڵام خەڵکی، لە ئافاتی برسێتیدا وای بۆ دەچوون:
ئەگەر بکرێت بەکولێرە زۆر چاکترە!
نەمن توانیم بیسەلمێنم شیعر گیانی کولێرەیە،



نە ئەوانیش پێمیان سەلماند کە کولێرە خودای شیعرە!
گەڕامەوە...
بڕوا بکەن هەورازەکەم بێ سەهەن بوو،
بڕوا بکەن سەفەرەکەم بێ زەمەن بوو...
گەڕامەوە...
تەماشام کرد، ڕێچکە هەموو تێکەڵاون
ئەتوت ناو لەپی خاراون
ئەو ئاوانەی وەهام دەزانی زۆرپاکن
دەرکەوت هەموویان ئاراون...!
گەڕامەوە... تەنها لەنێو چاوی تۆدا، جێگەم دەست کەوت
تەنها لەسەر ڕەزمی دڵت، دڵم بەهێواشی لێی خەوت!
گەڕامەوە... لەپشووگەی زۆر عەترینی خەونە شیعرا
دەمم خستە سەر گۆنای تۆ،
جێگەی لێوانمی کردەوە
نیگای وێڵی شیعرەکانمی بەرەوچاوانت بردەوە
کە خۆمم دی دەروێش ئاسا، سۆز و شمشاڵ و دەفێکم،
ڕووبارێکی ئێجگار خوڕم ڕەچاو کرد و خۆم تێهاوی
وەختێ بە ئاگاهاتمەوە، وتیان یاشێخ خۆت ببینە:
ئاوێنەی شیعری شکاوی!
چەپکێ فرمێسکی لوولیت و لە برژانگی خۆت ئاڵاوی
هەتا ئێستەش هەر بێ جەستەی، خنکاوی ناو گۆمێ ناوی...
تۆ لە نەتەوەی بێ جەستەی!!
تۆ لە وڵاتی سەر ئاوی!
***

## ناکۆکەکان

١١تا ١٩٩٤/٦/١٥

(پێشەکی بابەت)
گوڵ و گەرداو
پێشکەوتن و بڕوای خنکاو
کێڵگە و قوڕاو
نیشتمان و دابەشکردن

بووک و زاوا و شین و مردن
کۆتر و واشە
هەڵاڵە و لوورەی ڕەشەبا
دیرۆک و گەلی ناتەبا
کار و کرێ
لەش و قامچی و دار و زرێ!
سەری بەرز و دیمەنی کوێری سێدارە
گەلی عیراق و کوودەتای هەشتی شوبات
خەم و درۆی بێ دەستەڵات!
جووتیار و وەرزی بێ کەشی
خوا و بەندەی زۆر ڕووڕەشی
چەندە ناکۆک و ناتەبان،
منیش هێندە و هەزار هێندە ئا لەم شەڕانە بێزارم...
نۆتەی سروودی هاوارم... زۆر بێزارم!
*
ئاشتی هاوکێشی خەممانە...
تەڕایی لێوو دەممانە
کێ بەردێکی خستە چینی دیوارێکی داڕووخاومان؟!
کێ گوڵاوێکی فێنکی کردە چاومان؟!
کێ هەورێکی باراناوی ڕاپێچ کرد و بە کوردستاندا بارانی!
کێ تێگەیشت کورد یانی چی و
مەعنای خۆشەویستیی زانی!.
گشت ئەوانەیش شەڕیان ناوێ،
هەموو ببن بەبازوویێک...
بەرەودروشمی شەڕخوازان پەڵ بهاوێ...!
***

## شەڕ و ئاشتی

هۆ ئەوانەی شەڕتان ناوێ!
هۆ ئەوانەی دەست نانێنە بینی هەتاو...
هۆ ئەوانەی گورگ نین و مرۆڤ بە کەروێشک نازانن!
ئێوە گەوهەری ئینسانن...



پێ دەزانن... ئێستە سەنگەر لە کوێدایە و چۆن لێ دەدرێ؟!
ئێستە فیشەک بۆ کوێ ئەبرێ؟!
ئێستە سڵاو لەکێ دەکرێ؟!
پێ دەزانن... دابەشکەرانی کوردستان
پشتێنیان لێ کردۆتەوە...
ڕەشبەڵەکی خوێناویمان لە ئۆخەیدا دەخۆنەوە
بەفرمێسکی ڕۆڵەی کوژراو، دەست و دەمیان دەشۆنەوە!
*
پێ دەزانن... ئێمە لە کوێدا وەستاوین...
پێ دەزانن... ئێمە بەخۆمان نەشیاوین...
پێ دەزانن... گڕەو ژیلەمۆبارانە؟!
لووتی تفەنگ چەمچەی خوێنی هەژارانە؟!
کوردایەتی، هۆرەییێک بوو، بیر چۆتەوە
بەستەییێکی زۆر چەرموو بوو، ئەمڕۆ تەواو ڕەش بۆتەوە!
پێ دەزانن، کڵاشینکۆف، مانەفێستی باوەڕمانە؟!
پێ دەزانن، پاوانخوازی، مەگنەکارتای پرۆتستۆی هەنگاومانە؟!
پێ دەزانن، درۆی قەبە بوو بەهەتوانی سەردەمی برینی خەش؟!
پێ دەزانن، تەقەی قەڵماسکی ناوەخت
بۆ وەرزەکان بووە بەکەش؟
پێ دەزانن، ئاڵای ئاغا، دەستی لەملی کوێخایە؟
پێ دەزانن، دروشمەکانی سەرزمان،
بەقەد زمان بێ بەهایە؟!
شەڕی ناوخۆ مۆتەکەیە مناڵانمان دەترسێنێ...
مندالّدانی دووگیانەکان لە ناخەوە دەهەژێنێ!
***
ئەم ئاگرەی بەربۆتەوە، خەونی کێ بوو؟
بۆ ئازاری مێژووی ئێمە، چ باس و خواسێکی پێ بوو؟
ئێوە بڵێن: ئا ئەم شەڕە چی نایەوە؟
ڕووی ئەم پرسەم لە ئێوە بوو، ئاگر وەڵامی دایەوە
کڵاشینکۆفی شانی -سین- دەڵێ:
من لە بیکەیسی شانی -جیم- قەبەترم!
ئەو درێژە و ئەمن خڕم

منیش بەقەد زمانی ئەو لەشی ئازادی دەبڕم!
ئەو درێژە و ئەمن خڕم
ئەو کیژی باوکی خۆیەتی و ئەمن کوڕم
بەزنجیریش پەتم بکەن، هەر ئەی بڕم
هەر خۆم کوڕم!
*
ئەم ئاگرە کێ نایەوە؟
وەڵامی ئاگر بە ئاگر کێ دایەوە؟
بەسە، بەسە، ئیتر بەسە
قرمە قرمی چەکی دەستان، بڵێن، بۆچی نەبڕایەوە؟
گرێی دڵتان، دڵی پڕ لە کۆنە قینتان
چی بوو؟ بۆچی نەکرایەوە؟
ئەم هەڵچوونەتان هەتا کەی هەر هەڵدەچێ و
لووتی بەرزی نەشکایەوە؟
*
کوردی بەدبەخت!... ستەمدیدە، چارەنووستان لەلای کێیە؟
کێ دەرمانی ئەم پەتایەی سەرومڕی ئێوەی پێیە؟
ئەم ئاگرە بکوژێننەوە، وا ئابڕووشمان هەر چک دەکا...
دۆستی دوور و نزیکیشمان، لە نەمانی بێ شک دەکا...
بیکوژێننەوە، با زمانم تیژتر نەبێ
ئەوەی دەیڵێم نایڵێمەوە،
بەسەر باڵای شێخ ڕەزایشا، دەشکێمەوە!
کە ئەم دەستم ئەو دەستیکەم بۆ بشکێنێ،
هەردوو دەستم لەمل دەکەم!
کە ئەم چاوم ئەو چاوی دیم بۆ هەڵکۆڵێ...
هەردوو چاوم پڕ گڵ دەکەم!
*
ئەم ئاگرە، بۆ گەلی کورد بسووتێنێ؟
بۆچی شیعرمان لاڵ بکا؟
بۆچی بەری ڕێگەکانمان پڕ لە کەند و پێچاڵ بکا؟
بەعس جێما... بەعس کرمێکی گرگنە لەبەر پێما...
ئەوان و ڕیسالەی خالیدە، لەژێر پێماندا داماون!



ئێوە کوردی کورد کوژەن و لەسەربانن
ئێوە بەئێمەتان دەوت، هاوپەیمانن
بۆچی قەدری شەهیدانمان پێ نازانن؟!
ئەی ئافەرین، هاوپەیمانن!
ئەی ئافەرین، ئاگرێگی بێ ئامانن!
ئەم ئاگرە بکوژێننەوە... نەکوژێتەوە
نالی دەڵێ من کورد نەبووم!
حاجی دەڵێت، من لە کۆیەدا نەژیاوم،
قەت دیمەنی هەیبەسوڵتان وەکو گوڵاو نەکراوەتە نێوچاوانم!
خانی دەڵێ مەم وزین، من نەم نووسیوە،
من بەچاوی قەڵەمیشم میرخاسی کوردم نەدیوە!
سالم دەڵێ من و دێوانە و ئاپۆرای میری بابان؟!
پێشمەرگەیێکی خەم لەکۆڵ دەڵێت من و
سیمفۆنیای داستانەکەی چیای دابان؟!
ئێرەی وڵاتی ئەم شەڕە... زۆر بێ فەڕە،
ئێمە لەکوێ و ئیوە لەکوێ؟... ئێرە کەی بۆ ئێمە دەشێ؟!
بیکوژێننەوە... نەکوژێتەوە...
حەمدی دەڵێ باجی ڕەحمە هەزارانن!
دەم ڕووتەکان تێلا بەدەستی شارانن!
گۆران دەڵێ، من سروودی کوردستانم. بۆ وێرانە هەڵنەداوە...
هەڵۆ بەگەکەم درۆیە!
بێکەس دەڵێت: ئەی وەتەن مەفتوونەکەی من،
پەلاسی بێ تان پۆیە!
کاکە عومەری خاوەریش هاوار دەکات:
بەعس ماوە و شارەکەی من ئاشە کۆنی باوکەڕۆیە،
ئەم شەڕگەیە، کەی جێ خەونی من و تۆیە؟!
*
ئەم ئاگرە بکوژێننەوە، هاوار گەروومی دڕیوە...
مافی مرۆڤ پێشێلکردن، شیعرەکانیشمی سڕیوە
بیکوژێننەوە، با فەرهەنگی جنێوەکان نەکەمەوە،
با سلاوی تەرازووەکەی شێخ ڕەزامان

بەڕووتاندا نەدەمەوە!
با فەرهەنگی جنێوەکان ڕێگەی لێشاو نەکەنەوە،
با فەرهەنگی جنێوەکان گرەوی گشت خەمەکانم نەبەنەوە!...
بەکوێرایی شەڕخوازەکان ئاڵای ئاشتی هەڵکەنەوە!
***

## نامەی کۆتایی

من بۆ مام بۆ کاکی خۆم چی بنووسم لاتان چاکە؟
قەڵەمی من پەیکی سروودی ئاشتییە هێندە پاکە
گۆچانەکەی ئەحمەد پاشا لای کامیانە؟!
خنجەرەکەی شێخی نەمر لەبەر پشتێنی کامیاندا
لە کێلاندا مشتومالە؟!
لە میحرابەکەی قازیدا کامیان خاوەنی بەرماڵە؟!
ئەسپەشێکەی بارزانیمان، کە نووچیدا...
کەمیان خۆی هاویشتە پشتی!
کۆترە گاویلکەی تەبایی، تیرهاوێژی کامیان کوشتی؟!
هۆ مامی خۆم! هۆ کاکی خۆم!
ئەم شەڕەتان ناڕەوایە،
ئەم شەڕەتان سەرەندیبی شێخ مەحمودە و...
ڕێی چوارچرای پێشەوایە،
نسکۆی دووەمی لە دوایە!
ئەم شەڕەتان مەشخەڵەکەی زەکێ ئاڵکان خامۆش دەکا،
ڕێی لێدەگرێ تا، نەگاتە لووتکەی چیا
ئەم شەڕەتان موحاکەمەی شەهیدانە...
بۆچی خۆیان دا بەکوشت و بەرگی ئاڵیان بەکێ شیا؟!!
ئەم ئاگرە نەکوژێتەوە، دووگیانەکان
ڕەنگە ئیتر کوڕ نەهێنن
باوکان بەکێڵگەی ژیاندا،
ڕەنگە ئیتر کوڕ نەچێنن!
***



*ڕەشنووسی ئەم هۆنراوەیە بێ مێژووە نازانم کەی و بۆچی ئەم هۆنراوەیەم نووسیوە بێ ناونیشان، هەر نەیسە وای بۆ دەچم لە ساڵانی ١٩٧٦، ١٩٧٨ نووسیبێتم.*

خۆشەویستم ئەم جیهانە هەمووی بووە بەگازێک و
لەناو قەپیام
هەمووی بووە بە دێوی مەرگ، من بەتەنها لەناو لە پیام!
کاتێ ئەمرم. لە دامێنی ڕێگایەکتا بلێی جێگەی پێچاڵێکم
دەست بکەوێت؟
بلێی کاتێ من ئەکوژرێم. مۆتەکەی ترس لەسەر پێڵووی چاوی خەمت
وەنەوزبداو لێی بخەوێت؟
هۆگیانەکەم... من لە شاری واوەیلادا ئەمبەن بەپاڵ
بەرەو دەمی دێوڕەشی لاڵ؟
میز هەڵ ئەدا بەڕووی شارا، دەمی سەرچاوەی گرتووە،
عومرێکە کەس تامی ئاوێکی ڕۆشنی نەکردووە!
هەرچی کچێ بۆ قوربانی گوێی ئەسمرێت
کەس نازانێ ڕووسووربیان کام تووتکە دێو ئەی خواتەوە؟
کام شەوی ڕەش لەبن باڵیا ئەی باتەوە؟
خۆشەویستم! ئەم واوەیلا ناوی شاری(بێ بریارە)
واچەند ساڵە باز هەڵ ئەدەن، کە پاشایان بۆ ڕەچاوکا،
بەتەوژمی چەپڵەلێدان ئەی بەن هەتا، کەمەی جادوو
لەو سەرەوە کە دێتەوە پەڕوباڵی هەڵکەنراوە
بەدوای ئەسپی مەیتەرێکا، تانجیبەکی گوێ براوە...
ڕست کراوە...
لە گالیسکەی ژێر واوەیلای ئەبەستن و لێی ئەخوڕن
هەزار وتار هەراج بکات، وشەیێکی لێ ناکرن!
باوبۆران و سەهۆڵ بەندان، دێ بەیەکا و لوولی ئەدا
ئەکەوێتە خودا! خودا!
– بم پارێزن، بم پارێزن، ئەمجارەش بێن هەڵم بدەن هەڵە ناکەم
بەبچووکی هەرگیز قسەی کەڵە ناکەم
ئازیزەکەم! تۆ لەوبەری ئاوی ڕەشا ڕەش کراوی،
تۆ ئەو چاوگەی وەکو قفڵ داخراوی!

کێ دەزانێ ئەم تەلیسمە بکاتەوە؟
کێ دەتوانێ بازێکی تر هەڵداتەوە؟
شیعری منیش پێشمەرگە بێ و لەسەرچاوەت بەقوم، تێر تێر بخواتەوە!
***

## خۆشترین شەراب

١٩٩٢/٦/٨

گریمان ئێستە منت کوشتووە... دەستکەوتت چییە؟
بۆ مەولای وەک تۆ... دەروێشێکی کەی وەکو من نییە!
لە شیعری چاوتا بشم پروێنی، دەچمە دێرەوە
جامی بێ مەی بووم، قومێکت دامێ،
دەست مەگێڕەوە!
وتمان منالّی، تازە لە عیشقا گروگالّ دەکەی...
بارە کەوێکی، دایک جێ دێڵی، خەت و خالّ دەکەی!
هەوەڵ بانگ خوێندت، من کەمەنکێش بووم
دەک دەمت خۆش بێ!...
شیعر و سروود ڕەزم و گۆرانیم
هەموویت نۆش بێ،
ئەو ڕۆژە نوخشەی لێوت بەمندا
تۆ هێندە جوان بووی...
سۆزی بولبول و ڕازی شمشالّ و نەی و کەمان بووی!
خەڵکە لێی مەگرن... هەرچیم پێدەکا، بۆ ئەو حەلاڵە،
خۆشترین شەراب، ئەو شەرابەیە...
کە تفتوتاڵە!
***

## نامەیەک بۆ نیگاری دورە وڵات...!

١٩٩٦/٥/١٠

نیگەی ئازیز...! من لەم دوورە تۆش لەو دوورە
خەبەر پەیکی پێ شکاوە
لەمنەوە ئاخۆ خەمی پیرەمێردم بەکام گۆچان



پێیەک دەخاتە ئەو ناوە؟!
هۆ هەناوە زامدارەکەم، چاوەڕێ بە!
لەوێنەدا، خەندەی (شارۆ) هەڵچنەوە...
بیهۆنەوە، وەکو چامە... لەنێو دڵما بیخوێنەوە!
لە (قەرەمی) ناخی پەرش وتێکچوی منا،
بستێ جێگەی نوێی بۆ خۆشکە و بی ڕوێنەوە!
شنەی (شەماڵێ) لێی بدا نمەی بارانی ئەشکی من،
دا بێتیە بەر...
بۆنی قەندیل و ئاسۆس و کەژی زەردەی تێ ئالابێ
دەرگای سنووری سەرکلۆم بۆی والابێ
ئاخ سنوورە ئەستوورەکان،
داخ سنوورە زۆر دوورەکان!
منی ماندوو، کە خەونی خۆم لەنێو قەپتانا گوم دەکەم...
وەختە بلێم هەزار لەعنەت!
لەو کەسانەی کەوا سنوور دادەکوتن
بەرگی تاریکی دۆش دامان دەکەن بەکفنی سۆزی من
من بۆ ماچی سەری(شارۆ) سەرم بووە بەشێتخانە،
شیعرم شێتە، هۆشم شێتە، خەونم شێتە!
بەرماڵی گشت خەونەکانم،
بەشەو و ڕۆژ ڕوویان لێتە!
نیگەی ئازیز!... نیگەی دووری ئەودیو سنوور،
نیگەی دایە، نیگەی بابە... تاقانە پوور...
کەی دێیتەوە؟!
ئەم تەلیسمە بکەیتەوە!
هەوری ڕەشی بێ بارانیی ئا لەم سەرە
جەنجاڵەی من دوور خەیتەوە؟!
لە پێچاڵی تاریکە دام... پێش تێکەوتن،
پێکەنینێ هەڵکەیتەوە!؟
گۆڕستانی شیعرەکانم گۆڕ بەگۆڕیان هەڵبەیتەوە...
شیعرەکانم وەک شەهیدن قەت نارزێن!
شیعرەکانم لە سەنگەرا قەت نابەزێن!

وەرە و سەنگەرم بۆ لێدە، جا دەزانی...
جەنگاوەرەکانی پەیڤم چلۆن دەبن بەقوربانیی؟!
***

## جامی لێوت

١٩٨٩/٤/٢٢

جامی لێوت فرۆبینە بۆ سەر لێوم
بۆ نازانی چەند تینوومە و چەند پەشێوم؟
بێ... دەفتەری دڵم تەی کە، دیارییە
هەر بۆ کاراسکی چاوی تۆ جێ دیارییە
من ئازاری تۆم خۆش دەوێ و ماکی خۆمە
هەرگیز خەمێ بۆ خۆم ناخۆم خەمی تۆمە
با... چاوی تۆ بۆ کوشتنم تەرخان نەبێ،
با... زوڵفی لوول من شێت نەکا و پەخشان نەبێ
با... ئاغر بێ هاتۆچۆکەت وەک جارانت،
مەیکە بەتۆف ڕشێنەکەی بەهارانت!
چاو داگرە، لێت هاتووە، بەلام بەناز،
مەلی دڵم دەستەمۆیە، بۆچیتە باز؟
خوا پێداوی... جوانیت هەیە، لێم بپرسن؛
خوا پێداوان... تۆی لێ دەرچێ ئێسک قورسن!
ئەو جوانییەی لای تۆ نەبێ کەی جوانییە؟!
شانم باری تۆ هەڵنەگرێ بێ شانییە
بۆیە شانم دایە بەری ئەم خولیایە
دنیا بەبێ ئەوینی تۆ هیچی تیایە؟!
لەگەڵ تەنافا قۆڵی تۆم بکرێتە مل...
لە چاوی پیسی جەللادا دەبم بەگل!
عاشق نییە لەم دنیادا بگات بەمن،
دێوانەکان من ڕابەرم بۆ کوێ دەچن؟!
گری گری خڕببنەوە ڕۆژی جەمە...
ڕێی هەموومان بۆ لایەکە: بەرەو شەمە!
ئازیزەکەم زارت گوڵە و بیکەرەوە...
قەرزم لاتە بەدوو وشە بیدەرەوە.



بۆی هەناسەت فرۆ بێنە، من بەتاسەم،
بەو بەرامە پڕ پڕی کە جام و کاسەم
لێوی وشکم پاراو بکە، گڕەی سوورە،
من لەپلەی (انا الحق) دام بەسە کوورە!
***

## لالۆ کەریم

١٩٩١/٩/٢

ساڵ بەو عەیام لالۆ کەریمی پێشمەرگە،
حەمەیان بوو، لە خۆشیدا هەڵدەپەڕی!
وتی دەبێ ئاهەنگ سازکەم...
خودای دەکرد هەزار سەگیش،
پێم دەوەڕی!
سبەی کوژرام تفەنگەکەم،
لەم سەر خاکە بەهەتیوی فڕێ نادەن!
بە وەجاخ کوێر ناوم نابەن!
لە بەهاری ئازادیدا...
حەمە لە چیمەندا کوژرا...
لالە کەریم تفەنگەکەی حەمە گیانی، کردەشانی...
وتی... ڕۆژگار پێچەوانە هاتە گۆڕێ،
بۆ وەجاخی حەمە گیانە وامن دەبم بەقوربانیی!
***

## بووک و باوانیی

١٩٩١/٩/٢

چەند دەگریام کە دەیان وت بۆ ڕانیە ڕێگانییە!
باشە چ بکەم خۆ شیعری من تازە بووکە و
باوەخوونی دەکەینەوە؟!
ئەگەر دنیاش سەرەو ژێربێ...
دەیبەمەوە بەباوانیی!
چاوی بەکلی کێوەڕەش دەڕێژم و
لە گوڵەبەڕۆژەی بیتوێنیش،

دەسماڵێکی تەنک تەنک، دەدەم لە گەردن و شانی!
بووک لە ماڵە باوانیایە و
ئاوی قولەش دەخواتەوە.
لەپێشدەر و لە پشدەرا...
ئاسۆ لە ڕێی ئازادیدا دەکاتەوە!
بۆ سبەینێ کە دوو گیان بوو،
پێشمەرگەی نوێ بۆ کوردی نوێ دەخاتەوە!
***

## گۆرانی

تەمموز١٩٩٤

دەلۆلۆیە، دەلێلێیە
لە کوردستان خۆشتر کوێیە؟!
دەبا دنیا لێم تێ بگا
چ سوزێکی گەرمم پێیە؟!
من لە ڕیزی هەژارانم
گوڵی مەجلیسی یارانم
لەگەرمەسێری خەمیشدا
وەک بارانی بەهارانم!
شیعری هاوخەم، تۆ بێرە لام
لێوی یاران بکەین بەجام
لە گێژاوی سەرخۆشیدا
ببین بەچوارینەی خەیام!
لەژێر تاقگەی قژی خاوا
خۆمان بدەین بەدەم ئاوا
پەلەقاژەی مەلە بکەین
لەناو گۆمی شینی چاوا
ساقی وەرە بەم خەمەوە
خونچەی زارت دەکەمەوە
لەباخاتی سینەی پرت
سێو و بەهێ دەبەمەوە



بوێژ کوانێ، نەواو بەستە؟
ئەمشەو دڵم ئێجگار پەستە
من دێوانەی عەشقی خۆمم
مەڵێن پیاوێکی بەدمەستە
دەلۆلۆیە، دەلێلێیە
لەم ئاهەنگەم خۆشتر پێیە
لە مۆبەدی عەشقی خۆمدا
خۆم دەزانم یارم کێیە!
مژێک بدەم لە جامی لێو
دەبمە منداڵێکی بزێو
مێخەک دێنم دەنک دەنک
دەیدەم لە گۆپکەی شەکرە سێو!
دەلۆلۆیە، دەلێلێیە
لە کوردستان خۆشتر کوێیە؟
هۆ شۆخەژن ئەم بەستەیەم
بۆ خاتری دڵی تۆیە!
***

## ژنە پێشمەرگە

هۆ پێشمەرگە جوانکیلەکە، حەزم دەکرد
کلاشنکۆفی دەستت بم...
لە سەنگەرا هاودەمت بم،
کە دەبیتە بووکی ژیان
وەکو شیعرێ،
گوڵێکی سەر پەرچەمت بم!
کە کوردستان خەمی تۆ بێ...
قوربانی خۆت و خەمت بم!
کە هەژاری ژەمی تۆ بێ،
تا ئازادی هاوژەمت بم!
***

## شەهید

تۆم خۆش دەوێ وەکو خەمم،
هەر تۆ گۆرانیی خۆشبەختییت
لەسەر دەمم.
ئەگەر ژەمێک لەخەمی تۆ خەمێک نەخۆم،
هەروا دەزانم بێ ژەمم...
با کوردستان ببێ بەباخی ئازادی...
تۆ نێرگز و تۆ گوڵاڵەی،
با شیعری من باخە سێو بێ و تۆ هەڵاڵەی!
با تۆ حەق بی و منیش حەللاج...
تۆ گەوهەری، دەتدەم لە تاج!
من شابازی ڕێگەی عەشقم
بۆم هەڵبدە تیلەی چاوت
گوێ مەدەرە وەعد و وەعید،
با دەروونی تۆ بەهەشت بێ و
منیش شەهید!
***

١٩٩٥/٣/١٨

## شەکر و زار

ئەگەر وتیان:
ئەوە بەهەشت،
ئەوە حۆری و ئەوەش غوڵام
ئەوە کەوسەری بەچێژو،
ئەوەش هەزار چەشنە تەعام!
تریفەی مانگەشە و بێنن...
لە جێی دەفر و لە جیاتی جام
دەڵێم باوەشت خۆشترە،...
لە فەرهەنگی ئەندێشەما، فەرمان بدە...
ناوی مەرگی تیا هەڵگرە!
*



گەر دێوسپی لە کووپەوە بێتە دەرێ...
بڵێت: گەورەم ئەمە منی خزمەتکارت.
لە ساماندا ئەوەی هەیە و ئەوەش کە دێتە سەرزات،
زێڕ و یاقووت، پیرۆزەی شین...
شەم و خەج و خەزاڵ و زین
هەمووی دێنمە بەردەستت دەیکەم بەسەرگەردی ناوت!...
کە هاتمە گۆ دەڵێم نەخێر...
سامانی من دوو دڵۆپە، لە مرواریی گەشی چاوت!
*
لە هەرکوێوە بەڵێن بدەن، هەموو زمانان بزانم
بەوشەیەک جیهان بهێنمە هەڵپەڕین
من هەر شیعر بۆ تۆ دەڵێم، سروود و بەستەم بۆ تۆیە...
چونکە جوانیی هەر بەتەنها لەسیماتا،
خاوەنی ناز و شکۆیە!
*
لە هەر کوێوە بەڵێن بدەن، بڵێن مەمرە... بژی... بژی!
ئەموستیلەی سلێمانیش لە پەنجەمکەن
با تەخت و بەختم وێرانبێ،
ئەگەر ساتێ لە سەیری لارولەنجەم کەن!
***
هەنگوین، شەراب، شیر و شەکر...
هەمووم بۆ بێننە سەر خوان،
لە تینوانا، چاوم لێلایی بیگرێ...
لە شیلەی لێوی پاراوت، من بێ شک بم...
بۆ سەر لێوی هەڵقرچاوم، دەبێ چاوەڕێی، یەک تک بم!
*
هەرچی پەرتووک و زانستە...
بڵێن، فەرموو پێشکەشت بێ!
تۆ سەرکردەی زانیاران بە!
وتاربێژی بەتوانا بەو،
لەسەر مینبەری شاران بە!

من قوتابیی ئەو مامۆستام...
جوانیی (لۆجی)ت دەڵێتەوە،
من هەڵگری ئەو نامەیەم...
جێگەی تیا دەبێتەوە!

*

تۆ فەرمانبە و منیش (لبَیّك)!
تۆ ئاغابە و منیش بەندە،
هەر چۆنێکت لاپەسەندە
تەنها ئەوساتە شاعیرم
رێم پێ دەدەی بڵێم: یاری...
لە رۆحمدا دەتوێیتەوە
وەکو قەندی نێوی زاری!

*

گەر بەخاچا هەڵمواسن...
بەنووکە رم هەموو جەستەم دا ببێژن...
ئەگەر زەهری (هەلایهەلم) پێ بچێژن!
لەبەر دەستی خوداوەندا خوێنم دەیان جار برێژن
من ئەو ساتە لەژێر تاڤگەی قژی خاوتا...
لەبەر پلووسکی تینەتا دەبمە بەهار!
منی وێرانە و بێ دەرفەت،
لە خۆمەوە دەبم بەشار!

***

## دێوانە

١٩٩٥-٧-١٧

کە دەستت خستە دەستی پیر... بووی بەخاوەنی هزر و بیر،
کە پێت نایە نێو مەرتەبەی خوا پەرستی...
منیش وەکو ئەم پێنجوێنە خۆشم ویستی!
کە کەوتیتە نێو حاڵی وان...
بووی بەورشەی چاوی رەشی چیای کەژان
کە گۆچانت خستە سەر شان،



دوژمنانی ئەم گەلەمان وایان زانی...
تۆ ئارپیجیت لە شانایە
تۆ موفەڕکی خۆشەویستی ئەم پێنجوێنەت
لە تۆیشەبەرەی نانایە!
هەرتۆ خەونی ئەم شارۆچکەت
لە سۆز و زیکر و ژانایە
هۆ شوانەکەم، هۆ دێوانە، چوومە جێیەک...
وتیان: ئێرە جێگەی شەهادەت پێوانە،
من تۆم بینی هێندە سەنگین و مەهیب بووی...
تای تەرازووت نەدەجوولا، پایەدار بووی،
وەک فریشتەی بەرگ سوور و بریندار بووی،
تۆ ئەو ساتە مەشخەڵێک بووی کە تاوت سەند
پێنجوێن بوو بە گەرووی بورکان...
شەختەی ترس و پشتکردنەوەی تەواو شکان
پێنجوێن کە هەڵسایە سەر پێ، دێوانە بوو
دەستی لەسەر رێگەی خوادا وەکو دروشمێ دانا بوو
بەرماڵەکەی تۆ وەک ئالآ،
گۆچانەکەت وەکو چەکێ لەشانا بوو
پێنجوێن کە هەڵسایە سەر پێ، خۆی سوار چاک بوو
لە مەیدانی گیانبازیدا، عەجەب بەورێکی بێ باک بوو
پێنجوێن، ئەودەم، بوو بەزاری مێژووی گەلمان
بوو بەدایکێ کە دووگیان بوو بەئاواتمان
لە گەرمەسێری وچاندا بوو بە سەهەن و ساواتمان!
پێنجوێن ئەمڕۆ چاوی کوردە... ئالێرەوە،
چاومان لە بەفر و بەهارە... چاومان لە دار و بێدارە...
گوێمان لە سۆزی خەمبارە
دەستمان لەسەر زام دادەنێین. زاممان چاوەڕێی تیمارە!
حاڵی هەموو دێوانەکان ئەمڕۆ چاوەڕێی تۆمارە
پێنجوێنەکەی دەروێش مەجید...!
جەستەی بیماری تۆم بینی، کە خەڵتانی خەم و خۆڵ بوو،
چیای ئەسحاب قۆڵی داماو...

چاوی لە بلکیانی چۆڵ بوو
دێوانەشمان لە حوزوورا، هەر ئەوساتەی
داوێنی خوای ئاڵانە دەست
بەدڵ داوای خوێنی تۆی کرد
هەرچی خەمێک لەناخیدا پێچی دەخوارد بەکوڵ ڕۆی کرد
بوو بەسۆزێک. پیران هەموویان یاهوویان بوو،
خوێنی ئاڵی دڵی دەروێش ئاڵای دەستی هەموویان بوو!
هۆ شارەکەم! هۆ یارەکەم! تۆزێک لە خۆڵی سووتاوت،
دەکەمە چاو بۆ تیماری گلی نوێمان
هەموو شەوێک چاو ئێشەیێک دێتە ژێر بالیف و جێمان
هۆ شارەکەم، هۆ یارەکەم، تۆ هەر شۆخی گەلی کوردبە...
تۆ هەر نازەنین و وردبە...
شیعر نەبێ، با کەسی دی دەمی نەگاتە سەر گۆنات،
تۆزاوی کەن،
بەهای موفتی و دەروێش مەجید و بلکیانیش
بێ بایی کەن!
هۆ بلکیان... لێوی بەهەشت! من تینوومە
توو مەرقەدی دەروێش مەجید پاراوم کە!
ئەمن ڕێگایەکی پاکم بێ ئەلغامم...
شۆخی خەمبار! ڕەچاوم کە
دەروێشێکم... بەدوای ئاشتی و تەباییدا من سەرەڕۆم
قومێک لە بادەی بلکیان بگاتە لێوی تامەزرۆم،
دەڵێم، ئۆخەی کەوسەرەکەم!
ئەگەر بەپاڵیش دەرم کەن...
چونکە لە تۆ من تێر ناخۆم
لێرە دەمێنم و ناڕۆم
هۆ یارەکەم!
هۆ نیشتمانی بەفر و خوێن...
گوڵی شیعرم شاری پێنجوێن!
***



## بۆ جوانەمەرگەکانی گوندی قڕگە

١٩٩٢/٨/٥

خۆزگە و خەمێک لە دڵما بوو، دام بەژنێک،
لای ئەو بوو بە کەژاڵی جوان
کەژاڵ، نامەخوا زۆر جوانبوو...
گوڵەستێرەی کوردستان بوو!
حەڤدەی حوزەیرانی ڕەش بوو،
کەژاڵی جوان...
بە کلی چاوی سەیوان بوو
شیعری منیش فێری شیوەن و گریان بوو...
لەو ڕۆژەوە من لە حەڤدە ڕادەچڵەکێم
هەموو حەڤدەی مانگەکانی ساڵی خۆمان،
تینی تاسێ دەمباتەوە...
دەرگەی گەرووی خەمەکانم دەکاتەوە
کفنی کەژەم زەرد نەبوو بوو،
حەڤدە بەروار ڕۆژ نەبوو...
حەڤدە سوار بوون!
حەڤدە هیوا و حەڤدە بڕوا!
حەڤدە چەکی شۆڕشی سوور...
حەڤدە کوێستان، حەڤدە گەرمیان!
حەڤدە بیتوێن و شاربازێڕ...
حەڤدە قەراج و شارەزوور...
حەڤدە گوند و شاخ و زنوێر،
حەڤدە دەرمانی گیراوەی سەر چاوی کوێر!
حەڤدە شیعر و حەڤدە سروود...
حەڤدە مەشخەڵ...
حەڤدە هەڵۆ، حەڤدە نووکی سەر شاخی کەڵ!
حەڤدە بازوو، حەڤدە هەوراز...
حەڤدە بەستە و حەڤدە ئاواز...
شەوێک ئا لەم شارەماندا
شەویان بۆمە کرد بەڕۆژ و

دوژمن شەوی بەخۆدا دا... گرمۆڵەبوو
دایکە دزەی ئەم خاکە بوو ئەم خۆڵە بوو!
ئەستێرەکان سوور هەڵگەڕان،
لە ئاسۆدا خۆیان دەگرت...
پێی هیچ کامیان نەدەخزا
تا فیشەکی پاشەکشێ هەڵنەکرا،
ئەستێرەکان بە ئاسۆوە هەر مانەوە...
ئاسمانیان گرت بەشانەوە
بۆ ئاهەنگی حەڤدە کوڕی ئەم شارەمان
ئەستێرە باران گەرم بوو
ئەوەی لەجێدا نوستبوو،
ئەوەی کڵاوی خۆی دەگرت کە با، نەی با...
غەرقی لینجاوی شەرم بوو!
کەنیسە بوو، دای لەزەنگ و
وتی فەرموون ئەوەش خەبەر!
منارەکان دەستیان خستە پەنا گوێیان،
حەیرانی بانگیان هەڵبڕی!
شۆڕش لە خەوتن چاکترە، دەوەرنە دەر!...
تەقەنەما...
شارەکەمان لە ناخەوە کەوتە سەما
ئاسۆ لەبەر پێی شارماندا کەوت بەدەما
ئەستێرەکان چاویان وەنەوزی تێ کرا،
سەریان خستە سەرشانی کەل
بەیان لە وێڵەدەرەوە هەڵسایە پێ...
بەقرگەدا هاتە خوارێ... بەپێی لیزگی هەتاوەوە
خەبەر گەیشتە گوێی شارێ:
ئەی هاوارە، خوێن بارانە!
سوێی ناوەختە، میوانی زامی جارانە!
حەڤدە شێری شۆڕش و خەڵک،
شەوێ شاریان دا بەکۆڵا...
لووتی دوژمنی فاشییان، کرد بەخۆڵا



لەتەک فیدا و گیان بەخشینا
قۆڵ لە قۆڵا...
بەرەو بنکە گەڕانەوە
دار و دەوەن، چەم و کانی
شەو گوم بوو بوون،
ئەمانیان دی، دۆزرانەوە!
حەڤدە لاوی شۆڕش و خەڵک...
مەستی بادەی سەرکەوتنن
تێری باسی دەرکەوتنن
بەتەمای تۆزێ خەوتنن!
قڕگە! یاخوا ئاوەدانبی،
باوەشی خۆت بکەرەوە
جوابی شەوباشیان بەرەوە...
خۆزگە و خەمی باوک و دایک!
کوێ گەیشتن؟
شێ سوارەکانی دوێنێ شەو!
بۆ کوێ دەچن؟
دایک چاوی لە بەیانە
باوک دەمی بەقورئانە،
خوای هەژاران!!
مێژووی ڕووسوور! ئەسپەشێکەی حەڤدە سواران!
ئەم سوارانە بپارێزن،
با خەڵک و خوا لێک نزیک بن
شێ سوارەکان گەیشتنە کوێ؟
دەم و دڵمان پڕە لە بەزمی شەوی دوێ،
گەیشتنە کوێ؟
لێرە دوژمن هێشتا لەرزی لە گیانایە!
مێژووی نییە،
ئەم... گوێدرێژە و لە ناخایە،
ئەم... گەلحۆیە و لە ڕانایە
ئێوە لە کوێ سەرخەوی دوای ماندوو بوونتان

دەشکێنن و بەرەولوتکە سەردەکەون؟
ئێوە لەباوەشی کێدا ئەم پێش بەیانە دەخەون؟
هەستن، ڕێگەوبان لێڵ دەبێ
منیی جاشی تیا چێنراوە...
دەڵێی شەماڵ خنکێنراوە؟
بێ سرتەیە،
دنیاش ئەم باسە کورتەیە
مینی جاشان لە ڕێتانن!
سەری جاشان لە پێتانن!
شێ سوارەکان، هەنگاویان نا بەرەو هەوراز
مینی جاشان تەقینەوە...
شێ سوارەکان، بوون بەنیلەی ئاگری سوور
بەپانتایی شاری کاولی شارەزوور!
شێ سوارەکان بوون بەخەون و بوون بە مێژوو،
شایی دوێ شەو لە شارمانا...
وەکو هەزار ئاهەنگی تر
لەگەڵ بسکەی سمێڵمانا
لەگەڵ بزەی سەر لێومانا
زوو هاتوچوو!
ڕۆژان ڕۆیین، سالآن هاتن...
حەڤدە لاوی تێر نەخەوتوو حەڤدە گۆڕن...
سوێندم بەخاکی کوردستان،
لە ناخمدا جێ ناگوڕن!
حەڤدە، ژمارەی پیرۆزە، کێ لە دەستی هەڵدەکەنێ؟!
تینی ئەو باسک و مەچەکەن کە کورد مێژووی پێ دەژەنێ!
مێژوو ژەنین کار و کردار و بۆچوونە...
ئیتر وەجاخ ئەگەر کوێرە، ئەگەر ڕوونە!
حەڤدە برینی قووڵ و نوێ، بوون بەزامی ناو زامانمان
بەسەر گوزشتەی باوانمان
ئێمە برینمان تێکەڵە،
ئەدی ئەنجام؟ دەڵێن ئەنجام بۆ گیرفانە، بۆ باخەڵە!



شێ سوارەکان! ئەوا هانام هێنا بۆتان...
دادم بدەن، ئێوە خۆتان
شۆڕش ئاواتی گەلمان بوو...
شۆڕش ئاواتی گەلمانە،
گۆڕەپانی شەهیدانمان، جێگەی دز و دەخەڵەمانە...
نمایشی تێدا دەکەن، خۆ بادەدەن،
پارە پێوەر و بەهایە...
دەسیان لەبان دەسی خوایە؟!
پێشی دوژمنمان چۆڵ دەکەن،
لەسەر گۆڕی ئێوەی ئازیز، های خۆڵ دەکەن!
گیرفانێکیان ئاوەدانبێ...
گەرەکێکمان پێ چۆڵ دەکەن!
پێدەکەنن بەم شیعرانە
بەگێلە پیاومان دەزانن...
دەست بەجام و چەلەنگ لە خوانن!
– لە بەختی خۆم من شاعیری شەهیدانم
گێلە پیاوم، یا لە چەنگ عەگیدانم؟–
دار مازەڵە! کارەساتت چۆن چۆن بینی،
چۆنت لە خۆ ئاڵاندووە؟
لێی ناپرسم، چونکە زەردە زۆر ماندووە...
کەس نازانێ داستانەکەی هەندرێنمان... بۆ کوێ چووە؟!
قەندیل کە، زا، کچی بووە کوڕی بووە؟
ئەو مەنجەڵەی نامانە سەر...
هەر دەکولێ، یا هەڵچووە؟!
دارمازەڵە!... دەتۆ بیڵێ، تۆ ناترسی،
تاوان، تاوان، وا لە ئەستۆی کامەماندا؟
دەنگی نییە لەهیچ لایە،
هەتا لە توێی نامەماندا!
دەگێڕنەوە لە زمانی–ناوی ناڵێم–
دەڵێن تاوان چەک بەشانە...
دەک ڕووی ڕەشبێ ئەم زەمانە!

شێ سوارەکان!... گوێتان لەدەنگ و هاوارمە؟
چاوتان لە دەرد و ئازارمە!
لە شاری پڕ لە بێ بارمە؟!
من هاوارمە، من هاوارمە...
شێ سوارەکان!! دەسا گۆڕتان هەڵتەکێنن،
خوێنتان سەدا و مامەڵەیە
ڕێتان زڵە و زایەڵەیە
ئەوەی دەستی خوێناوی بوو،
خۆی دەی پرسی...
نێچیری من چەن بایی بوو؟!
ئەوساو ئێستە... خۆی بادەدا...
هەمان چەمچەی عوفوونەتە،
ئێستێکەش خۆی پێ ڕادەدا!
هەژاری کورد برسییەتی،
نان لە گەدەی کێدا، ونە؟
گەدەی کێیە هێندە قووڵە...
گۆمی بێ پەی و بێ بنە!؟
هەژاری کورد سەرمای دەبێ،
ئاگر لەبن باڵی کێدا کەڕوو دێنێ؟
سبەینێ کورد لەو شاخەوە بەچی داری بەڕوو بێنێ؟
چەک بەدەستی، سەرحەدەکانی باکورمان...
پشتیان دەکەنە باشوورمان!
چش وێران بێ قەرەداخ و
چش وێران بێ شارەزوورمان...!
شێ سوارەکان! هەرچەند زۆرشت لارە ڕێیە،
بەڵام مژدەی خۆشم پێیە...!
پێشمەرگەیێک لەسەگرمە لێیان پرسی:
بەکێ بڵێین پێشمەرگەیە؟
ئەوەی چەکی لە شانا بێ و سیپاڵیشی ئەم بەرگەیە؟
وتی: نەخێر...
قەت پێشمەرگە، کەسانێک نین لەناو شارا،



دەرگای سۆپەر بکەنەوە و بیکەیسی بەن بەسەر شانا
کە جوعبەکانیان پڕ دەبێ فیشەک دەکەن بەگوێ بانا!
وتی: پێشمەرگە کەسێکە، هەژاری کورد ناترسێنێ...
لە باشووری کوردستاندا... لەناو سەنگەری خۆڵێنا،
چاو، لە دوژمن ناترووکێنێ!
هەموو ڕۆژێ لە تاریکایی ئومێدا...
هەر ئەو خۆرمان بۆ هەڵدێنێ!
شێ سوارەکان، لەناو دڵی جەماوەردان...
چاویان لەکردە ڕەهاتە
چاویان لە ڕێی ڕاو و ڕووتە
چاویان لەناو گەدەی حووتە!
سەربەنەوە! خوا دەزانێ چی ڕوو دەدا...
ڕووی ڕەشی خۆی چاک دەبینێ،
ئەوەی کە ئاواتی دووری  بەدەسکەوتێکی زوو دەدا!
تف لەو کەسەی خوێنی شەهید دێنێتە ناو بازاڕەوە،
دەی کاتە شووشەی باڕەوە!
خوێنی شەهید تەنها مافی چارەنووسە،
نە، خۆش بێژە و... نە، زۆر بێژە و نەچابلووسە!
خوێنی شەهید، کوردستانی ئاوەدانە
خوێنی شەهید، ئازادییە...
خوانی برایی پڕ نانە!
لە ئەندێشەی شاعیراندا پێچ و ژانە،
لە نووکی خامەی ڕووسوورا شیعری جوانە!
منیش داوام ئەو داوایە؛
کە بۆ بالآی شەهیدانمان ڕێک و پێکترین کالآیە:
ئەمجارەیان بەردە قارەمان شەرمن بێ، مردن چاکە!
گوێتان لێ بێ... هاوڕێ، هەڤاڵ، مامە، کاکە!
***

## نالی، گۆران، قانع، سەییاب... هەتد

کاتێ کە مرد هیچ دەنگ نەبوو
باری هیچ کەس لاسەنگ نەبوو
ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆیی...
کەوتە سەردەم،
بوو بەخۆراکی سەد قەڵەم!
ئەیان برد و ئەیان هێنا،
لە گشت باس و سەرباسێکا ڕەوا بوایە یا ناڕەوا
ئەیان چێنا!
هەر زمان بوو پێی تیژ ئەبوو،
هەر گەروو بوو ئەکرایەوە
لە چاوانی برسێتی ئەو...
هەر گەدە بوو تەسەل ئەبوو هەر کاسە بوو ئەخورایەوە!

***

## من هیچ نالێم

١٩٩١/٣/١٥

وتیان: یا شێخ! بۆ ئەم ڕۆژە چی دەنووسی؟
وتم: هەر هیچ!
وتیان: یا شێخ!. ئەم ئاهەنگە بێ وێنەیە، تە چ دبێژی
وتم: هەر هیچ
وتیان: یا شێخ! ڕەشبەڵەکە و جێ خوێنەکەی هەڵۆبەگ و
عەولەسیسە، تێک ڕژاوە!
چی دەنووسی و چ شیعرێکت بۆ داناوە؟
وتم: هەر هیچ؟
وتیان... یا شێخ! چراخانە، خەرمانانە، باوانییە...
وتیان، ئەوا چاومان لێتە... دەروونت قوڵپی کانییە!
شتێک بڵێ، وتم: هەر هیچ!
وتیان یا شێخ!، شاعیرەکان لە دامێنی مامەیارە
وا شێخانی هەڵدەپەڕن،
سەرچۆپی هەڵدەپەڕن،
سەرچۆپی کێشیان -نالی-یە...



-گۆران- بەستە تۆمار دەکا...
-بێکەس- دەم و پلی مێژوو بیست و حەوجار
دەکوتێتەوە و دوژمنی کورد بێزار دەکا!
تۆ چی دەڵێی؟ وتم: هەر هیچ!
وتیان... یا شێخ! گۆچانەکەی -ئەحمەد پاشا- و
خنجەرەکەی -شێخی نەمر- بوون بەجامانەی- بارزانی- و
وا بەلووتکەی- قەندیلەوە
وتیان...ناوی -شێخ شەهاب- و شەهید -ئارام-
وا بەلێوی ئاگرەکەی -بانمیلەوە-
تۆ چی دەڵێی؟... وتم: هەر هیچ!
وتیان... یا شێخ! ئاوارەکان -شێرکۆ و ڕەفیق-
عەبەو ئەنوەر،
ملی ڕێگەیان گرتووە، وا دێنەوە،
هەگبەکانیان پڕ لە وشەی ئاگردارە،
شیعری دەربار، شەرمەزارە!
دەلێلێیە و دەلۆلۆیە -شڤان- دەچڕێ... دەهاوارە،
تۆچی دەڵێی؟... وتم: هەر هیچ!
وتیان... یا شێخ! شەیداکانی ڕێی ئازادی و
بەخت یاریی،
چەکوش دەدەن بەقەپۆزی ئەژدەهاکا و
داس دەخنە ملی زۆردار،
... شێخ مارفیان پێشخستووە بەرەو بنار،
چەپکە گوڵی نوێیان پێیە بۆ پێشوازیی وەرزی بەهار!
تۆ دەڵێی چی؟... وتم: هەر هیچ!
وتیان. یا شێخ! وا مەرقەدی -باوە گوڕگوڕ-
مەشخەڵانی فەیز و نوورە
بەناو دایکە کوردەکاندا کوڕ بەش دەکا...
چارەی پیاوە بەدچارەکان...
بەناو مێژوودا ڕەش دەکا!
تە چت پێیە؟... وتم: هەر هیچ!
وتیان: یا شێخ! وا، خانەقین بوو بەکوورە

-جەوەڵ حەمرین- جێ هەڵپەرکێی پێشمەرگەیە!
بەرەو هەر دوندێ دەڕوانی، ئەو بەستەیە
ئەو بەرگەیە!
تۆ چی دەڵێی!... وتم: هەر هیچ
وتیان یاشێخ!... -کەژی زەردە- بەرگەردنی کردۆتەوە
-شاهۆ- ماچی بۆ دەنێرێ
وا -دێوانە- خۆی شل دەکا، بۆ بێڵی دەستی ئاوێرێ!
تۆ چی دەڵێی؟... وتم: هەر هیچ!
وتیان لاڵی؟... یا ئوفتادەی بێ خەیاڵی؟!
وتم- نەخێر، ئەم ئاخێزە خۆی چامەیە!
وتم- یاران، ئەم ئاهەنگە خۆی نامەیە!
چامەیەکە نەوتراوە و کەس بۆی نایە!
نامەیەکە، نەنووسراوە و کەس لێی نایە!
وتم- خەڵکە ئەم شۆڕشە هەر خۆی خۆی بوو،
دەنگی تۆی بوو، بۆنی تۆی بوو...
تینی بەرۆچکەی زستان و چێژی برسی و نان و دۆی بوو!
هەزار ساڵەی وەجاخ کوێرمان وا دووگیانە،
سکەکەیشی ئازادییە!
بەری نوشتەی، سالم و شێخ و حاجییە!
باس نەماوە لە دنیادا، باس یەک باسە:
وا خەج بووکی سیامەندە و شەم بۆ وەلی و
زین بۆ مەم و غەزاڵیش بۆ کاکە لاسە!
***

## شەو و گریان و مەرگ

١٩٩١/٦/٩ سلێمانی

پێشەکی(١)
شۆڕش گەرمە و یا شێخ دەڵێ:
ئەم شۆڕشە هەر خۆی خۆی بوو
تینی بەرۆچکەی زستان و

(١) ئەم چامەیە لە شاری سەردەشت دەستم پێ کرد دوای کۆڕەوی گەلەکەمان لە سلێمانییەوە شەوی٣/٤ نیسانی ١٩٩١ . کە گەڕامەوە بۆ سلێمانی پێشەکی و پاشەکییەکەی تەواو بوو.



چێژی برسی و نان و دۆی بوو
هێشتا دنیا نیوەڕۆیە،
فسکە فسک و پێ دزکێیە
جێهێشتن و جێ گۆڕکێیە
هەموو گوێیەک تونێلێکە و
هەموو چاوێ بووە بە چوار
هەموو باسێ وەک پەلاسەو،
هەموو تامێ بووە بەژار!
هەموو، دەمێ، مووشەدەمە و، درۆ دێنی و درۆ دەبا
هەموو کەسێک بووە بە پەیک،
بۆنی خەبەر دەدا بەبا...
- گوڕی هەنگاوی پێشمەرگە بەرەو دوایە
ئێستگەکەمان هەرچی دەڵێ هەمووی کایە
هەمووی بایە!
ئیتر، ڕەحم، ڕەحمی خوایە!
هۆو... وا مەڵێن
هۆ زمانتان بەبڕین چێ...
کە هەنگاوی پێشمەرگەیێک هاتە دواوە
ئەڵبەت ناخمان شووشەی دڵی تیا شکاوە!
*
ئێوارەیە و سرتە سرتە...
مەودای بیری خەڵکی کورتە
بەیەکدا دێن. سەری خۆیان دەبێژنەوە،
کۆچەرێکان لە خەیاڵا دەپێون و دەژمێرن
کام نزیکە و کامە دوورە؟
کامیان سەختە و کام ئاسانە؟
کامیان پێچە و کامیان ژانە؟
بەیەکدادێن...
هەندێک شەرم دەیانگرێ و گوێ شل دەکەن
بۆ دەنگی تۆپ،
ئەم گرمەیە لە ئێمەوە بۆ دوژمنە!

ئەم گرمەیە تین و توانای دڵی منە!
هەندێ ترس دایگرتوون و گوێ شل دەکەن،
بۆ دەنگی تۆپ،
ئەم تۆپانە هی دوژمنن، وا سەنگەری...
پێشمەرگەکان دەڕوخێنن!
دڵی ئێمەش دەپچڕێنن، لە ناخەوە...
ئەم تۆپانە تەپەی دڵمان دەدەنەوە، لە شاخەوە!
*
وا شەو داهات...
کێ دەتوانێ دڵی شارێک بداتەوە؟
کێ دەتوانێ ڕێگە لە ترس ببەستێت و
چراوگی خۆڕاگرتن هەڵکاتەوە؟
دێو لە چراوگ دەترسێ؟!
کێ لە چەمکی وا دەپرسێ؟!
شار شڵەژاو، خەڵکی هەموو
لاکێشی ڕێ ڕادەکێشن بەرەو خۆیان
ترس و بیم و باران و کۆچ...
بوون بەتان و بوون بەپۆیان
***

## شەو و گریان و مەرگ

١٩٩١/٤/٢١ سەردەشت

* دەگریم، بگرین... شار خامۆشە
وا گیانەڵای سەرکەوتنە
کاوە چەکوشی فڕێ داوە و بێ بەرکۆشە؟
یا قەڵەمی من بێ هۆشە؟!
* دەگریم، بگرین...
ئەوا جارچی لەناو گەرووی تۆقاندنا جاڕێ دەدا:
هەستن ڕەوکەن، شار جێهێڵن
قوڕ بپێون، قوڕ بشێلن...
هەموو ببن بەسیزیف و تاشەبەردان لەسەرشان نێن!
کۆڵان بدەن بەکۆڵتانا، شەقام لەتکەن...



باب و دایک، کوڕ و کچتان، بەدواتانا وەک سەگ، پەتکەن!
جێ بۆ سوپای کوندەبەبوو بکەنەوە...
دووگیانەکان! لەناو ماڵا، ئیتر بەچکە مەخەنەوە!
* دەگریم... بگرین، شار تەپیوە
بانگ لە منارە تەریوە
نوێژ لە بێ نوێژی چەقیوە!
ڕۆژو و بەربانگی سڕیوە!
دێو ڕەش، ئەمشەو، هەموو شەوی ئەم شارەمانی کڕیوە!
شەو جێهێڵن... شەوکڕاوە
جێگەی نوستنمان نەماوە
شار بێ خێوە... موڵکی دێوە،
خێرا... مەوەستن بەپێوە
دە، مل بنێن لە بێ ڕێوە
ڕێگا قۆرخە و قەدەغەیە
هەر مل بنێن، سەر گەردان بن
بەهەرەسی بن بەردان بن!
بەیان بدا، خۆر نا بینن، مەرگە بارێ...
ڕێگە هەموو دەپێچنەوە بۆ ناو شارێ...
شاریش دەبێ بەقەپی دێو،
ملی ڕێگە دەقرتێنێ
زووکەن، بڕۆن،
بێ ڕەنگ و بۆن
شوێن پێ کانتان، بسڕنەوە...
دەی دوای خۆتان ببڕنەوە!
* دەگریم بگرین بدەنە کێو
واهات وا دێت چەپۆکی دێو...
کێوان سەختن باوکە ڕۆیە،
نەتۆ منە و نەمن تۆیە!
پیر جێهێڵن، ئایەی(وەئد) بیر چۆتەوە...
کۆرپە و مناڵ... زیندە بەچاڵ!
دووگیان! دێو هات، نەکەی بچیتە سەر کاسە،

ژان نەتگرێ، بای دەستی دێوت لێ دەدا...
دەبی بەدەنگی بێ سەدا!
کێوان تەڕن بەچاوی تۆ، دەنگی هیچ کەس، نادەنەوە،
گوێی گرانیان بۆ کڕووزەی ئێوەمانان، ناکەنەوە!
* دەگریم، بگرین...
ڕەهێڵەیە، شەستەبارانە- تۆفانە چەم هاتووە...
ئەرز و ئاسمان لێکیان داوە،
ئەو ڕۆچووە، ئەم ڕماوە،
شەتەکی هەور ملی کێوانی بەستووە
شەو و مەرگ و بەفر و هەوراز
لەسەر سینگی مرۆڤی کورد، باری گرانیان خستووە!
دەبێ تێ بکەن...
دەبێ ئێوەش وەها ڕێ بکەن...
ئەم سەری ڕێ هەتا کوێیە؟
بۆ ئەو کوێیە، کامە ڕێیە؟!
ئەمبەرە و بەر، مین چێنراوە،
ئەمبەرە و بەر، عەزیای ترسە و، خۆی خڕداوە
شێرپەنجەی هاری برسێتی لە هەناوتا، پێت دەوەڕێ
لە پێت دەخا،
لەژێر لێزەمەی باران و لەناو سێڵاوی لیتەدا
لە جێت دەخا!
دەبێ ڕێکەی... دەبێ قوڕی مچ لەپێ کەی!
ئەی ماڵ وێران،
ئەی زەلیلی کووچەی شەوی...
شاری زەلیل و چاو کوێران!
دەبێ ڕێکەی
دەبێ کڵاشی پیسایی خۆت لە پێ کەی!
* دەگریم... بگرین
کێوێ... دووکێو سیان و چوار و پێنج و شەشە
هەزار بە هەزار و لا ڕێیە...
هەوراز، نشێو،



قووڵایی چەم دەگاتە سەر ناوکی زەوی
خۆت ڕاگرە، قنج ڕێ بکە، دا نەنەوی
دەستت بگاتە وچان و چاو بزانێ تۆ دەخەوی
ئەی ماڵ وێران!
ئەی فرمێسکی بێ هەنسکی چاوی کوێران...
دەگریم، بگرین...
ئەم چەمە، یەک، ئەم پردە دوو، ئەم دوندە سێ
ژمارەی شەو، شەوی بێ ڕۆژ، گەیشتە چەند؟
خودا بۆ خۆی لە تۆی وەرگرت، لەمنی سەند
شەوی یەکەم -نادر- خۆی کوشت!
شەوی دووەم، موترفێ بوو، دایکەکەی مرد
شەوی سێهەم، کۆرپە مرد و باوکی وتی، خوا سوپاسە!
شەوی چوارەم، بیرم نایە باس چ باسە؟
بیرت نایە مردن پرد بوو؟
خەونی هیوا ملی ورد بوو!
ئەمبەر شەوە، شەوە زەنگە
ئەوبەر کپە، زۆر بێ دەنگە
لەنێوانی هەردوو بەردا، مردن پردە
خۆت بدەرە دەستی مردن،
ئەگەر دەستی نەگیرابوو، لرفەی ڕووبار لوولت دەدا...
بێ ناو دەڕۆی...
ئەگەر خۆ دەستی گیرابوو، لەو بەرەوە
بەتیلماسکێ هەتاوی لێڵ، چاوت دەشۆی!
ئەی تیلماسکی هەتاوی لێڵ! پەت هەڵخرا...
شەڵتەیەک هات، هەموو ئاواتمی تێخرا
هانێ مردن، وا شەڵتەهات...
بڵێیی خۆری ژێر باڵی هەور
تیلماسکێکیش بۆمن هەڵکات؟!
ئەمبەر، واری خەم و مەرگە، بێ بەراوە...
ئەرێ لەوبەر، ڕیسی هیوا، لەسەر تەشی هەڵکراوە؟!
* دەگریم، بگرین...

داوێنی شاخ ڕووبارێکە وا تل دەدات
شاخ هەورازە، هەوری لەمل گرێ داوە
ساجی شینی ئەو ئاسمانەی لەسەر ناوە،
کۆنە ساڵە و لە دەروونیا جێ بەزەیی پوترکاوە
دەبێ ڕێکەیت و سەرکەوی
دەبێ نەخۆیت و نەخەوی...
ئەوی دەژی بۆ خۆی دەژی،
ئەوی دەمرێ بۆ خۆی دەمرێ...
حاڵەت دوانە و تۆ هەر یەکی،
دەستەوسانی، چیت پێ دەکرێ؟!
* دەگریم، بگرین
دەی هەڵزنێن بەهەورازا...
بەجێ پێی پەڵخ و بەرازا
بەرەو پەنا، ڕێ بردنە،
یا سەرکەوتن، یا مردنە!
پەنا، پەنا، پەنا خوایە خەڵک ماندووە
باوان وێران و بێ نانە
دووبەرەی، چۆڵ و بێ شانە!!
پەنا باران... سەرما بەکۆڵ
بەری ژانی ناوەخت و زۆڵ!
بەسە باران، باران بەسە...
ڕێگە هەمووی وا بوو بەچەم،
لا ڕێ هەمووی هەر هەرەسە... باران بەسە!
خۆ من ئەوەتای دەنووسم تۆم خۆش دەوێ...
بەسە ئیتر، ئەم هارییەت لەگەل کەوێ!
پەنا، پەنا، هەم ولاتان کوا پەنامان؟
ئێوە وەرن بەهانامان...
ئیمە گەلی پەنا هەندەین، هەزار ساڵە...
مێژوومان هەر تاڵ و ژاڵە
بەری ڕێگامان... پێ چاڵە
خاوەن خاکێکی بێ وارین...



لێرەوارێکی بێ دارین،
نیشتمانێکی بێ نەخشەین، هەر بێ ئاڵاین...
گمۆ و قەندیل و زاگرۆسین
هەزار ساڵە هەر لە چاڵاین!
پەنا، پەنا، خوایە پەنا!
ئێمە پەنا، بۆ کوێ بەرین؟
هەزار ساڵە شەوێک بێ خەم، سەرمان نەنایە سەر سەرین
پەنا، ئەفسەری بێگانە، سا پەنایە،
بێ سەر دەرۆین...
نە سەر ماوە لەسەرمانا و نەمایە!
بەفرانبارە، مەبێڵە ڕەق ببینەوە...
لارێ سەختە مەبێڵە بەر ببینەوە
پەنا (سنجوێ) پەنا (بێژوێ)پەنا (سەردەشت)!
پەنا، پێغەمبەری ئێمە، پەنا، عیسا، موسا، زەردەشت!
قورئان، ئینجیل، هۆ، تەورات و هۆ ئاوێستا!
دەست و پێمان جەمام بووە،
خوێن لە لەشمانا ڕچیوە
خۆ وەرز وەرزی خوێن جمان بوو،
نەک هەر شیعر، ئێمە چەکمان لەسەر شان بوو
لە توونکە توونکەی حەمرینا شاییمان بوو!
جامەدانێی بارزانیمان لێ بادەدا...
گوێی کەڕ و کاسی مێژوومان
بەشریخەی کلاشینکۆفان ڕادەدا!
لەسەر گۆڕی باوە گوڕگوڕ نوێژمان دەکرد...
بۆچی، ساوای ئازادیمان، بەدەردە کۆپانێکی مرد؟!!
ئەی ئاوارە! هەی ماڵ وێران...
دەپاڵ بنێ بەم کێوەوە،
ئەم لووتکەیە بەرەو ئەودیو بچەمێنە...
ئەزنەقی تر، بدە بەپێی هەڵاوساوت،
ڕۆژی هەشتەم بدەمێنە!
***

## پاشەکی چامەی (شەو و گریان و مەرگ)

١٩٩١/٦/١١ سلێمانی

* دەگریم، بگرین
شەوی هەشتەم بوو بەعاجباتی هەشتەمی،
ئەم دنیایە
چۆن من ئەمێستا زیندووم و بەپێوەوەم؟
هێشتا مەرگ نەیگرتووم و بەرێوەوەم!
گوایا ژیان هێندە خۆش بوو ئەم سزایەی بۆ بچێژم؟
گوایا ژیان هێند بەنرخ بوو...
ئەو گشت ئەشکەی بۆ برێژم؟
چ سیحرێ بوو، منی وەها کەمەنکێش کرد
شاری خامۆشم جێهێڵم،
پشتێنی خۆم بجەرێنم...
لە بارانا... لەژێر لق و پۆی دارانا
بە رووی خوادا سەری بێزاری هەڵبڕم؟!!!
* دەگریم... بگرین ئەمشەو نۆیە
فلاش باکێ، ئەرێ تاکوێ بچمە دواوە؟
بچمەوە رۆژگاری کاوە،
ئەویش وەک ئێمە رەوی کرد؟
جاڕی جاڕچی لە خەوی کرد؟
وا چەکوشەکەی لێ فرێ داو
بەر کۆشەکەیشی کردەوە
بەر ئەژدەهاکی دارمان -دیگەر- گرەوی بردەوە!
ئەی بچمەوە بۆ لای (بابک)؟
ئەویش وەک ئێمە رەوی کرد...
ئەویش لەنێوانی مەرگ و شەوی کوردا
هەر دەوی کرد؟
ئەی بچمەوە بۆلای کێبی تر؟
بۆ جێ شەڕی دوانزە سوارە؟



بۆ کۆچی -نالی-ی ئاوارە؟
بۆ -بابان-ی باوان شێواو؟
بۆ سۆرانی بێ میر و پیر؟
بۆ لای شێخی خنجەر یەخسیر؟
بۆ -چوار چرا-ی چرا شکاو؟
بۆ هەڵەبجەی هەڵەبشیمای خوێن تیانەماو؟
بۆ ئەنفالی شەرم و تاوان؟
تاوانێ رووی هۆلاکۆیشی پاککردەوە
هەر خوێنێکی خواردبووەوە
لە شەرماندا، بەهێڵنجی هێنایەوە،
دێو رەش دەمی تێنایەوە!
هەموو کۆچ بوون...
کۆچ لە دوای کۆچ زێدە رەش بوو،
هەزار ساڵەی بەختی ئێمە واری بەیار و بێ کەش بوو!
با بێزار و شەرمەزار بێ...
کێ بوو وتی ئەمەش بەش بوو؟!...
* من تووڕەم و ئێوە مەگرین
دنیا! هەموو بەشایەتبن
شەوی دەیەم، ئەگەر ساتێ کۆچ وبار بێ،
ئەگەر نینۆکی زامار بێ...
کە هیوامان نەهاتەبەر،
بەناو پەڕەی سیفرەکاندا گوزەر دەکەم
فەرهەنگێ جوێن لەبەردەکەم
ئەوەی بووە بۆی دەنێرم...
ئەوەی دەبێ بۆی دەنێرم...
دەبا زەوی کرمەڕێز بێ،
چاوی گەردوون نەبینا بێ،
هەرچی وار و وەرا هەیە، هەتا هەتا لە شینا بێ،
دڵی خودا لە کۆچەڕێی ئەم گەلەدا،
لەناو خمخۆری مینا بێ!
***

## بۆ شەهید حەمەڕەش

لە دیوانی تەم لێ نیشتوی شەهیدانا
کێیە کە خاوەنی بەشە؟
بەشی گەورە، ئەوە... شەهید
(حەمە ڕەشە)!
هۆ شەهیدە بێ دەنگەکەی،
شەرگەی شکان!
کێ بوو ئابڕووی هەموومانی
وەها تکان؟!
یادت دەکەین... بەڵام لە کوێ؟
لە خەبەرێکی بێ باڵا...
دێیتە خەونیش... بەڵام لە کوێ؟
لەنێو لانکەی سارد و سڕی بێ منالا!!
هۆ شەهیدە بێ دەنگەکەی... ئەم سەفەرە!
لاکەرەوە...
ئەمڕۆ هێزەکەت هەر پرسە
فەرموو وەڵامیان بەرەوە:
ڕاستە دەڵێن: هیچ شۆڕشێ نەیتوانیوە دادپەروەر بێ؟
هیچ شۆڕشێ هەتا دوایی نەیتوانیوە تاجی سەر بێ؟
هیچ شۆڕشێ نەیتوانیوە وەکو هیوا
چەپکە گوڵی بەر کەمەر بێ؟!
تۆ بەولاوە لەم ئافاتە کێی تر هەیە بەخەبەر بێ؟
هۆ حەمەڕەش! هۆ شەهیدە بێ دەنگەکەی،
ئەم سەفەرە!
لاکەرەوە...
بەر پێی شۆڕش، هەڵدێرێکی زۆر خەتەرە
مەزاری شەهیدانی ئێمە
دروشمێکە دەکوژێتەوە و
بێ چەپەرە!

***



## ئاڵا...

١٩٩١/٤/٣٠

لەپێش دەمی ئاڵایەکی هەڵکراوا
هێندێ وەستام
هەردوو چاوم بوون بەمەل و
لەناو ڕەنگی... سەوز و سووریا
دەستیان کرد بەچینەکردن
کەچی ئاسمان زریکانی:
- ئاڵای خەڵکە! چاوەکانت بگوێزەوە!
بۆ نازانی، نەزەرکردن تاوانێکی زۆر مەزنە،
پاداشتەکەی هەر سزایە!؟
- باشە ئەی تۆ بەمن ناڵێی،
بێ ئاڵاییم... کەی ڕەوایە؟!

***

## نەتزانیوە!

١٩٩٢/٧/٦

نەتزاینوە لەنێو دەریای جوانیی تۆدا
زۆر لە قووڵا گەوهەرێکم،
مەلەوانی شیعرم نەبێ سەرناکەوم!
نەتزانیوە، من سێبەرتم
بەڕووناکیی شیعرم نەبێ...
تەمومژی بێ دەربەستیت دەمکوژێت و
دەرناکەوم!
کە تۆ دووربیت، دوور دەنوێنم
کە نزیک بیت، لەپێشترم،
جار جار تەواو بەقەد خۆتم،
یا کورت تر و درێژترم!
دەڵێن حەز لە سێبەر ناکەی...

بۆ داوێنت دەبێ بەکۆت،
وەرە دەفتەری ئامێزم... ببیت بەمن
ببم بەخۆت!

***

## کەندەسمە

١٩٩٦/٤/٧

کەندەسمە ڕەنگینەکە، بقریوێنە
وەرە و بەکەندی دڵمەوە هێلانەکە
بەشانەی برژانگی تەڕم، بەرگەردنی خۆت شانەکە!
چاڵۆچکەکانی نێو دڵم بەزەڕنەقووتەی ئەم هیوا،
هەر هەموویان لێوانەکە!
کە، ڕووت کردە هەنگەژاڵی شیعرەکانم
دەنک، دەنک هەڵیان چنە
بیکە بەزادی زاری خۆت
بیکە بەپلپلەی خەندە، بۆ سەر تاقی جووتە برۆت!
کەندەسمەی سەرکەندی دڵ، ئاگات لێ بێ
واشەی وشەی نەیارانم دێت و دەچێ...
چنگ دەهاوێ
ناخم بکە بە سەنگەرت...
دەست مەگرەوە... کاتی پێویست بێ یەک و دوو،
بمکە بەقوربانی سەرت
کەندە بزێوەکە!... کەندە وێرانەکەی دڵم،
بکە بەجێگەی عەشقێنی...
دەخیلت بم، ئەو هێلانەی لەوێ دەیکەی
وای دروست کە، نەیڕوخێنی
خۆ تۆ هێلانەپەرستی و هێلانەی خۆت جێ ناهێڵی
لەمێژەوە هاوار دەکەم،
سوپاس گوزاری دەنووکتم، ئەگەر بێت و تەختی ئەندێشەم بکێڵی
شوێن خەرمانی وشەکانم، بکە بەجێ چینەی ڕۆژان
نزام، پۆدرەی بن باڵت بێ!
لە گەردنی ڕەنگاڵەتا، دڵۆپ دڵۆپ ئەسرینی من،





ملوانکەی پڕ لە خاڵت بێ!
کەندەسمە نەخشینەکە! کێیە لەم شیعرەی من دەگات؟!
کێیە ئەم ئاهو نزوولەم، بۆ بەردەرگای شەمێ دەبات؟!
بڵێ: وەلی، لە ئاموونێکی تەحریما، کرا بەداری تەکفیرا...
لە جەنجاڵی مێژوویەکی سەرەو ژێرا...
ئەم شیعرەیشی وەکو تاوانبارێ گیرا!!

***

## (........)

١٩٩٣/٨/١٩

خۆ ئەگەر من، درەخت بوایەم، وا هەڵدەچووم،
جێگای هەزار هێلانە بم
سایەی بەختی هەزار شار و هەزار گوندی وێرانەبم!
خۆ ئەگەر من باخچە بوایەم، هەزار گوڵم تێدا دەڕوا...
خۆ ئەگەر من دیوان دەبووم، هەزار سروودی ئازادیم،
لە کۆڵ دەگرت تا دەرباری زاتی خودا!
خۆ ئەگەر من یێ. نون. کاف. بام
پێ. دال. کافم ڕادەمووسی...
حێ. شین. کافم ڕادەموسی...
مێژوویەکی وام دەنووسی،
ئەم دنیایەش وەرگەڕایە
نامە و ناوم هەر بمایە!
کەسیش خراپ لێم تێ نەگات...
سووری خەرمانی ئەم وشەم، بەدەم ڕەشەباوە نەدات!

***

## لە پێشگاهی (خانی)ی نەمردا

١٩٩٥/٦/١٨

دەرگای هەموو ئاسمانەکان کرانەوە
پێغەمبەران کۆڕیان هەموو فریشتە بوو
مژدە درا کە ڕابەرێک سەردەکەوێت...
گیانی پاکە، نووری پاکە

توخمی پوختی کوردستانی ئاو و خاکە
دەستی قودرەت خامەی ئەوی داهێناوە
قەڵەمی ئەو خواوەند سوێنی پێ خواردووە
وتیان: ئەمە ئیبراهیمەوە کە هەناوی بۆ قوربانیی
خستە سەر چیخ،
خودا بۆ خۆی کەبشی فیدای بۆ ناردووە
بەڵگەنامەی پیری پیران بەرماڵی سەرشانی ئەوە
لەناو ڕەوزەی تەسەوفدا دێت و دەڕوا
گوڵی لالەی لە دەستایە
ئەوە دیارە لە مەڵبەندی کوورە و گڕا، خۆی وەستایە
بەستەی ئەوە لەسەر زاری فریشتەکان وەک پەپوولە
بەرەو ڕووناکی کردگار، لەباڵ بدەن
لەژێر تاڤگەی ئەو عەشقەدا دەتوێنەوە
لە ڕەوحی ئەو ڕەیحانەدا، وەک خونچەگوڵ دەشنێنەوە
داستانێکی سەیری پێیە...
قیبلەییێکە و هەزار ڕێیە.
ڕێگە هەمووی هەر زڵەی دێ
ڕێگە هەمووی شادەماری ڕێ پێوانە
هەر شیعرێکی دیوانی ئەو دارە گەورەی جێژوانە
بۆ کۆڕی گشت پێغەمبەران بانگی شەونوێژی بروایە
لەناو دیدەی ئارارات و پیرەمەگروون و قەندیلا
چەند سەد ساڵە هەر دەبینرێ؟. چونکە قەبەسی خودایە
چونکە دەلیلی مووسایە
چونکە (خانی) دوایی نایە
چونکە (خانی) ئەو پیرەیە خاوەنی ڕازی دەریایە
چونکە دەریای باوەڕی ئەو گەوهەری تاکیشی تیایە!
گۆی هونەری لەدەستایە!
ئەوا دیارە لە جیهانی ئەندێشەدا، خۆی ڕابەر و مامۆستایە.
* کێ بوو بانگی ناسینی تۆی دا بەگوێمان؟
منەتباری ئەو بانگەییم
وەکوو خامە



وەکوو ڕێزی پەیڤ و نامە.
(خانی) ئەتۆ سەردەکەوی، هەتا قابە قەوسەین دەڕۆیت
خەمی (مەم و زینیش) دەخۆیت
وەختێ دەنگت دەگاتە خوا، دەنگت دلێرتر هەڵبڕە:
بۆ قەدەرمان لێ شێواوە؟
بۆ شەرابی تەعمیدیشمان هەر خوێناوە؟!
لەناو تابلۆی پارێزراودا بخوێنەوە...
بۆ هۆنراوەی ئەم داستانە هەر بێ کێشە؟
بۆچی جامی ئاهەنگەکانی ئێمەی کورد، هەر ئازار و دەرد و ئێشە؟
(خانی) خۆ تۆ سەردەکەویت، (خانی) دەنگت...!
ئەی میحرابی قودسی خودا کوانێ ڕەنگت؟
لەسەر کێوی ئەم جەلجەلە
بەهەزاران مەسیح دیارن...
بەخاچەوە هەڵواسراون
ناسراون و نەناسراون
ئاه و ئەشکی جگەرسووتاوی خەمی تۆن
لەتەختە بەرد نەتاشراون
دەنگ هەڵبڕە، کوا ئایەتێک؟... بەتەوێڵی ئاسمانەوە
چاوێک بگرێتە ئەم شوێنە
ئێرەش وەکوو جەستەی هەموو کیشوەرەکان
وەکوو ئالای سەرساریەی دەوڵەتەکان
دەشێ بکرێتە جێ وێنە!
ئەی بۆ ئەم وارەی ڕاخست و ئێمەی کوردی لەسەر دانا؟!
بووین بەتۆوێ لەسەر چیا و لەناو دەشت و لەهەردانا.
لەو کۆڕەدا کاتێ بادەی وەصلی یارت پێشکەش دەکەن...
بڵێ: کوانێ جامی کوردان؟
کورد (مەم و زین) قوربانیی بوو
پەیکی خەمی ئەم دەڤەرە شۆری گەرمی (مەلای جەزیری) و (نالی) بوو
ئاوارەکەی شاری کۆ بوو
قودسیەتی شیعری تۆ بوو.
* خانی! خانی! ئەوە ئەشکم ئەشکی سوورم

ئەوە کلّپەی ناخی گەرمی جێ تەنوورم
ئەوە دۆعام ئەوە شکات و هاوارم
ئەوە حەرفم ئەوە بەستەم ئەوەش زارم
چاوت لێیە چی قەوماوە، چی دەقەومێ
لە جێژوانی مەم و زیندا چ ئاگرێک تاو دەسێنێ
چ دۆزەخێک پێی ناوەتە گەرووی ژیان
چ لەعنەتێک دەستی لەسەر چەخماخەیە
بەرەو سەری دین و دیان
لەدەرسیم و دیاربەکر و ئورفە و ماردین
هەرچییان کرد وتمان تورکن
لە سابڵاخ و سنە و سەقز
هەرچییان کرد وتمان گورگن
لە هەڵەبجە کیمیاباران
لە بادینان کیمیاباران
ئەنفال، ئەنفال... ئەنفال گۆڕی ڕووسووریمان
ئەنفال... مەرگی بێ ناونیشان
ئەنفال... کورد لە ڕیشەکێشان
ئەنفال، ئەنفال، وتمان بەعسە
بەعس، فاشییە نازییە
بەعس، ئەگەر لە زێرابیشدا بیبینی
هێشتا لە خۆی هەر ڕازییە!
* کێ پێم دەڵێ ئەم ئاگرەی بۆ چەند ڕۆژێ کز کراوە
ئەم شیوەنەی بۆ چەند ڕۆژێ دواخراوە
ئەم لەعنەتەی بەسەر شار و شارۆچکەدا
بەسەر خەرمان و شارادا هەڵدراوە
تێسکەی ئاگری هەورێکە
کەڵبەی شاراوەی بەورێکە، هەتا کەیە؟
خەتای کێیە... کێیە کێیە،
بەڵگەنامەی خوێن ڕشتن و فتوای ئەم فاجیعەی پێیە؟!
کێ کەربەلای خەم و خوێنی بۆ هێناینە شوێن خەمی تۆ؟
کێ گشت ڕۆژێ سەری یوحەنایەک دێنێ و



دەیهاوێتە سەر خەمی تۆ؟
خۆ تۆ هێرۆدۆسێ نەبووی... تۆ شاعیر بووی
تۆ خاوەنی قودسیەتی ڕێگەی باطن و ظاهر بووی
تۆ مامۆستای مێرخاسان بووی
بانگ وێژی نوێژی ئازادی مەم و زین و دادی کورد و کوردستان بووی
کوا ئابڕوومان لەکام سیپان هەڵدێراوە؟!
کوانێ خەومان لە کام شیوی هەلایهەلا، لۆێچێ چڵکاوی کوێراوە؟
ئەمەیان کێ؟ ئەمەیان چۆن؟ ئەمەیان بۆ؟
ئای خانیم ڕۆ، ئای حاجیم ڕۆ!
کێ ئەمەی کرد؟
مامە کردی؟ کاکە کردی؟ باشەی کێ بوو؟
ئەوەی کۆتری ڕاپەڕینی پەڕ و باڵ کرد واشەی کێ بوو؟
چیت بۆ بڵێم، چۆن لە ڕووم بێ دوو ئایەتت بۆ بخوێنم؟
چیت پێ بڵێم، من چۆن دەژیم، چۆن دەمێنم؟
* (خانی) لە نوێ، (خانی) لەوێ
خەمەکانت بێنەوە کوڵ. خوا بیبینێ
تۆ ئەو بادەی لەسەر دەستت ڕاتگرتبوو، دەبا مەجلیس پێ بزانێ
لەبەرچی تۆ دوات خستبوو؟
بۆ نوێژت دانەبەستبوو؟
سوێندت دەدەم بەعەشق و مەی، بۆ تەجلّی زاتی خودا کە سوجدەت برد
بڵێ و بڵێ: سبحان الله... کوا مافی کورد؟!
(خانی)، (خانی)... ئەوە سەرم لەبەر پێتا بەردەبازە،
ئەوە دڵم، نەورۆزی ڕێی خەم و ڕازە
ئەوە شیعرم تیژە وەکوو چاوی بازە
لێوم تەڕ کە، جارێکی تر بەچێژی مەی
بەئەشکی زین بەسۆزی مەم
من جێگە پێی یادەکانت وەکوو سورمە لە چاو دەکەم
من ئەندێشەی شەهیدانی کاروانەکەت،
بەکۆڵمەوە بەرەو مەرجی ڕەوا دەبەم
تۆ نەمری و من مۆمێکی خەڵوەکەتم
هەتاکوو تۆ سەربکەویت هەر دەمێنم

وشەی وێڵم بەئایەتی شیعرەکانت ڕادەهێنم
تۆ قیبلەمی... پەیامبەرمی
ئەتۆ خولیای خولی سەرمی
ئەو هەژارەم کە تۆم لەنان خۆشتر دەوێ
تا نەگەمە مەیکەدەکەت، دڵ و دینی من ناسرەوێ
تۆ نەمری و زێڕی زارت چ نرخێکی پێ ڕەوایە؟!
ئەو خەرمانەی دەوری سەرت هەر دەمێنێ
بەشێک لە فەیزی خودایە(١)
نوورە و لەم دەیجووری ژینە، شامەشخەڵی ڕێنمایە
ئەوە پەیامی غەیبییە... (خانی) دەڵێت:
دەتۆ بنووسە نامەکەت!
هێزێ بدە بەخامەکەت...!

**تێهەڵکێشێ:**

هۆ کاکی خۆم، هۆ مامی خۆم
چەکی ئێمە شەرمەزارە لە کوێی بشۆم؟
چەکی ئێمە بەرەو دوژمن تەقە ناکات
چەکی ئێمە بەرەو قەوارەی یەکبوونمان شاڵاو دەبات
لێرە لەجێ خەمی گەورەی بارزانیدا
لەوێش لە پێش چاوی شێخدا
گەڵای داری ئومێدی کورد دەوەرێنێ
بەناو ڕیزی شپرزەدا، شپرزەیی دەشێوێنێ
برارۆیە...
وتمان ئەمڕۆ هەر کورد کوردە نەمن منە و نەتۆ تۆیە
قودسیەتی وشەی ئێمە
لەناو پەیڤی (خانی) دایە و
لە سۆزی گەرمی (نالی)دا سەدای خەمی
حاجییەکەی شاری کۆیە

(١) چامەکە لێرەدا دوایی دێت، بەڵام تێهەڵکێشێکم بۆ کرد ئەویش کۆتایی چامەی (ناکۆکەکان)ە کە سەبارەت بەشەڕی ناوخۆ ساڵی پار نووسیبووم.



تارای ئاشتی نەدەن بەسەر بووکی شیعرا
هەتا دەمرم باوکەڕۆیە، برارۆیە،
هەرچییەکمان کە چنی بێ، دیارە هەر تانی بێ پۆیە
هەزار سەلام لە (خانی) بێ و لە کوردستانی ئاوەدان
لەو پەیڤانەی بۆ عەشق و خەم
ئەمڕۆ دەبن بەجێژوان.
***

## بۆ ئەو بێ نازانەی... تەنها، لە سوێنی درۆدا بەسەریان دەکەینەوە

١٩٩٦/١٢/٢٦

١- چاوم لێیە سەری ڕێگەتان گرتووە
چاوەڕوانی خەبەرێکن...
- ئەرێ خەبەر چ خەبەرە؟
- خەبەر لای حیزبی شەڕکەرە:
مەیتێ کەوتووە لەنێوان
پێمان دەوت کوردستان!
دوان لەمان و دوان لەوان
دەبیەن بەرەو گۆڕستان!
٢- چاوم لێیە گوێتان شلە بۆ سەدایە،
- بۆچی دەنگی سروود نایە؟
- سروود ئەمڕۆ هەرجاش جاشە...
حیزبایەتی تەسک و تروسک،
هەنگاو و هەڵپە و تەلاشە!
کوردیش خوا وای بۆ کردووە،
هەر کلاشی بەپێ باشە!
چاوی لەباری بێ باری،
مستێ نیسک و لوێچێ ماشە!
٣- چاوم لێیە دەتانەوێت خوێنی خۆتان هەڵسەنگێنن
گوێ ڕاگرن! ئەوەی لێرە بەشەهیدی ناونووس دەکەن،
لەلای ئەولا تەواو خائین و ناپاکە!
ئەوەی ئەولا بەشەهیدی،

ناونووس دەکەن...
لێرە نازناوی کەلاکە!
شەهید...! مەزڵووم، بێ ناز و ڕاز!
هەتا ناوت لێ نەنراوە،
بەرەو گۆڕێ چەپەک ڕاکە!
***

## نیشتیمانم لە تەمەنی دوو هەزار و حەوت سەد ساڵیدا

١٩٩٦/١١/٢٢

لە خەوما بوو، ڕایان کیشامە دادگایە...
وتیان: ئەمە، دەڵێی شێتە و سکڵێ سووری لە دەم دایە!
هەر کوردستان کوردستانە...
بە ڕۆژ و شەو دەیڵێتەوە.
ئەم سرووده نامەشروعەی تاوێک لە دەم نابێتەوە!
لە دادگادا کۆڵێک ئیسقانی سەر و قاچ،
تورەکەییێک خۆڵی وشکی بەژار سووتاو،
لوێچێک خوێنی کوژراوێکی برا کوژراو...
لە پالێتی جوتێ حیزبی نەگونجاودا گرتیانەوە...
خستیانە سەر دارەمەیتێ!
بەقیرائەی سەبعەی ئەنفال تەڵقین کرا!
بەمەنگەنەی سنوورەکان گۆڕەو شارێکی چاک درا!
زەلامێک هات، بەڕووبەریا ڕەنگی ئەتاتورکی کێشا...
هەر لەوێشا... بەعەرەبی و فارسی و تورکی پێیان وتم:
– ئیتر بەسە قورپێوانت!
ئەوە خۆت و نیشتمانت...
ئەوە خۆت و کوردستانت!
***

## بۆ دایکی دڵسۆز و پەنا: سەردەشت

١٩٩١/٤/١٢

سەردەشت!... دایکی بەهرەی جوانی و مەردایەتی...
لە ئاوێستای ئەندێشەما، تۆ سروودی تۆ ئایەتی!
ئەو ئایەتەی خوا نەخواستە، خوا نەکردە گەر نەبوایە،



دەبوو باخات هەموو زڕبن، دەبوو هۆش و سەر نەبوایە!
ڕێگەی هاتوو نەهاتمانە، سەری خستە سەرکۆشی تۆ...
هەرچی دەرد و ئازارمانە، ئالایە بیر و هۆشی تۆ
وەلێ، تۆ دایکی دڵسۆزی، دایکێکی زۆر باوەش گەرمی،
لە کیشوەری شیعریشمدا، هەرتۆ تاجی لەسەر سەرمی!
سەردەشت! شاری جەوان مەردی، هەتا هەتا ئاوەدان بی...
بۆ سەر زامی ئاوارەکان، تۆ هەتوان و تۆ وچانبی!
سوپاسنامەی ئەم جیهانە کۆکەنەوە هێشتا کەمە،
پێشکەشی تۆی بکەم دڵم، سەرچاوەی ڕازە، هی خەمە
ئەو ئازارەی ئێمە دیمان لە کۆچی مەرگ و شەوماندا!
تۆ نەبوایەی تیماری کەی، دەبووە عەزیا لە خەوماندا!
ئاوەدانبی، بەرقەراربی، گوڵی هەمیشە بەهاربی...
سەردەشت! لەسەر دەستی خودا وەکو بەهەشتی ئاوداربی!
***

## ژیان

١٩٩٦/١١/٣

کە کارت بوو شارت هەیە!
تۆ، سەرەتا و بارت هەیە
ژیان بەخۆراک و خەوە...
ژیان هەردەم، دوو دژوارە،
ڕۆژ و شەوە...
خۆراک بەرانبەر بەپوولە،
پوولیش ئەسپێی بن گیرفانی خواپێداوە.
خوا پێداوان ورگیان نەبێ، هەموو گیانیان داخراوە!
خوا پێداوان هەڵپە نەبێ،
هیچ شەوقێکیان لێ نەدراوە!
خۆراک نەبێ خەو خەیاڵە، بیر مناڵە...
خۆراک نەبێ دەستنوێژ و نوێژیش بەتاڵە!
خۆراک نەبێ نیشتمانیش،
ئەم سەرەوسەر گۆڕاوایە...

لە شەڕواڵی برسییاندا، دەڕوا وەکو دەنگی بایە!
لەناومۆخی بێ بەرگێکا، لوورەی قەرسی ڕەشەبایە!
خۆراک نەبێ کتێب پەیژەی دزەکانە...
تیۆر ترياکی ئازارە
باوەڕ بەهای دوای قەتارە
خۆراک نەبێ حیزب، پەچەی بێ ئاژەڵە،
خۆراک نەبێ شیعر مشکی بن باخەڵە!
خۆراک نەبێ شەرەف کۆنەی کەم بەهایە
خۆراک نەبێ نەوسییش سەگی بەرەڵایە!
خەڵکە بەخوا هەر هەژاری...
ئەسبابی کوللی بەڵایە!
کوردایەتی! تۆ پێم بڵێ،
ئەم ژیانەت لاڕەوایە؟!
پرسیاری من بەرەو خەڵکە...
هاواریشم ڕووی لە خوایە!
***

## شەختەی ڕۆح

١٩٩٦/١١/٨

دڵی خۆم کرد بەچڵەکی دەرگای خۆرا
تا نوقم بوو لەناو تیشکی جۆراوجۆرا
تۆ نەهاتی من بیپێویی و من نەمزانی،
سنووری نازت تاکوێیە!
لەم بارەوە بێ ئاگا بووم
تۆچت پێیە و خۆم چم پێیە!
خۆ من دڵم هەروا لەوێ هەڵواسراوە...
ڕووەکێکە بەبۆنی تۆ ئاودراوە
ئەو (وەلی) یەم (شەم) نازانێ چۆن دەسووتێم
دەروێش ئاسا لەم خەڵوەدا زیکرم سۆزە،
ئاپۆرای ئەم عەشق و تینەم ئاپۆرایەکی ئالۆزە
خاتووزینم،
وەکو ڕۆحی مۆنالیزا لەناو تابلۆی خەوا بینی...



کەچی وای زانی شیعرێکم بێ ئاوازم
سەرگوروشتەم یاخود حیکایەت و ڕازم!
هەر خۆم بەتەنها دەیزانم تۆ چەندیت و چەند دەهێنی!
تۆ چاوێکم لێ داگرە گەر دەتەوێ،
شەختەی ڕۆحم هەڵتەکێنی
تەمای خەندە و ماچم نییە. پاڕامەوە،
نەکەی بۆ من دەقی ڕووی خۆت بشێوێنی
سامانی تۆ، کە جوانی بێ...
شایانی ناوبانگت نییە دڵی عاشق بڕەنجێنی
من چیم دەوێ جگە لەوەی ڕۆحم هەڵتەکێنی...
ڕۆژێک وەکو مەلی ئازاد هێلانەکەم بۆم بخوێنێ
گەردەلوولی دەم و ڕۆژگار ڕەوتی شیعرم نەشیوێنێ!
***

## شەخسە شیعرینە

١٩٩٦/١٢/١

وەک پایزی نێو سەیرانگا چۆڵەکانمان بێ ناز کەوتووم...
تەمەن بەلاما ڕەت دەبێ، وا دەزانێ بێ خەم خەوتووم!
ئاسمانیک، ئەمڕۆ ڕەشماڵە و خۆم لە کەمەیدا دەبینم...
ئەستێرەییێکم ناداتێ، لێرە بیکەم بەسرینم... بێ سەرینم!
لەم ئاقارە پەژموردەدا...
وشکەساڵی، هۆش و بیرم وا قەسریوە،
ئەم زەمینەی کە من لەسەری وەستاوم
کەس تەڕایی تیا نەدیوە!
هۆ براگەل... وەرن مەیتێ وا لە مەیدانا کەوتووە:
دوان لە ئێوە و دوانیش لەوان،
بۆ گۆڕستانێ بەرێی کەن، بێ لێدوان!
ئەمە، جەستەی خەڵوەی شیعر و ئەندێشەیە...
ئەمە، ئەگەر وەبیرتان بێ، ئەو سەبییاحە دەروێشەیە،
کە سەربانی لێدەگرتن، دەفیەکوتا!
وەکو (موفتی) بەشوێن دڵیا، گەڕیدە بوو
لە کوێوە بۆنی گوڵ دەهات، ئەم بۆی دەچوو!

چونکە دڵی لەگوڵاودا گرتبووەوە...
بوو بوو بەکلدانی شیعر و چاوی عەشقی پێ دەرێژا...
بەئایەتا دەیهۆندەوە، لە تەکبیری یەکەم ڕکاعەتی نوێژا!
ئەمرۆ بێ گوڵ سەری ناوەتە سەر بەردان...
ئەمرۆ خەمیش، لەم گوڵدانە لوتەلایە
ئەمرۆ ژیان گۆڵمەزێکە، دەڵێی شەیتان لە بەینایە!
ئەمرۆ ئەوەی کەس نای بیسێ سۆزی شیعر و شنەی خوایە!
وەک پایزی نێو سەیرانگا چۆڵەکانمان بێ نازکەوتووم،
نەیارانی حیزب زەدەیش، بەخەمیان وت: مەیە و مەچۆ...
ئەمە، شەخسە شیعرینەیە و،
تەنها هەرتۆی گرتۆتە خۆ!
***

## یوسف هەر بۆ زلێخایە

١٩٩٦/١٢/٢٠

براکانم... هەزار و یەک سوێندی قورسیان بۆ باوکم خوارد،
تا ڕێگەی دام بەرەو چۆڵی تەکیان کەوم
وتیان: سەیران و هەرایە،
برا لە پشتی برایە!
ئێوارە لای گەڕانەوە پەلیان گرتم،
بۆ سەر بیرێکی چەپەکی قووڵیان بردم
هاوارم کرد و دادم کرد، کراسی بەریان دادڕیم...
هەر پاڵێک بوو، وەکو مەلێکی باڵ شکاو،
بەربوومەوە بۆ قووڵایی...
بۆ هەڵدێری تاریکی بیر، ئەشکم بوو بەتروسکایی!
نەدەنگ نەڕەنگ، حەسرەت نەبێ دەمخواردەوە...
ڕووناکیی وا چاوی لێک نا، نیازی نەبوو بیکاتەوە!
باشە برا خەتام چی بوو ئەم دەردەتان لە سەیراندا،
بۆم نایەوە؟
گرێ کوێرەی ناخی ڕەشتان بەم ئازارەم کرایەوە؟!
ئەمە دنیایە و ڕێگایە،
هەزار پەند و باو و بەزمی سەیر و سەمەرەی وای تیایە



وەکو دەڵێن ڕێکەوتەکان لە پلانی خودی خوایە!
بابی منیش لە هەمووتان بەگومانە و پرسیاریشی لە دڵدایە!
کاروانێک دێ و دەرم دێنێ، دەمداتە دەستی ڕێگایە...
هەروا بووە و هەر وەهایە!
گەیشتمە نێوکۆشکی -عەزیز-
منی (یوسف)ی ئەم پەندە، ئەوی دی نیم
وام بڕیارە ئەگەر ساتێک،
عومرم مابێ، بۆ -زەڵخە- بێ و...
پشت بەم برایانە، نەژیم
یوسف هەر بۆ زلێخایە،
لە ماڵی هەر کەسێکدایە...
چونکە لە باوەشی ئەودا
نوێژ دروستە و بۆ خودایە!
ڕۆژگاریش دێ و ئەم شیعرەیشم،
بۆ دەخاتە فەرهەنگی خەم!
گورگیش بەپیلانی برا،
برایە تر دەکات بەژەم!
***

## داستانی عەشق- مەم و زین

تشرینی یەکەمی ١٩٩٠

### پێشەکیی داستانی عەشق

کچان: ئێمەی کیژان خاتووزینین
کوڕان: ئێمەی کوڕگەل کاکە مەمین
کوڕان و کچان پێکەوە:
پەیامی شیعر و ئەندێشەیین
سۆز و سروودی سەردەمێن
داستانی عەشقە بەستەمان
هەموو دەیلێێن... دەیلێینەوە
ئەگەر بشرێین... خولێکی تر،
لە سۆزی نوێدا دێینەوە

ئەمر عەشق و عاشقانە...
بەستەی ئەوین لە خواوەیە
کە کۆچ و بار کەوتە ڕێگە،
خۆشەویستی پێش دەکەوێ و
هەموو شتێ لە دواوەیە!

*

مەم: هۆ داپیرە. تۆ نوژداری،
تۆ لە دەردان خەبەرداری
دەپێم بلێ کام دەردەیان زۆر گرانە؟
داپیرە: کە تووشی بووی دڵت پشکۆ و ئاگردانە
بەنێو نیگای چاوێکا دێت،
بەچاویشا هەتا ناخی دەروون دەچێت...
هەوەڵ نیگا مووچڕکەیە لەناو هەستا
تەپەی دڵە لەژێر ئۆفی لەپی دەستا!
جا دێیتە کوڵ...
هەموو لەشت دەهەژێنێ و ڕوو لە سۆزی یاران دەکەی
کە شاری بیت، چۆڵان دەگری!
دەشتەکیش بی، ڕوو لە کووچەی شاران دەکەی!
چاوت دەبێ بەسەرچاوەی فرمێسکی مەنگ... لەناو تۆفی پەژارەدا
ئاسمان و عەردە پێخەفت، سەرینیشت دەبێ بەسەنگ...
مەم: دەرمانی دەرد، ئەی داپیرە
ئەی داپیرە، دەرمانی دەرد!
داپیرە: دەم بنێیتە دەمی یارت...
مەم: خوا نەخواستە ئەوا نەبوو!
داپیرە: ئەوا دێینە سەر مەزارت!

### تابلۆی یەکەم

ئەو ئاوێنەی کە دڵداران خوداوەندی
تیادەبینن، برام عەشقە...
عەشقیش بەهرەی گەیشتوویی دوای،



دەرئەنجامی هەزار مەشقە!
(خانی) وای وت... کە دەستی دایە خامەکەی...
کە چیرۆکی مەم و زینی کرد بەهەوێنی نامەکەی
نامەی عەشقی، نامەی هۆشی،
نامەی ئەو جامە پیرۆزەی... لەناو کۆڕی عاشقاندا
هەر ئەو نۆشی،
هەرچی بێژنگی دنیایە، ڕووی ئەو خۆرەی دانەپۆشی!
زین: پێم ناوەتە عومری جوانیی
ژیان خەندەی لەسەر لێوە...
من چاوەڕێی بەختی خۆمم، چونکە هیوامی وا پێوە
گوڵم، تازە پشکووتووم و سروەی بەیان دەم شەکێنێ،
لەسەر پەڕەی ناسکی ڕووم، ڕەنگ و بۆنم هەڵدەستێنێ
شوڕە سوارێک لە خەومایە مژدەی خۆشی یەزدانییە
عەشق نەبێ خەمێکی دی لەلانییە!
لە قووڵایی دەروونمدا وەکو مەشخەڵ دانراوە
بەژنی بەیداخی عەشقمە و لە ئاسۆما هەڵکراوە.
با خۆر و مانگ و ئەستێرە، گاردی ئەم خەونە پاکە بن...
لە نەورۆز و بەهاراندا...
تینی دڵی ئەم خاکە بن
ئەوسا منیش لە ئامێزی یاری خۆما...
تاجی هیوا لەسەر بکەم!
بۆ ئەم جەژنە، ئەم نەورۆزە
سروودی نوێ ئەزبەر بکەم

### تابلۆی دووەم

– خرم، خرم... خرمەی ناڵی ئەسپی شێیە
– هۆ عاشقان کۆڕ تێک مەدەن،
بەڵام بزانن سوار کێیە؟
– لە دەنگوباس و خەبەرات، داخۆ برامان چی پێیە؟
– هۆ سوار، تۆ کێی؟
مەم: کاکە مەمم. خەڵکی مەڵبەندی ئالانم،

بەدوای پەریزادەی خەوما...
وا سەرگەردان و حەیرانم!
– فەرموو سوارە... برایینە کاکە مەمە میوانمانە
– ئادەی جامێ لە بەفراوی قەڵبەزانی ئەو کێوانە
– هۆ کاکە مەم، سواری ماندوو... پاراوی کە، ئەو لێوانە...
تۆ سوارچاکی کۆڕمان نەبی، خوم شێوانە،
لەسەر گڵکۆی پیری مەستان، ئەمڕۆ لە سایەی خوداوە،
پەیڤیی کوردیمان زێوانە!
مەم: برایینە، گراوی من... چرۆیەکە
هێشتا گۆپکەی نەکراوەیە،
ئاوی حەیات لەتوێیدایە...
خەندەی بەیان لەوا هەڵدێ و
کەس نازانێ لە کوێیدایە!
بۆن و بەرامەی بەهەشتە: ڕاگوزەری...
هوما لەنگەری گرتووە، بۆ سێبەری!
سوورە گوڵی تازە شکۆی باخی میرانی بۆتانە،
جوان و وردە
چاوگەی بەفراوی سازگاری خاکی کوردە!
ئەی هاوارە، هەرچی شیعری شاعیرانە...
بەشی جوانیی چاوی ناکات...
هەرچی مەلی عاشقانە، بەشی ڕۆژێ ڕاوی ناکات!
ئەی هاوارە، چەند دڵبەرە،
بەخوا وەکو من دەیزانم، میری میران بێ خەبەرە...
ئەینا دەیوت: مەمی عاشق، تاجی سەرم بۆ خۆت بەرە!
– دەڵێن کێوتان لەنێوانە؟
– کە کێوەکەوتە، نێوان یاران...
جامی شۆڕش تا لێوانە!
لەم کاتەدا بەکۆ دەردەکەوێت
کەسێک لە دانشتوانی کۆڕ:
– هەموو شتێ لەم دنیادا بەکێشەیە...
کێشەی عەشقیش ئەو ئێشەیە...



دووزمانێ وەکو گەرداوی ناوەختە
بەسەر هەلاڵەی بەهارا دادەبارێ
لەناو کۆڕی عاشقاندا تالاو دەدا لەگشت زارێ!
وەکو بەلا دێتە نێوان، هەروەکو گل دەچێتە چاو ،
مێروویەکی ژەهراوییە، خۆی هەڵدەدا بۆ نان و ئاو...
ڕێگەی ئەوین دەشێوێنێ لە دڵداران
لە ولاتی عەشق و خەما، دەبێ بەسالی بێ باران!
بەدە، بەدخوو، بەدکارێکە
لەگەڵ عومری خودی خۆیا، وەک ناکۆک و بێزارێکە
لە ناخەوە، بوغز و ڕقە!
لە دەرەوە، دڕندەیە و کەولی مەڕی لەبەردایە...
نهێن گرە و دەروونی ئەو لەناو دۆزەخی دەردایە!

### تابلۆی سێهەم

– پیری مەستان موناجاتێ!...
خواوەندی عەشق تەنها دەنگی تۆی دەگاتێ
خۆ نزای تۆ زۆر ڕەوایە
لە خەرمانەی حوزووریدا، جێگەی دیارە و بێ هاوتایە!
نزا بۆ مەم نزا عەشق بێنێتە بەر،
نزایەک بێ بۆ دڵداران...
بەسەر کێڵگەی عەشق و خەما، ڕشێنە بێ وەکو باران
با برووخێ بەستی نێوانی عاشقان،
دەست و دەمیان بگاتە یەک
سەری داویان پیرۆزە بێ و بداتە یەک!
سۆزێ بۆ مەم: ساقی وەرە پرکە جامێ لەو مەیە
پێشکەشت بێ، وەک دیاری چیم هەیە...
پێکی گوڵڕەنگ تێکە، توخوا، تا زووە
وادەسووتێم، گڕ لە ناخم بەربووە!
با مەییێک بێ، ساف و بێگەرد وەک خەمم
قوم لە دوای قوم زێدەتر بێ بۆ ژەمم!

کاکی دەنگخۆش، کوانێ سۆزت، کوا سەدات؟
هەر نەوای تۆ ڕێی خەیاڵم خۆش دەکات
یەکگرن با ، چێژی بادەو دەنگی تۆ...
قلْپە قلْپی جام و شەربە و زەنگی تۆ!
بەڵکو مەستیی باری جەستەم سووک بکا
ئاهو ئەشکم، سەرکەون بۆ ڕێی تکا
گیانی پاکی عاشقانیش بێنە لام
با موبارەک بن، بەبۆنی خۆشی جام!
پۆلی مەستان دەم بەدۆعا بەرکەوین،
ئێمە خولیای ڕەنگی خەڵوەی بێ خەوین
سەرکەوین تاکو دەگەینە تەختی یار...
بۆ لیقای ئەو بێینە خوێندن وەک هوزار!
بەکۆ: کوڕگەل سلاو، کوڕ گەل سلاو!
کۆڕتان گەرمە... بیروڕاتان لەسەر سەرمە...
لێم بپرسن... لێم مەترسن!
ڕێگەم بدەن بێمە ناوتان...
باسووک نەبم لەبەر چاوتان!
– بەکۆ، سەگی پاسەوانی،
بەکۆ، توولەی دوای سوارانی!
خامەدڕی، ڕاپۆرت نووسی...
تۆ بێزراوی، تۆ جاسوسی!
– بەکۆ نەکەی!
– بەکۆ نەردی غەش هەڵنەدەی!
پەنا بۆ نامەردیی نەبەی...
– بەکۆ کوێربی ئەم چرایە مەکوژێنەوە،
جامی سەر لێو دیسانەوە مەڕژێنەوە
– بەکۆ بمری و گۆڕ بەگۆڕبی...
– بەکۆ نیشانەی لەعنەتی هەزار کۆڕبی
– بەکۆ نەکەی کورە بەکۆ!
بەر غەزەوی خودا کەوی، دەسابڕۆ...





خاتووزین بۆ کاکە مەمە!
وەک کورد دەڵێ: دنیا من و خاکەکەمە!
کورد و واری، مەم و زینی
وەکو یەکن، تۆ نایبینی!
مەم: برابینە... من ئەم عەشقە ڕێی باوەڕمە، هەر دەیبڕم،
بۆ ئەم هیوایە تەرخانە وزە و گوڕم...
لەم ڕێگەدا تەخت و تاجم لا ، فانییە
لە شۆڕشی عاشقاندا، هەر سەری بەرز قوربانییە!
من ئەسپی شێم لەژێر دایە ،
دەڵێی تیرە، دەڵێی بایە...
من زریانی پێ لەت دەکەم
سەد ڕێگری پێ پەت دەکەم!
هۆ خاتووزین!... وامن هاتووم بۆ دەربارت
بۆ وەرگرتنی پەیامی پەیڤی شیرین و نازارت
هەزار شیعری باڵا نەمام، قوربانت بێ!
هەزار دەنک و خەندەی بەیان بەسەرپەرچەمی جوانت بێ!
لەجێی کێوێ، ئەگەر سەد کێو لەنێوان بێ...
ئەگەر ڕێگە گەرمەشێن بێ و قوڕ پێوان بێ...
ئەسپەشێی من زۆر سەرکەشە، وا شاخ دەکا ،
بەکۆ کێیە؟ هەزار دەردی لە ناخ دەکا!

**تابلۆی چوارەم**

زین: باب و برا ، هۆ کەسوکار!
ڕێگەم بدەن با یاری خۆم تێر ببینم...
بۆ دەترسن، بۆچی شەرمە، خۆ، من زینم؟
من وەنەشەی ناو تووترکی گەڵاشینم،
با ، ببینم... با ، ببینم...
کیژان...! گوڵە نەودەمەکان!
خەمبارەکان، بێ خەمەکان!
شاسوارێکە بەدوای مندا سەرگەردانە...

ویڵی ئاموون و هەردانە.
شۆڕەسوارێکی کوردانە و خولیای هەیە
چونکە منم گراوی ئەو، دنیای هەیە!
قارەمانی ئەفسانەیە و بێ وێنەیە
تاوێ شەستە و ڕەهێڵەیە، تاوێ نمە و ڕشێنەیە!
ئەو، پەیامی خۆشەویستیی پێ سپاردم،
دڵی لە جیاتی ئاوێنە، بۆ هەناردم
ئەو، فریشتەی پەیام هێنی خودای منە...
وا مەزانن لەمن دوورە و جودای منە!
مەم: من هەویری ئاووگڵی نیشتمانی عاشقانم
پڕ بەم خاکی کوردستانە، وشەی کوردی جوان دەزانم
بەستە بەدوای بەستەی خۆشا، پیرۆزەیە بۆ ناوی تۆ،
لەناو هەزار چاوی مۆندا، پێک هەڵدەدەم لە چاوی تۆ!

**تابلۆی پێنجەم**

– بیگرن، بیکوژن... پیلان گێڕە،
خوێنی بکەنە کاسەوە بیخۆینەوە
هەتا نەیخەینە چاڵی گۆڕ، نەڕۆینەوە!
– بیگرن ئەمیش ڕەشە پیاوە...
ناوی میریی بەپیاوێکی وا نەشیاوە
– بیگرن خاتوزین نەی بینێ، ڕەنجەڕۆبێ...
یەخسیری ناو داو و درۆی بەدکارێکی وەک بەکۆ بێ!
–دەی بیگرن نەک بمێنێ
لە ناکاوا نەک نیگایەک لە خاتووزینمان بسێنێ!

**تابلۆی شەشەم**

مەم: زیندان قووڵە جێی ئازارە...
شێوەی زینم لەلا دیارە
نهێنی ئەم ژیانەی من لەلای ئەوە
خوێنم... بەڵێ تەنها خوێنم بەهای ئەوە!



تار و نەیم، بۆ دووری ئەو دەناڵێنن،
تاڵی ئەندێشەی ئەم عەشقەم
لە باڵای ئەو دەئاڵێنن!
هەر ئەو بژی من نامرم...
هەر باسی ئەو بگاتە گوێم، خۆش خاترم!
بەکۆ – لەبەر خۆیە: بەکۆ، ماوە...
هۆ کاکەمەم خەیاڵی تۆ ئیجگار خاوە...
لە ڕێگەتا هەزار داوم بۆ داناوی،
شاسواری ئەم دنیا بوای...
دەبوو بکەویتە ناوی!
–: بەکۆ نەکەی
هیچ خەبەری ناخۆش نەدەی.
وا کاکەمەم سەرلەنوێوە بەڵێن دەدا،
بۆ خاتووزین، ئەم شوێنی دوور لەو شوێن دەدا!
– بەکۆ نەکەی... هیچ خەبەری ناخۆش نەدەی
بەکۆ: هۆ کاکەمەم کارەساتە!
هۆ کاکەمەم ساڵ نەهاتە...
خاتووزینت میوانی تازە گڵکۆیە،
لە گۆڕیشا، چاوی جوانی هەر لە تۆیە!
مەم لەزینداندا: کە زین، بمرێ، من ژیانم پێ ڕەوایە؟!
کوا چەمکی وا لەچی دایە و لەکوێ دایە؟!
کە من نەڕۆم بەدوای زینا،
ئەڵبەت دنیا بێ بڕوایە!

**تابلۆی حەوتەم**

– بەکۆ نەکەی!
خەبەری وا ناخۆش نەبەی
بەکۆ: بەزین بڵێن وا کاکەمەم گیانی سپارد!
زیندانەوان، ئەم هەواڵەی بەمنا نارد
زین: ئەی دڵ تۆ جێی کاکە مەمی!

ئەی دڵ جێگەی عەشق و خەمی،
دوای مەم مەژی تۆو خنجەرێ!
باپەیکی خەم ئەم هەواڵە بۆ ناو کۆڕی باوان بەرێ!

## تابلۆی هەشتەم

–مەم کوژاوە، مەم مردووە؟!
ڕۆژگار کاری وای کردووە؟!
– هەر لەوجامەی کە کاکەمەم بۆ دوایین جار
هەڵی داوە
وا خاتووزین لەسەر لێوی خۆیی ناوە...
دەیخواتەوە
بەمەرگی خۆی وا سلاوی کارەساتی کاکەمەمی دەداتەوە!

## تابلۆی نۆیەم

کۆرس:
هۆ کاکە مەم، هۆ خاتووزین!!
خامۆشیتان هەتاکەی بێ،
ڕازی دڵتان هەر بۆ سۆز و ناڵەی نەی بێ؟!
هەڵسن یەخەی بەکۆ بگرن...
ئەم جارەیان نەکەن بمرن!
دەست نیشانی جێ ژوانی نوێ بکەنەوە...
گلکۆی هەموو ناکامەکان هەڵبەنەوە...
مەخابنە عاشقێنیتان بۆ مردن بێ
مەخابنە ئازاریشتان تەنها هەر ناوەدرکردن بێ!
وا هەرایە...
ئەوەی دەڵێ من عاشقم، کەوڵی عەشقی لەبەرایە...
دروشمێکی نوێ هەڵبکەن:
عاشق نابێ بێ مایە بێ...
درەختی ئەم ئاخ و باخە ئیتر نابێ بێ سایە بێ!
هەڵسنەوە، ئەگەر دنیاش ئاژاوە بێ،



هەڵسنەوە، تەلمیت بەندان ڕازاوە بێ...
ڕۆژ نەورۆز بێ شەوی قەدر بێ، گشت شەوێ!
ئەستێرەکان چاو بەکل بن...
لەناو خەرمانەی ئارامدا یار و دڵدار،
دەست لەمل بن!
پەمەیی بێ کۆچ و باری ئەم شاییە...
بۆ داستانی دڵدارەکان...
هەر پێشوازیی بووکی هیوا،
قفڵ و باسی کۆتاییە!
***

## بەبۆنەی ساڵی نوێیەوە
## دوو دێر -بەنهێنی- بۆ بارزانی

١٩٩٥/١٢/١

### ١

وەختێ تۆ بووی هیچ کەس نەبوو
هەنگاوێکت بۆ تەواو کا ،
تۆ خۆت یەکەم هەنگاوت نا و
هەر خۆت نیشانەشت پێکا !
ئێستەش ئەوەم لە لا سەیرە
بێ پێشرەوێکی وەک ئێوە
دەبێ کاروانی مێژوومان، لەم شەختەدا چۆن رێکا
هۆ شێسوارە نەبەزەکەی کەژی کەژان
ئەسپە شێکەت زین لە پشتە فەرموو سواربە
فەرموو سنوور و پێدەشت و دوند و واربە
فەرموو گوند و فەرموو شاربە
فەرموو زریان و تۆفان و فەرموو نەورۆز و بەهاربە
کەتۆ هەبووی هەر تۆ هەبووی
هەبووی، سەرووی گشت هەبووان بووی!
هەرکەس سەری لێ دەشێوا
هەرکەس رێگەی لێ ون دەبوو تۆ باوان بووی!
بۆ دڵدارانی ئازادی هەر سایەی تۆ جێ ژوان بوو
کە تۆ هەبووی ئەمان هەموو دەستەونەزەر
چاوەڕێت بوون
دەروێشەکانی دوێنێی خۆت، چی قەوماوە وەها شێت بوون؟
تۆ خۆرێک بووی ئاسمانی شینی کوردستان
بەشی بالای نەدەکردی
ئەی پێم ناڵێی ئەم رۆژگارە حەرامزادە
لەناو گەڤی ئەم سەگوەڕە نەبڕاوەدا بۆ کوێت دەبات بۆ کوێی بردی
بۆ کوێت دەبا ، چییە دڵم وێران دەکات؟



### ٢

دڵم رووت بوو ، ئێستە چمکێ لەیادی تۆی لەبەرایە
بۆچی سەرم دەتەقێن، چونکە ئەویش
خۆشەویستی تۆی وەکو تاج لەسەرایە ؟!
ئەوسا ناوت بەڵگەنامەی خەباتمان بوو
ئەمڕۆ بۆچی لەسەر زارمان هۆی هەرایە ؟
ئەوسا هەبووی ڕابەرمان بووی
ئێستێکەش هەیت و ، ئەو رێگەیەی کە بۆت کێشاین
بەیتی کۆری نەدیمانە
ئەوەی رۆژی لا رێتی کرد هەتا دەمرێ پەشیمانە
کە تۆ هەبووی هەر تۆ تۆ بووی
ئەمرۆش ئەگەر ئەم دنیایە شێت بازاڕ بێ
تۆ هەر تۆیت و هەر شێ سواریت
تۆ سروودی سەربەستیت و
ئالای بەرزی کوردستانێکی یەک واریت!
کوردستانێکی یەک زاریت!
چاوگەییێک ئەشکم بۆ رشتی و ئەم دووکەلیمەم بۆ وتی:
نەمن پیری ئاتەشکەدەم، نە تۆش بتی
تۆ زیندوویت و منیش لەناو بەستەکاندا
ئازادیخوازی خۆشخوانم
پێویست ناکات بۆ ئافەرین
بینووسمەوە ناونیشانم...
تۆ شەفەقی ئیلهامیت و
منیش بانگی بەربەیانم
نەیارانیش بۆیان دەلوێ
شیعر بکەن بەتاوانم!
تۆی باوانم
***

## بارزانی

۱۹۹۲/۲/۲۵-۲۰

له دەرگام دا -وەک شاعیرێک-
خنجەرێ بوو دەرگای لەمن خستە سەرپشت
لەسەر لێوی وشک هەڵاتووم توێژاڵێک بارم داوەران
پرسیم ئەرێ ئەوە کێیە؟ لەسەر تەختی خەت و خەبات دانیشتووە؟
تین و تاوی هەناسەمی وەکو مێژووی ئەم چەرخەمان،
لەسەر دەستی هەڵکردووە؟
براییینە بێ ئارام بووم، چاک تێم ڕوانی
چاوی شیعرم خستە ڕێگا بینیم خانی و جگەرخوێن و
مام هێمن و بێکەسی بوو و کەسانی تر
دڵم وتی من دەیناسم ئەحمەد پاشا و شێخ مەحمود و شێخ سەعید و سوارانی تر.
قەڵەم سەری خۆی هەڵبڕی، وتی ئەمە...
پیرە مەگروون و قەندیل و زەردە و هەڵگورد و شاهۆیە
خیرەدمەندی هزر و هۆشم وتی کاکە خۆ بارزانیی من و تۆیە
له خۆمەوە له خۆم هەڵچووم وتم ئەرێ گەورە و بچووک بۆ نافامی؟
وتم بۆچی وا بێ وێڵی؟ دەڵێی ئازاری ناو زامی؟!
وتی بەڵێ کە دەڵێی ڕۆژ هەر دەڵێی ڕۆژ
حەقیقەتیش ڕیای ناوێ
تۆ کە ناوی زریان دەبەی دەڵێی زریان
کە فرمێسکی چاوی دایکی شەهیدێکیش دەکەی بە بۆن
هەر دەبێتە نۆتەی گریان
کە بەچاوی خەم و یادیش ڕوو دەکەیتە ئەو کێوانە
تەنها کەسێک لە شیعرتا دەبێتە کێش و پێوانە
بەرزانییە، پاک و بێ گەرد وەکو سەرچاوەی دیوانە.
تۆ بەرزانی... کە لە دەرگای مێژووت دەدا
لەو دیوەوە ئەهریمەن بوون زەنگی مستی تۆیان دەکوشت
تۆ بەرزانی کە لە دەرگای مێژووت دەدا ئارەقێکی پاکت دەڕشت
تۆ کە چوویتە مێژووەوە ئەحمەد پاشات بیر نەچووبوو



شێخی نەمر گوللەبەندی کاک ئەحمەدی کردە قۆڵت
هەڵۆبەگ و عەولەسیسیش وتیان سەفەرت موبارەک
ڕێگەی سەفەر تووڵانی بوو، هات و نەهات
هەڵمەت بەرەو دۆندی خەبات
تۆ هەڵکەوتی... تۆ پێشکەوتی
لە قیرڕوقاجی ئاهەنگی گیان بەخشینا
گۆچانەکەی ئەحمەد پاشا و خنجەرەکەی شێخ مەحمودت لە دەستا بوو
تۆ سروودی ئەی ڕەقیب و ئازادیخوات لە هەستا بوو
کوردیش دەیوت، هەی دەستت خۆش هەی دەستان خۆش
لە بابەکی خوڕەمیەوە پشکۆیەکی خۆڵ لێ نیشتوو گەشایەوە
ڕەنگی سووری شەفەقی نوێ بەسەر نەورۆزی ئەیلوولا کرایەوە
تۆ کە سواربوویت، هەر چەندیان کرد دانەبەزیت
سواربوونی تۆ وەکو مشکی و جامانەکەی شێخی نەمر، بوو بەنەریت!

**تێهەڵکێشی یەکەم:**

*هۆ سوارەکان... هێشتا سەری مەیدان دوورە*
*هێشتا دوژمن چاوی سوورە*
*دامەبەزن، تاو ئەم تاوە، هەل ئەمڕۆیە*
*ئەمڕۆ هەر ڕۆژی کورد کوردە، نەمن منە و نەتۆ تۆیە!*
دەرگای مێژووت وا کردەوە
خەڵکی دەیوت ئەوە کوردە و ئەوا گرەوی بردەوە!
تۆ سوار چاک بووی، تۆ ئیمام بووی، نوێژت دابەست،
کوردیش هەمووی لە ڕیزدا بوو بەدوای تۆدا
یا کوردستان یا نەمان بوو
دوژمن ماری بێ ئامان بوو
دانەبەزیت ئەسپەشێکەت لە تاوا بوو
خۆرت نابوو بەشانەوە بەرەو ئاسۆ
تاریکەشەو کەوتە لەرزین
سوێندم بەگۆڕی شەهیدان دەستم لەسەر دڵم دانا
نەفرەت نەفرەت لە دابەزین

**تێهەڵکێشی دووهەم:**

*دەرس وەرگرن... دەرسێک و دووان*
*دوو دەرس و سیان... سێ دەرس و چوار*
*دەرس وەرگرن هەر نوچێک و هەزار خەسار*
*دەرس وەرگرن هەل ڕەخساوە*
*قیرائەتی سەبعەی ئەنفال هێشتا لەناو بڵندگۆدا خوێناوییە*
*هێشتا بن باخەڵی دوژمن یۆرانیۆم و کیمیاوییە*
*هێشتا هەڵەبجەی شەهیدمان*
*بەدوای گۆڕی بێ گۆڕاندا هەر عەوداڵە*
*هێشتا سروودی سەپێنراو هەر بۆ پەرستنی داڵە*
*دابەزینیش -بەچاوانتان- لەم دۆخەدا بۆ پێچاڵە*
*دەرس وەرگرن دەرسێک و دوان*
*دوو دەرس و سیان، سێ دەرس و چوار*
*هاوار هاوار هاوار هاوار*
دانەبەزیت، ئەسپەشێکەت لە چوار ناڵە نەکەوتبوو
کاتژمێری بەر باخەڵت نەخەوتبوو
دەست لە دەست و هێز لە کورد بوو
شەپۆڵت دا ڕامالێن بووی
میللەت یەک بێ و ئامانج یەک بێ و ڕابەر سواری پێش سواران بێ
دەبێ کوردستان دایک و شۆڕش خۆی ماڵە باوان بێ
دەبێ دوژمن تانخونی چاوی سووری لەتاوان بێ

**تێهەڵکێشی سێیەم:**

*بیرتان نەچێ ئەسپەشێکەی بارزانیمان*
*پیلان ئاڵایە دەست و پێی*
*هەڵەنگوت و بارزانیمان دانەبەزی*
*ئێوەش نەکەن دابەزن، هێشتا سەری مەیدان دوورە*
*هێشتا دوژمن چاوی سوورە*
*هێشتا حەپەی سەگی ئەنفال، لە تونکە تونکەی گەرمیاندا پڕ بەپڕی شارەزوورە!*
*دامەبەزن پیاوی چابن، یەک بن، ڕابن. ڕابن. ڕابن!!*



تۆ دەتزانی و دانەبەزیت،
ئەسپەشێکەت هەڵەنگوت و دانەبەزیت
دانەبەزیت و جامانەی سوور، لە تۆوەوە بوو بەنەریت
تا ئەو ساتەی مردن ماڵی دڵی گرتی، دانەبەزیت
ڕووم کردە خوا دەستم لەسەر دڵم دانا
پرسیم، پرسیم، تۆ بۆ نەژیت، تۆ بۆ نەژیت؟؟
ئێمە پێویستمان بەتۆ بوو ئەو ساڵانە
تۆمان دەویست وەکو باران
تۆمان دەویست وەکو جاران
تۆمان دەویست وەکو سێبەر بۆ ماندوومان
وەکو بەڵگەی ڕابووردوومان
وەک شایەتی داهاتوومان
تۆمان دەویست وەکو باب و مام و برا
تۆمان دەویست وەکو ڕەمزێ وەکو چرا
وەکو ڕابەری خۆشەویست تۆمان دەویست
پیلان. پیلان. پیلانبازان بۆ وا زۆرن؟؟
پیلان وەکو هەرەس هات و ڕێگەی بڕی
پیلان وەکو لافاو هات و ڕێگەی دڕی
ئەسپەشیی تۆ نوچێکی دا و دانەبەزیت
لەو ڕۆژەوە لەعنەت کردن لە پیلان و پیلانبازان،
لەناو کوردا بوو بەنەریت.
هۆ خەڵکینە خنجەرەکەی بارزانیمان لەلای کێیە؟
خنجەرەکەی بارزانیمان نابێ کێلان کولی بکات
بەدەستەوە گەوهەردارە
ئەسپەشێکەی بارزانیمان کێ سواری بێ تا سەری شار دانەبەزێت
پەیکی ڕێگەی ئازادی بێ و نامە بەرێت!
بۆ سەری شار زۆری ماوە
ئەسپەشێکەی بارزانیمان زینێکی نوێی لێ کراوە
کێ خۆی دەگرێ لەسەر پشتی، ئافەرینی بۆ دەبارێ!
کێ خۆی دەگرێ لەسەر پشتی، ژیان بکات بەنیگارێ!

پێشکەشی کات بەهەزارێ.
کێ بارزانی وەکو چرا لە دەروونیا وەکو چرا هەڵکراوە
دەرس وەرگرێ هێشتا دوژمن چاوی سوورە!
مەملەکەتی تاوانی ئەو هەموو ڕۆژی هەر عاشورە!
بەڵێنی ئەو ژیلەی ماتی بن تەنوورە!
نازناوی ئەو لەمبەرەوە سیادەتە و لەو بەرەوە هەر شاپوورە!

**تێهەڵکێشی چوارەم:**
*دامەبەزن، ترسم هەیە، بوومەلەرزە لە ڕێتانا سەرباتەوە*
*کێ بارزانی بەرابەری خۆی ئەزانێ، جارێ پشتێن نەکاتەوە*
*خۆپەرستی و منمنانێ لە دڵیا پەچ نەخاتەوە.*
دوێنێ چوومە سەر مەرقەدی ئاوباریک و
لە میحرابی دەربەندەکەی بازیاندا چوومە سوجدە و
نێوچاوانم خستە سەر بەردەقارەمان
بێ هۆشییەک –وەکو حاڵی دەروێشان بوو– دای پۆشیم و خەوم لێکەوت
عەقڵم سرەوت، تەماشام کرد وا شەڕ گەرمە
دەربەند گەرووی جەهەنەم بوو، شێخمان سواری ئەسپەشێ بوو
تاوێ بەرەو کەورگ و شاخ، تاوێ بنار
ماوزەری خۆی دەخستە کار
تێکرژان بوو، پیا هەڵچوون بوو
شریخە و شاخ، هاوار و ئاخ، بگرە و بەردە
دڵی دەربەندی هەڵتەکان
بەشێخیان وت با دابەزێت
گەرووی دەربەند دەکەینەوە بۆ کوێ دەچێت!
شێخی نەمر دانەبەزی
گرکان لە نوێ تاوی سەند و دڵ و دەمی زەوی پژا
ئای سوار گلا، ئای خوێن ڕژا!
شێخی ئێمە دانەبەزی، فەرمووی نەفرەت لەدابەزین!
تەختی لەندەن کەوتە لەرزین!
بەڵام... ئەم بەڵامە ڕەزا قورسە
هەر مەپرسە و لێم مەپرسە



دوژمن ڕێگەی دۆزییەوە کە بگاتە ناو دەست و پێی ئەسپەکەی شێخ
چاوی مشیر بوو بەڕەسەد
دەم و لەوسی بوو بەپێڵاو
دڵی مشیر بوو بەزێراو
گەرووی مشیر کرابووەوە وەک لوولە تۆپ
دوای مشیریش بوو بەجێ باسی شڵپ و شۆپ
گەدەی مشیر بوو بەبەرمیلی پاشخوانی سیخ و گورگە
تف لەو چاوە، تف لەو دڵە، تف لەو ورگە،
ئەسپەشێمان هەڵەنگوت و برینی شێخ موبارەک بوو، دانەبەزی...
حاڵ بەری دام
لەعنەت بارانی مشیر بوو
شۆڕەسواری قارەمانمان لەسەر پشتی ئەسپەشێ بوو کە یەخسیر بوو
کێ دەڵێ شێخ بەموستیلەی سلێمانی خەریکی میر و گزیر بوو؟!
شێخ یەخسیر بوو!
هەر گیرفانی پیاوماقوڵ بوو، بوو بەخواری دێڵە شڕوو
هەر لەگەن بوو چاوی لە دەمی کەوگیر بوو

**تێهەڵکێشی پێنجەم:**
*دەرس وەرگرن پێشڕەوەکان*
*مەبن بەباسی کەوەکان*
*مەبن بەرازی ڕەوەکان*
*تێکشانێک و دووان و سیان*
*ڕەوێک و دووان، ڕەومان ناوێ*
*ئێمە فێری ڕەشبەڵەکین خەومان ناوێ.*
*من لێرەوە کۆڕی بەرێزان جێ دێڵم*
*بۆ تەوژمی هۆشی خۆم و هەندێ بەخۆما دەچمەوە*
*من دەچمەوە ئەو ڕۆژانەی...*
*ئەو زامانەی کە پەترۆیان کەوتۆتە سەر لەگیانمدا*
*دیدەنییان دەکەمەوە*
*دەشێ شیعریش بەدیوانی کۆنی خۆیدا بچێتەوە*
*دەشێ فرمێسک، ئەوەی کەوا قەتیس ماوە لە سۆزێکا بڕژێتەوە*
*دەشێ دەنگی ئەحەی ناسر بگاتەوە ناو دڵی شارا؟*

*دەشێ بنجی سووتەمەڕۆ هەڵباتەوە ببێ بەدار!؟*
*منیش هێشتا گوێم لە هۆرەی جوتیارەکانی هۆرێنە*
*بانی خێڵان بەزمی تیایە*
*عەربەت ئاوی لێ بڕاوە*
*لە پانتایی دزەییدا خەرمان شەخڵی خەم کراوە*
*زۆر وتنیش وەکو دەڵێن بۆ کەلامە*
*جامی دەستم هەمان جامە*
*خەمی هزرم هەمان خەمە و پەترۆ لابەی، هەمان زامە*
*بۆیە شیعرم هەردەم دەنگی هەژارانە*
*شیعرم بەستەی ڕەشبەڵەکی خوێن جمانی نێو شارانە*
*شیعرم سۆزی گەلی کوردە، لەگەڵ کوردایە نامرێ*
*شیعرم ئاڵای ئازادییە*
*کێ دەتوانێ ئاڵای شیعری من داگرێ؟!*
*زەوی شیعرم لە گەڕدایە، کێ دەتوانێ زەوی شیعری من ڕاگرێ؟؟*
بەهەشت سەلام...
تۆ پیرۆزیت، چونکە تۆ جێگەی بارزانیت
تۆ بە شەهیدی ئێمەی کورد ئاوەدانیت، پێ دەزانیت؟!
من دەروێشی مەولەویم و هەوری ڕەحمەت
بەئاسمانی داوامەوە ئاڵاوەتە لوتکەی شاخان
کەی کەم ئیستەکەم شەستەکات بەسەر مەزرای بارزانیدا
لە دڵۆپی ئەو فرمێسکەی دایکی شەهیدان ڕێژایان
چەمی گوڵاو دەگرینەوە
بۆ ئاوڕشتنی ئارامگای
پەیامبەری خۆشەویستم بۆ لای گیانی شیعرم دەبات
ئەوەی شێ سواری سوارانە ئەی بارزانی
دەبێ، دەبێ لە تۆ بکات
ئەی بارزانی...
تۆ سروود و دەفتەری جاویدانی، ئەی بارزانی!

***



## قەڵەم و بارزانی

ئەمجارەیان من بەقەڵەم دەدەم لە دەرگای مێژوومان
مێژوو کتێبێکی کوێرە، ئەگەر قەڵەم هەردوو چاوی نەکاتەوە
مێژوو وەرزی خۆڵ بارانە ئەگەر قەڵەم لەنوێ ئاوی نەداتەوە
قەڵەمی من سەرچاوەکەی ئێجگار ڕوونە
بیری چاکە، وتەی چاکە، کردەی چاکە
قەڵەمی من خەنجەرەکەی شێخ مەحموودە،
بڕنەوەکەی بارزانییە.
قەڵەمی من نالی و ئەحمەدی خانییە...

*

مێژوو دەرگات بخە سەرپشت...
شێ سووارێکی جامانە سوور، سەرلەشکر بوو
کە ئەسپەکەی نووچێکی دا
لەناو توونی گەرووی تۆدا بەرەو کوێ چوو
دەتۆ شوێن دەستی ئەو ئەسپەم نیشان بدە
کوێریت بەسە، خۆت لەدەرگای ویژدان بدە
ڕێ بەباڵی زمان بدە
بوو بەڕەهێڵەی بەهارێ...
بەتاڤگەدا هاتە خوارێ،
بۆ سەر مەزرای ئەو هیوایەی دەبێ بەخەونی هەژارێ
بوو بە بەیان لە ئاسۆوە سەرباتەوە
بوو بەنەورۆز ئاگری نوێ بکاتەوە
لە دەروونیدا وەکوو بڕوا جێی گرتووە
لەو ڕۆژەوە سەرقافڵە بوو ئەمڕۆش لەسەر چیاکانمان
ئاڵایەکی جهێشتووە
ئەسپە شێ کەی هەڵەنگووت و دانەبەزی
کە خوا داوای گیانی لێ کرد، چاوی لێک ناو سەری ناوە!
لەویژدانی ئەم چەرخەدا بوو بەکۆڕەو
لەئاگری ئەنفالەوە وەڵامی خوای خۆی دایەوە!
لە جەلجەلەی شیعرەکانما وەکوو مەسیح هەڵسایەوە!
ئەی میوانە عەزیزەکەی شیعر و بەستەم

دیوەخانی دڵی منە ئاوڕشێنە
لای سەروومان بۆ داناوی
چاشتی هەژار نان و دۆیە، کەی تۆ لەمن دابڕاوی
تۆ ئەو تینەی، ئەگەر شەختەی ئەم ڕۆژگارەم
بەسەر سەردا بێتە خوارێ
تیری تەرزەم وەکوو مەینەت لێ بباریێ
پشکۆیەکی ئێجگار گەشت، دەخەیتە نێو کوانووی دڵم
دەژیێمەوە، تاو دەسێنم
تۆ نەمریت، بۆیە منیش هەر دەمێنم!

*

بەهەشت. سڵاو، تۆ پیرۆزی
چونکە تۆ جێگەی بارزانیت
تۆ بەشەهیدی ئێمەی کورد ئاوەدانیت!
پێ دەزانیت؟
ئەی بازرانی! تۆ، وەتەنە بۆ مەفتوونەکەی بێکەسیت
هەڵۆی دیوانی گۆرانیت
تۆ پێناسەی خەونی خۆشی هەژارانی کوردستانیت!

*

هۆ... کوردستان، کەی بانگ دەدەی
بێم بۆ جەژنی ئاوەدانیت؟
شیعر بکەم بەشاباشی ئەو شاییبە و
ببمە کاکە مەمی خانیت!
لە میحرابی بارزانیدا نوێژ دابەستم
بەرماڵەکەم گۆمی وان بێ،
ئاگرەکەی باوەگوڕگوڕ هەتوانی گلی چاوان بێ!
کوردایەتی بۆ هەموومان، ماڵە گەورەکەی باوان بێ
شکۆداربێ یادی نەمران
ئازادی بۆ ئازادی خوا و هەژارانی کوردستان بێ!
ئازادی بۆ ئازادی خوا و بەشمەینەتی کوردستان بێ.
تقدیسم بۆ بارزانی بێ و خۆشەویستیم بۆ (بارزان) بێ.

***



## بۆ تەقدیسی بارزانی چەپکە شیعرێکم هانی(*)

١٩٩٣/٨/١٦

مـــیـــدادی فـــرمـــێـــسکـمـــە و بەخـەم گـــرتـوومـــەتەوە
ئاگـــری ئەم خـــولـیـــایە هەر خـــۆم کـــردوومـــەتەوە
شـۆڕە سوارەکـەی ئەیلوول، پێـشڕەوی کـاروانی خـەم
سـیـحـری وشـەی پـیـرۆز و گـیـانی هەزاران قـەڵەم
نەدابەزیت نەمـــردیت، لەســـەر تەخـــتی خـــولوودی
تۆ پێـشـەوای ئەم گەلەی، هاودەمی شێخ مـحـمـودی
ئەوە حـــیـــزبت گـــەورەیە، کـــاکـــە مـــەســـعـــود ڕابەرە
ئەوە جـــامـــانەی ســـوورت دروشـــمـــە و تـاجی ســـەرە
من دەروێشی ڕێگەتم، نەزەرگـــەمـــە، مـــەزارت
شـــیـــعـــر دەکـــەم بەڕەنگێ لەســـەر تـابلۆی نیـگـارت
تۆ نەمـــردووی، تـۆ مـــاوی، تۆ نووری هەردوو چاوی
تـۆ شـــــــایـانی درووود و هـەزار ســـــــڵاوی

***

## پێشەکییەکی لەنوێ

١٩٩٣/٩/٦

من ئەندێشەی خۆمم دەدواند
باڵی وەکوو باڵی سیمرخ کرایەوە
وتم بۆ کوێ؟...
ئەی نازانی ئەوا دەرفەتێ ڕەخساوە
ئەوا هەلێک وەکوو ئاڵای ئازادیمان هەڵکراوە
کوردگەل جەمن، ئاهەنگ گەرمە
بارساییەکی خۆشەویست لەسەر سەرمە
ئەویش سێبەری هومایە
چۆن سێبەرێ! بەقەد پانتایی دنیایە!

(*) ئەم شیعرە لە کۆنگرەی (١١)ی پارتی دیموکراتی کوردستاندا لە هۆڵی زەرد لەشاری هەولێر ١٩٩٣/٨/١٧ خوێنرایەوە.

لەسەر «طوور»ی کوردستانم، ئاگرێکم لێوە دیارە
ڕووی لێ دەکەم، چراوگی دەهێنمەوە
ئێوە لێرە چاوەڕوان بن
بەشێک لە ئەندێشە و ژان بن
ئەوە «طوور»ەو ئەوەش ئاگر
وا من دەڕۆم
وا من خەمی گەورە دەخۆم
نایشارمەوە گوڵهاوێژێک ڕێگە مابوو بگەمە لای
وتیان لێرەدا بوەستە، با نەسووتێی
ئەوە نووری بارزانییە
شیعریش خەرمانەی خۆبەتی و دیاریی (بەردەشانی)یە
وتم حەللاجی سەردەمم... من ناسووتێم
ئەو سەرچاوەی ڕاستیمانە و جۆگەیێکم لەوێوە دێم
کە ئەو نوورە، منیش شاری ئاوەدانم
کە ئایەتە، منیش تەجویدی قورئانم!
کە ئەو هزرە، منیش هەموو ناوەکانی،
خۆشەویستیی ئەو دەزانم!
سەلامێکم لێوە هێنا... پەیامێ بوو
کڵپە و گڕی زامێکی قووڵ، چ زامێ بوو؟!
لەو ڕۆژەوە کوردایەتی خەونی کوردە
هەڵگیرساوە
گەرداو هێزی کوژانەوەیی تێدا نەما
لەبەر پێیدا کەوت بە دەما
ئەسپەشێکەی بوو، نووچی دا و دانەبەزی
سوار هەر سوارە
هەزار ئاگریان نایەوە
داربەڕووشمان وەک خۆی دارە
نەورۆزیشمان پیرە جەژنی هەرزەکارە!
ئێوەش وەرن گوێ ڕاگرن...
شاری شیعرم شڵەژاوە



سایەی هومای بارزانییە، بەسەرماندا هەڵدراوە!
بۆ ئەم یادە، ئەم ئاهەنگە
من داستانێکم داناوە
با (سامری) هەر فوو بکاتە گۆلکەکەی
ئەوە قەبەسی بارزانی لە بیلبیلەی گیانیشماندا هەڵکراوە!

***

## بەردە نوێژ

١٩٩٣/١٠/١١

لە زریانی ئەندێشەما وا سێ ڕۆژە خامەم لەناو گەردەلوولا
گێژاوی خەم لە خۆی دەگرێ
چاوم گەرداو دەبارێنێ
گەرووم هەنسک دەیخنکێنێ، نازانێ چۆن بناڵێنێ
خوایە فرمێسک، خوایە گریان
خوایە کەمێ هێوری کەی نرکەی زریان
شێ سوارەکەی بارزانمانە وا دێتەوە
دوور وڵات بوو
جگەر گۆشەی بارزانییە وا دێتەوە، دوور وڵات بوو
ئەمڕۆ لەشاری دڵمدا کارەسات بوو، مەرگەسات بوو
خوایە فرمێسک، خوایە گریان
با خۆم نەمبە خودی زریان!
نەقەڵەمم لا بمێنێ، نەپەیڤێ بێ بەدەنگمەوە
نەپەترۆییێک یەخەی زامێکم بەردەدا و
نەدەنگ دەکرێت بەزەنگمەوە
ئەمڕۆ ئەگەر من قەندیل و زەردە و شاهۆ و حەساڕۆست بم
دەشکێمەوە بەسەر خۆما
وەک گۆمی شین لەناو چۆما
بەردەنوێژی گوێ چەمان بم
سەلاواتی سەر لێوان بم
نوێژ دەکەم و نوێژم لەسەر دادەبەستن

ئەوە تەرمی بارزانییە دوور وڵات بوو
خۆر فرمێسکی چاوی لێڵی ڕۆژهەڵات بوو!
من و گەردوون، من و ئەندێشە و فرمێسک و خامەی خەمین
من و ئازار و ئەمەک و سۆزی برین
بووین بەهەورەکەی مەعدومی و دەبارینە سەرە ڕێگای
ئەو کاروانەی کەژاوەکەی بارزانییان لەکۆڵ نابوو
لە پێش دەمیا هەزاران یاد بۆ ڕێزی ئەو خۆی لادابوو
خوا... بۆ منی نەکرد بەخاک: خاکی گوندەکەی بارزان بم
وەکوو دەروونی تەبایی، ئەمڕۆ منیش ئاوەدان بم
هیچ نەبوایە با تەرمەکەی بارزانییان لەسەر دڵم دابنایە
دەبووم بەدارێکی گەورە... خۆشەویستی ئەم سێ ڕۆژەم
دەخستە ژێر باڵی سایە... وەک ئاڵایە
هەتا شیعرم پێ بمایە هەتا دڵم لێی بدایە
هەر نەم دەهێشت ناتەبایی بەگوزەریا بهاتایە

***

## بۆ چلەی ماتەمی پیرۆزیاد حەمە صالح ژاژڵەیی

١٩٩٢/٨/٢٦

لەسەر مەزرای بارزانیمان دەستە و نەزەر تاوێ وەستام
شووشەی زارم پڕ لە گوڵاوی سەلام بوو
بەسەر گڵکۆیدا پرژانم
وتم گەورەم. بەستەی ڕێزت کەس نزانت ئەز دزانم
ئەز لە سێبەری –زەردە–دا کە گەورە بووم
هەوەڵ هەنگاوی هزرم بوو...
ناوتم لەناو دڵما دانا
جامانەی تۆم وەک گۆچانی ئەحمەد پاشا و وەک خەنجەری شێخی نەمر کرد بەشانا
کە ڕێم کەوتە چواردەڕێیان تۆ هەر تۆ بووی
بۆ ڕێبواری شەوی نوتک، هەسارە بووی لە ئاسمانا
ئێستەش کە گیرفانی چۆلم، ڕۆژی چەندجار
دەست و پەنجەم ڕوو زەرد دەکا کە دەگەڕێم بەدوای نانا
تۆ هەر تۆیت و منیش لێرە واقم ورە
دەوروبەر ژاژی کێشەیە، هۆشم سڕە



لەیارانی مەهابادت، دوێنێ گیانی حەمە صاڵح
لەگەڵ گیانم ئاشنا بوو
سەری لەسەر لاوانەی خەم، بەبێ لاوانە دانابوو
وتم کاکی کوردپەروەرم، ئا بڕوانە شوێنت چۆڵە
لە دەفتەری مێژووماندا، دەوروبەرت هەمووی خۆڵە
لەوێ کورد و کوردایەتی، بوو بەئینجیل و ئایەتی
بەشەکەتی ملی ڕێگەی خۆی گرتووە و کۆڵ بەکۆڵە
کاکی برام ژاژڵەیی–
دەست لێ شتێ وا خەریکە ئەبێ بە درم بە پەتا
دەتوو یادی پێشەوامان دەتوو یادی بارزانیمان، تیشکێ بخەنە سەر خەتا
کاکی برام ژاژڵەیی ئەمڕۆت لە گشت ڕۆژێ خۆشتر
تۆش وەرەوە زەنگی خەتەر ڕاوەشێنە
بۆ سەبونی ڕێی گەرمیانت ئەشک و شیعرم باوەشێنە
سبەی دەستی بێ پاروومان کە بەعزی کرد لەگەڵ دەما
سبەی سەرما ڕێگەی گرت و گوڕمان نەما
ئەگەر ڕۆژ بوو ئەوا بەڕۆژ، ئەگەر شەو بوو وا لەشەوا
تۆفی لەعنەتت هەڵبکە بۆ سەدام و ئال و بەیتی
بۆ بۆرجوای چاوچنۆک و هەرچی هەیتی
بۆ قاچاخچی گوللە نەبڕ جنێو نەبڕ
بۆ گیرفانی خاڵیی ئێمە و بۆ گیرفانی زۆر قەبە و پڕ
بۆ دروشمی چاوپۆشیمان
بۆ ئەندێشەی بێ بەرهەم و بۆ سروودی بێ هۆشیمان
بۆ تەبایی سەردەم و لێو
بۆ ناکۆکی تا کرۆکی ئەم چەم و چەم ئەم کێو و کێو
پشکۆیێکی ئەم فرمێسکەم بکە بەدەستە چیلەیەک
با ئەسپەکەی ئێوەی نەمر بیخاتە ڕازی حیلەیەک
بەشکو ئیتر شێ سوارەکان بێن بەخەوا
هەتاکو خۆر نەخنکاوە لەناو لیتەی خەستی خەوا
یادت پیرۆز، هەر پیرۆزە یادی ئێوە
بەڕێنمایی ئێوەیە کە مێژوومان وا بەپێوە

***

## دەستم

١٩٨٨/١/٢٨

بەدەستمم وت: بۆچی هەرچەند
خامەیەکت پێ هەڵدەگرم...
دێیتە لەرزین؟
دێڕ و وشە بەسەریەکدا دەڕووخێنی،
ئەوەی کە هۆش و ئەندێشە پێت دەسپێرن
کەس تێ ناگات چۆنیان دێنی و چۆنیان دەبەی
دەربڕینیش خۆی نازانێ،
چۆن لە مەعنا و کەڵکی دەخەی؟!
وتی: یاشێخ... ئادەی فەرموو...
لە جێی خۆت تۆزێ بەم لاوە
چاوکە، چاوکە. چی دەبینی،
هەروا دەستە و بێ پەنجەیە
هەر پەنجەیە وا قرتاوە!

***

## ئەو... ئەوان

١٩٨٩/٤/١٥

وتم: هەی داد... ئاخاوتنت هەر کاوێژی
بەرماوەیە
ئەو ساکە، تۆ، چێشتەنگاوان برسیت دەبوو
وام دەزانی فریشتەیت و بۆ ڕەزای خوا
سک دەبەستی
وام دەزانی لە تەک ئەوا لە خەڵوەدای بێ دەربەستی
هەر وشەیەک لە لێوتەوە هەڵدەخزا...
شیرین بوو وەک کولۆی قەند بوو
بەمانا بوو دەوڵەمەند بوو
ئەگەر چڵکی یەخەم دەدیت، دەموت دەس پاکە، هەژارە
تێ دەکۆشێ، دنیای ناوێت.
ئەم مرۆڤە لەوانەیە: فریشتەی ڕێی ئازادین و



گیان دەبەخشن لەم ڕێیەدا
سەرسام مەبن. قودسییەتی ئا بەو پلەو
بەو جێیەدا!
کەچی هەی داد... چی ڕووی داوە
وا پێ و دانی خۆت گۆڕیوە؟
وەک مرۆڤێ زۆر ڕەوایە تێر و پڕ بی
مێردی ژن و بابی بەبەی کچ و کوڕ بی
پاشەڵ پیس نیت بۆ پێشەڵی خۆت پیس دەکەی؟
چی ڕووی داوە؟!
چاو دامەخە سەرە بەرزەکەی جارانتم
لەبەر چاوە
وتی: ئەو بووکی خەیاڵەی پێتم ناساند
تۆ نازانی چەند عەیارە!
(شیرین) ئەمڕۆ باوەڕ نییە
خەزنەیێکە پڕ لە پارە
- (ئەگەر وایە... بێ پێم بڵێ: بۆ بەهاشەی
دەم و پلت منت کێشایە بن باڵی؟!)
- سۆزانییە... منیش وەکو داوێن پیسێ
چوومە پاڵی،
دەس ماچ نەکەم دەستم دەبێ بەمشکێکی
وشک هەڵاتووی بنی گیرفانێکی خاڵی!
کە تێم ڕوانی، هەر بەزمان لە کورد دەچوو
بەم لەعنەتە منیش ئەوەم لێ داماڵی.

***

## جێم کەرەوە

١٩٨٩/٤/٢٥

لانەوازم، بەدوای خانەخوێدا وێڵم
وا خەریکە وەڕس دەبم. با ئەم شارە جێ نەهێڵم
درەنگ وەختە، شار خامۆشە، جێم کەرەوە
هەر هیچ نەبێ لەبەر سەری ئازیزانت

مەڵێ بڕۆ، لێم بەرەوە – جێم کەرەوە

*

تەماشاکە وا هەناسەم ئاو دامانی باڵای تۆیە
لێت ئاڵاوە
تەماشاکە هەر شیعر و من
لووتەلایی ئێوەی نازار بەڕووماندا هەڵکاڵاوە
هەر هیچ نەبێ لەبەر سەری ئازیزانت
درەنگ وەختە. جێم کەرەوە
ستەم دیدەی ڕێی عەشقی تۆم
وەڵامێکی نوێم بەرەوە – جێم کەرەوە

*

ئازیز تۆ دەنگ... هەزار سەلام
وەکوو حەلاج بەتەما بووم لە خەڵوەخانەی
ئازارما...
کە تۆ وەکوو حەق بێیتە لام
تۆ نەهاتی وا من هاتم
من گلەییم من شکاتم
ئەم بەردەرگەیە بەر نادەم
هەتا نەگەم بەئاواتم
درەنگ وەختە لەبەر سەری ئازیزانت
جێم کەرەوە... بیرم ناچێ
تۆ خۆت وتت ئەگەر هاتی
پێشکەشت بێ ڕیزە ماچێ!

***

## تەنها شۆخ

١٩٨٩/٦/٢٠

تەنها شۆخێ دۆستی منە و بێ ئاگایە...
دەروونی من چۆن دەکوڵێ و چیشی تیایە؟!
وەکوو بۆنی گوڵی ئاڵ و شنەی شەماڵ
نامەی دڵم بەرەو لای ئەو ئەدات لە باڵ



من دەفتەری پیشانگەم و دانراوم
بۆ پێشوازی ئیمزایەکی ڕاخراوم
مەزرایەکم شەتڵی ئەوین دەکەم بەدار
دێوانەم و سۆزی خوایی دەدەم بەشار
بەهەوێنی ئەوینی ئەو، من مەییوم
هەر بۆ ئەوە نەخشی دەستی کەس نەدیوم
سۆز و نزام هەتا ئێستە بێ وەڵامە
بانگم کپە و عەلەیکیشم بێ سەلامە
ئەی هاوارە... ئەم عیشقەی من چەندێ پاکە
وەکوو عیشقە زگماکەکەی گەل و خاکە
ئەوا دەچین خۆم و بەستە و خەمەکانم
بۆ، لای وایە ئەم ڕێگەیە پێ نازانم؟!
وەکوو ڕشێنە -ئەی شنە- ئاوڕشێنی...
پرچت دەکەم بەڵکو لە خەو هەڵیسێنی
خۆ من ئەگەر هەزارساڵیش بێ تەمەنم
بەم عیشقەوە هەر ئەم نەیەی بۆ دەژەنم
تەمەن کورتە و مەرگیش داڵە لە سەرمانە
دەردی منیش وا دەردێکە بێ، دەرمانە
لە خەو هەڵسێ و مەیلی گۆشەی چاوی جوانی...
بەم نزایە کرایەوە و بۆمی ڕوانی
دەبمە دڵۆپێ ئاونگ و لەسەر لێوی
بەدی دەکەم باخ و بەرەی شەکرە سێوی
لە شەپۆلی قژی خاوا، نامەکانم
دەکەم بەشایەتی ڕەنگی زامەکانم

***

## گۆرانیی چیا

١٩٨٩/٦/٢٣

هاتیت، بەڵام کاتێ کە من پەرێشانم
لەگەڵ دەردی عیشقی خۆما ئاوێزانم

ئەفرۆزانە و چاوی بەختم وا لە خەوا
خەو دەبینم، کەوتوومە سەر باڵی هەوا
بەخەو نەبێ بە بالآتا چۆن سەرکەوم؟
کێ بەرکێیە بەرەو لای تۆ چۆن بەرکەوم؟
ڕێگە هەمووی کەند و کۆسپە خەم دەبارێ
کوا نمەیەک لێوی تەڕکا، لێو بەبارێ؟
کاتێک چیا پێدەشتی خۆی دەلاوێنێ
لە دوندەوە نەورۆزی بۆ دەبارێنێ
من پایزمە، بۆ سەر پەڵە چاوەڕوانم
با، دابکات بارانەکەت چیای جوانم
ئەگەر خۆشیی لە گۆناتا بۆم بخوێنێ
دەڵێم عاشق بەئازاری گوڵ دەسێنێ

***

## تان و پۆ

١٩٨٩/٦/٢٧

کە تۆ هاتی شەفەق گوڵی لێ دەباری
گوڵەکانیش بوون بەدەفتەر
شیعری جوانیان تیا نووسرابوو
شیعرەکانیش هەریەکەیان ئاوازی خۆی لێدرابوو
ئاوازەکان، بەسەر لێوی شنەباوە، خۆرهەلآتیان
خستە سەما.
خۆرهەلآتیش بۆ خۆرنشین ماچێکی نارد،
خۆرنشینیش وا مەستێ بوو
بوو بەجێگەی خەون و تەما
ئەو ساتە من ماوەی نێوان خۆرنشین و خۆرهەلآت بووم
جەستەم هەمووی خودی تۆ بوو
بۆ چنینی بەهاری ئەم عیشقە جوانە
تۆ بووی بەتان، گیانم پۆ بوو
لەو دیو دنیای ئێمە شەوە...
شینی نەیار: باوکەڕۆ بوو

***



## شیعرێکی سادە

١٩٨٩/٧/٧

من شیعرێکم بۆ نووسیویت
نە کاکەمەم بۆ خاتوو زین
نە فەرهادیش بۆ شیرین و
دەروێش وەلیش بۆ شەمی خۆی نەناردووە
حافظ، کەی تاڵیی وا خۆشی بەجامی خۆی سپاردووە؟!
خەییام گری وەها تەری لە ناخی خۆی بەرنەداوە
بەلقیس گوڵی وا حەو ڕەنگی لەبەر یەخە و سەر نەداوە
لەژێر کاچی شاخ و دوندی ئەم خاکەدا...
کانییەکی وەها ڕوون و وەها سازگار
قەت بۆ تریفەی مانگەشەو...
سەرپۆشی خۆی لانەداوە
چۆپی کێشی هیچ ئاهەنگێ
دەستەسری وەها چەرمووی بۆ یاری خۆی بانەداوە
شیعرەکەیشم زۆر سادەیە
پلووسکی سەر قەڵبەزانە و گەردنی شووشەی بادەیە
هەر تۆ جوانیت وەک ئازادی...
تۆ بەیانی ڕوو لە شاری
کە ئازادی بوو بەوەرزم، هەر تۆ گوڵی نەوبەهاری

***

لەسەر ڕەوتی سوارچاکانی شیعری کوردی

## عاشق بەزام دەژی

١٩٨٩/٧/١٢

کە منت کرد بەنیشانە، ئاگات لێ بوو چۆنت پێکام
وەکوو مەلێکی باڵ شکاو ئازیزەکەم لە پۆل جێمام
لەسەر ڕێدا بووم بەقۆناغ بۆ تۆماری چیرۆکی خەم
دەستی خۆیان ڕاگرتبوو بۆ بەزەییت هیوا و هێمام

کاتێ عاشق بەزام بژی دەبێ نەریت هەروەها بێ
ئۆخەی یارم میهرەبانە، بۆیە تیری وەهای لێدام
کاروانی خەم ڕوو دەکاتە ناخی دڵ و جێ نەماوە
لە گشت جێگەی ئەم دونیادا بۆ نەگبەتی من بێ جێگام
دەستت خۆشبێ شۆخە کچی نیشان شکێن سەد ئافەرین
نێچیرت چەندە پێکابێ بەچاوی تۆ منیش وێڕام
ئێستە کەوانەت گرتووە، دەسرێژێ تر بەتیلەی چاو...(١)
بابێ، لەشم دابێژێ من نامەوێ لەشی بێ زام
بۆ قەتارەی سۆزی ئەوین هەمووی دەکەم بە هێلانە
داوای زێدەم نەکردووە، تیری یەکەم، قەولت پێدام
دە، بێرەوە بەسەریانا، ئەگەر زامی سارێژت دی
بیکولێنەوە، من بۆچیمە زامی بێ سۆز، زامی بێ تام؟!

***

## بۆ دانای نەمر و مامۆستا... شێخ محەمەدی خاڵ

١٩٨٩/٧/٢٠

قوربانی ناوت، ناوت چ خۆشە
پەیامی بیرە و زادە لە کۆشە

من بۆ مەولەوی قافیەم شێوا
بۆ تۆی بەهرەوەر وا قورم پێوا
کاتێ لەم ناوە خوڵخوڵەی ڕۆم بوو
من خوا خەم نەدا هەر خەمی تۆم بوو
تۆ دانای مەزن من بابی خەمان
یەکی خستووین ستەمی زەمان
خەمی من ئەمڕۆ خەمی سەر جەمە
سەرچاوەی وێڵی وەرای سەرچەمە
فرمێسک دەڕێژم قوربان لە پاتا
لەکاتی کات و ناکاتی و کاتا

(١) کەوانە: لای سەروو



کۆچی بەهرەوەر چون کارەساتە
تاریکستانی هات و نەهاتە
ئەم شێخە گەورەی من بۆی پەشێوم
هەمیشە ناوی وا لەسەر لێوم...
ڕابەری ڕێگەی خامە و خەیاڵە
بەچامە و هەڵبەست وەسفی مەحاڵە
لەم کوردە هەر کەس خامەی گرتە دەس
قەرزاری ئەوە و هەرهی ئەوە و بەس

قوربانی قەرزی دەست و خامەکەی
قوربانی دێڕ و پەڕە و نامەکەی
یاشێخ، مامۆستا، تۆ لە قورئانا
پشکت بۆ وشەی ئەم کوردە دانا
کێ لە ألحمد و لەو قولوەڵلایە...
مەعنای وەردەگرت تۆ نەبوویتایە؟!
لە بیرمە ئەوسا هەر لە پەناوە
داوی تەنویریان بۆ تۆ دەناوە
گوایا تۆ دەستت داوە لە کەلام
-کەلامی خودا قەت نایێتە فام-!
دەیانوت تەواو، وا خوم شێواوە
مەعنای قورئانت بەکوردی داوە.

قوربانی تۆ بن هەزار لەوانە
چ لە دامێن و چ لە کەوانە
قامەتی بەرزت گەورە شارێ بوو
بۆن و بەرامەت نەوبەهارێ بوو
خامەت پەیامی بەهرە و هونەر بوو
خامەم لە ڕووتا دەستە و نەزەر بوو
هیمەتت پایەی شێخ و پیران بوو
مەجلیست یانەی ڕۆشنبیران بوو
ئەی ڕۆژی هەینی... کوا ئێوارانت

شێخم کۆچی کرد، کوێرە باوانت؟
ئەمەک لە حەوزی مزگەوتی خاڵ بێ
دەبێ لە دوای تۆ گۆمی بەتاڵ بێ
فەرهەنگی خاڵە دەریای بێ پەیە
شانازیی کوردە فەرهەنگی هەیە
بێ لۆمە خەڵکە من دەس وە ئەژنۆم
دەگاتە گەردوون گریانی ئەز، نۆم
گەر پیری پیران لەو مامە یارە
مەرگی تۆی دەدی و ئەم کۆچ و بارە
زاری شیرینی شۆڕی دەباران
کەیکەم ئێستەکەم بۆ گوند و شاران
تەپڵی سوارانی لە خاکی خەمدا
بەرەو لای خودا دەدا وەهەمدا

قوربانی یادت، یادت بێ خەوشە
ئارەقت گوڵاو بۆنت وەنەوشە
تروسکەی دیدەم بەو چاکە ماوە
کە زادی بیرم لەو چاکە ماوە
پرزە بڕاو نیم هی وا هیوامە
لە کۆڕی عیشقا جامە و پەیامە
ئەی وەجاخەکەی گەورە مەلامان
نوطقی مەنطقی خاوەن کەلامان
تۆ ئەم بەهارە لە زەردەپەڕا
کە تەمی مەینەت لە زەردەگەڕا
فەرموو بباریێ بەم سەرخاکەدا
نووری نبووەت لەم جێ پاکەدا

قوربانی ڕێگە و سەفەری دوورت
قدوومی بەخێر قەدەمی نوورت
بەرەو شێخ عومەر، حاشیەی بێ ناز
بەرەو جێشانە بەرەو ڕێی هەوراز



بۆ لای مەولانا و شامی مەحشەری
بەرەو لای حاجی و خەون و سەفەری
بەرەو غەریبی نوقمی خاک و خۆڵ
بەرەو مەولەوی و سەر مەزاری چۆڵ
ها ئەشکی منیش وەک نمەی باران
ئاوڕشێنی کات سەوزەکەی یاران
وەختێ دەپرسن قوطبی وەتەدی،
کێ خەونی ئێمەی هێناوەتە دی؟
بڵێ: بفەرموون ئێوە و خاک و خۆڵ
بڵێ: بفەرموون ئەوەش بار و کۆڵ
مەولانا لە شام بوو بەخەبەرێ
(نالی)مان بوو بە نامەی سەفەرێ!

قوربانی خۆت و دەروێش و شەمت
قوربانی هەموو یارانی خەمت
ئەی محمدی أحمد بەهاوناو
دوانەی چەمکێ بوون وەکوو بەهاوناو
هەموو عومری خۆی سێبەری تۆ بوو
تۆ ڕابەر و ئەو ڕێبەری تۆ بوو
چەند موقەدەس بووی لای ئەو برایە
ئەگەر وەکوو مۆم بۆت هەڵکرایە...
هەر لە حوزوورتا لەناو بۆ خۆی دەسووتا
وەک عاشق لەناو بۆتەی لاهووتا
کە جامی مەرگت نا بەزارەوە،
خەتمی خاتیمەت نا بەشارەوە،
ئەویش دوا بەدوات بەو ئارامەوە
قومی خۆی هەڵدا هەر لەو جامەوە
ئەوە سۆزی من تینی گریانم
ئەوەش کەف و کوڵ دڵەی بریانم
لەگەڵ فرمێسکا دەبنە بەرامە
گوڵاو پرژێنی خاکت مەرامە

***

## باوەشی شوان

١٩٨٩/٨/١٩

خۆ تۆ لە من هەڵکەنراوی
بۆیە ئەمێستاکە دوانین
دەخیلتان بم موتوربەم کەن بەو باڵاوە
ئەمە خوایە ببینەوە بەیەک کەس و
ئیتر نەبینەوە بەدوان
ئەو سەردەستێ نانی گەرم و
منیش باوەشی ڕەنجی شوان

***

## نیۆنی پووز

١٩٨٩/٨/١٩

پێڵاوسڕ، نیم... کە پێت دەگەم
لە پێتەوە چاوم پیاتا هەڵدەگەڕێ
هێشتا وێنەی هەردوو پێتم لە نیگاری
ئەندێشەما وەکوو خۆی جوان نەکێشاوە
نیۆنی پووزی بێ گنت، لە شینایی سەرابێکا
نوقم دەبن
ئیتر منیش سوجدە دەبەم بۆ ڕازی جوانی و
چاوی ژن.

***

## سەمماعە

١٩٨٩/٨/٢٠

سەمماعەت خستە سەر دڵم
وام دەزانی پۆلە کۆترێ هاتن لەوێ بای باڵ بدەن
کە پەنجەت خستە سەر نەبزم
وام دەزانی زەلیلم و ڕێگەی عیشقم نیشان دەدەی



لقەکانم هەمووی بکە بەهێلانە بۆ کۆترەکان
پەلکێشم کە بۆ کوێ دەڕۆی
ئەگەر لە خۆیشم بپرسی وا حەز دەکەم
هەردوو دەستت وەکوو دوو سوار
بەرەو تا سوقم تاو بدەی
پریشکی حەز هەموو گیانت شەڵاڵ بکات
وەکوو بڵێی لە ئاو بدەی

***

## ڕووبار

دوو ڕووباری شێت و وێتن مەمکەکانت
بەسینەتا وەکوو تاڤگە هاژەیان دێ
کە دەگەنە سەر نەرمایی پێستی سکت
دەبنە دڵۆپێ یاقووت و ڕادەوەستن
خۆشیان نایێ لە کرداری ڕێگەبەستن
وردە وردە وەکوو دەنووکی نێرەکەو
قوت دەبنەوە و قاسپە قاسپێ دەست پێ دەکەن
جام تێ دەکەن
بەناو چاوی بیماراندا دێن و دەچن و ڕێ دەکەن
داوای دەستی دڵدار دەکەن
داوای دەمی بەبەی جوان و نازار دەکەن
داوای تیشکی سوخمە دڕی ئەشعار دەکەن
بۆیە منیش لە سێبەرتا
کێشی هەموو شیعرەکانم دەبێ بکەم بەکەمەرتا

***

## جوانووی چاو

١٩٨٩/٩/١

من دەزانم شۆڕەسواری خەونی چاو و خەونی دڵ و
ئارەزووت نیم،
من شاعیرم پەیڤ و دەنگم

بانگی بەیانیم و زەنگم
ڕێی مۆبەدی چاوەکانتم
بۆنی بەهەشتی باخەڵتم
مەولوودنامەی ڕۆژی جەژنی مەولوودی تۆم
بۆ دیباردەی کازیوەی تۆ. ئەنجام و هۆم
دڵی ماندووم چاوەڕوانی شنەیەکی چاوەکانتە
دڵی گۆشە داکوتراوم چاوەڕوانی پەنجەی نازە
خۆت دەزانیت ئەم جیهانە...
گوڵۆڵەیەکە و یەک ڕازە
گەوهەری تاکی ئەم نەزمە
تۆی ئافرەتی تۆی نازداری
لە بەختی باشی دەردەکەم تۆ نۆژداری
شەو ڕۆچووبوو
بەیان وەکوو خەندەی ساوا لە ئاسۆدا تریقاوە
لەسەر بەرماڵی دەردەکەم، بەرەو گۆیژە چووم بەچۆکا
پزیشکەکەم... نەخۆشێکی یاخیبوو نیم،
شاعیرێکم چاوەڕوانیت لە ناخەوە ڕای وەشانم
جوانووی چاوە شێتەکانت...
کەوتوونەتە ناو قەرسیلی باڵا پیاوی، تازە ئاوەنیای ئیمانم.

***

## ئاواتێک

١٩٨٩/١١/١٥

ئاواتە... ڕۆژێک هەموو دەروو دەشتی
نیشتمانت تەی کردایە. بەدوای مندا
هەتا بمکەی بەنیشانە و تیلەی چاوانتم تێگریت
لە من زیاتر کەسێکی کەت بەلایەقی ئەم وازییە
نەزانیایە
پەیکی ئەوین خەبەرێکی وەها گەرمی
لە ناوەختا بهێنایە:



– بەگەردنی چیای بەرزی سیپانەوە دارەبەنێک
لقێکی خۆی بۆ کردووە بەجۆلانە...
ئەو هەڵدێرا، چونکە ویستی دەستی بۆ خوای ئەوینی
خۆی بەرز کاتەوە
پاداشتی سۆزی عەشقی تۆی بداتەوە!–
وتیان... بۆچی تۆ دەتەوێت بڵندتر بی لە یاری خۆت؟!
وتیان... بۆچی تۆ دەتەوێت نامەی عیشقت،
بدرکێنی بەزاری خۆت؟!
وتیان بۆچی خەون و خەمت دەبڕیتەوە لە شاری خۆت؟!!

***

## شەخس

پیرەمەگروونی سەر سپیم
وا، باوەشم کردۆتەوە بۆ هەر جوانێ بێتە سەرم
نیازی دڵی خۆی باس بکا
داوای کلیلی نهێنیی ڕێگەی ئەوین و ڕاز بکا
* هۆ جوانەکان بێنە سەرم
بەسۆزی دڵ تینێ بدەن بەهەناوم
کڕیۆەیە، تا، ئاوی ڕەش نەهاتووە
شەوقێ بۆ سەر دەم و چاوم
هۆ جوانەکان... گری گری چاوشارکێیە
دنیا ئەمڕۆ چاو شارکێیە... بمدۆزنەوە
تا، سەری شار هەڵتان دەگرم
من خۆزگەی خۆم خەملاندووە
ئێوەم گەیاندە سەری شار، ئەوسا دەمرم
* هۆ جوانەکان... (نۆما) زین کەن، بدەنە تاو
غار غارێنە
ئاسمان دەتۆیش سکناییبیەک
ئیتر شەختە مەبارێنە
با، هەموویان بێنە سەرم، سەرگرانم

نەکوو لە ناکاو ڕێگرێ
وەرزی شوومی ڕێ برانم
* پیرە مەگروونی سەر سپیم، شەخسی ئێوەم
هۆ جوانەکان بێنە سەرم
وا مەزانن من شارێکی بێ گوزەرم
کووچەکانم پڕکەنەوە... دەی هەرایە
خەیاڵێکی ئێجگار سەیرم لەسەرایە
خۆ من ڕووت نیم، تۆپێ کاڵای شیعر و بەستەم لەبەرایە
* هۆ جوانەکان بێنە سەرم
وەکوو کتێب مەتاڵام کەن...
توێشووی سەفەر بکەنەوە،
چاو دامەخەن شەرمی ناوێ
گۆشەی نەزەر بکەنەوە
بێنە سەرم، لەلام حەیفە هەتا ئەمڕۆش
دیلی کۆتی گریمانن
ئەگەر نەیێن، باوەڕ بکەن، پەشیمانم، پەشیمانن!

***

## پایزی من

۱۹۹۰/۲/۵

پایز، پایز... وەرزی خەزان
خەم هێنەری لە خەم نەزان
دەی بیهاوە شەستی پەڵەت
بەردەوام بێ ڕەوتی هەڵەت
پایز... پایز
پایز، پایز... ئەی هاوین کوژ
ئەی کۆچەرێی دژوار و دژ
وا خەم ماڵی دڵ خۆش دەکا
لە زەردەپەڕ پڕ کۆش دەکا
زستانی پێ دەباتەسەر
لە خەڵوەدا نەیێتە دەر



پایز... پایز
پایز، پایز... ڕەنگ زەرد و ڕووت
ئێوارانی درەنگ و زووت
کەوتوونەتە باری کێشە
دڵم پڕ کەن لە ئەندێشە
لەگەڵ قەرسی سارد و سڕا
خای خەمی من هەر زوو دڕا
ئێستە کۆڵێت نییە و شارە
هەر پایزە و بێ بەهارە
پایز... پایز
پایز، پایز لافاوی خەم
پێچی ڕێگەی دەرد و ستەم
لە دەردی من کارت نییە
لالەپەتەی زارت نییە
ئەینا بۆ سوێی ئەم دڵەی من؟
بۆچی تینی ئەم کڵەی من؟
ئەدەیتە بەر سەرما و سۆڵە؟
وا دەزانیت شارم چۆڵە؟!
پایز... پایز
پایز، پایز... وەرزی هەتیو
وڵیای ناوەختی خێر نەدیو
بۆ هاتیەوە ئەی ڕێگە شووم؟
قەلاچۆکەی گشت ئارەزووم؟
بە با و باران سەرکوتم کەی؟
بە،کاهینی بێ بتم کەی؟
بمخنکێنی لەم چامەدا؟
ببمە سەهۆڵ لەم جامەدا؟
کەس نەیبیستێت سۆزی ناڵەم؟
نەزانن من ئەم بێ حاڵەم؟
ترسم وا لە ڕچینی خەم
کوشندەیە و دەگاتە چەم

پایز...پایز
پایز، پایز... وەرزی ڕچین
لە داخی تۆش دەبێ بژین
ژیان کۆڵە و هەواری هەس
مەرگیش باکی نییە لە کەس
دەژین، دەمرین... ئەمە ڕێیە
ئاوی حەیات کوا لە کوێیە؟
من پەیڤێکم با لە دڵێ
فرمێسکێکم با لە گوڵێ
وەکوو جاویدان نامرم
توانام هەیە تۆش ڕاگرم
پایز... پایز
پایز، پایز... ئەی دڕژومۆن
خێوی ناوەخت ئەی ڕقی کۆن
بەستەی خەمم کەوتە سەر زار
لە ئێستەوە پلار پلار
دێتە وێزەت بەتین و تاو
دڕنت پێ دەدەن ناو بەناو
چونکە خەمیش خۆری دەوێ
هاودەم و هاو جۆری دەوێ
درەختی خەم دارەوەنە
هێشووی شیعری پێوەبەنە
پایز... پایز
پایز، یاری ئەم تەمەنەم
ئەی سەرباری ئەم پێچە نەم
کە زیندانم بێ دەرگەبێ
دەروونیشم چەمەرگەبێ
مەکەن دڵم لە گۆ مەخەن
بۆ مارەیی خەجی دەبەن
پایز... پایز

***





١٩٩٠/٢/١٩

## کورتە شیعرەکان

**١- کولوە بەفر:**

کولوە بەفرێ...
وەکوو پەپوولەی باڵ شکاو هاتەخوارێ
وتم خوایە با قورس نەبێ...
کولووی تری لێ نەبارێ
خێرا دەستم بۆ گرتەوە... حەیفە بگاتە سەر عەردی
ئەی عەردەکە، توێژاڵێکت خۆڵ و قوڕە،
لە دوای ئەوە تاشە بەردی!.

**٢- کۆتەرە:**

ڕووبارێکی توندوتیژی سەر بەرەوخوار
لرفەی دەهات
کۆتەرەیەک بەسەریەوە...
نەیدەزانی بۆ کوێی دەبات!
گێژاوێ ویستی لوولی دات، هاواری کرد
بۆ دارستانی بەرنەوە، هەر دارێ مرد.

**٣- نۆبەرە:**

درەختێکی تازە بەرم کەوتە بەرچاو
لەخۆم پرسی، دەشێ دەستێکی بۆ بەرم
بۆ نۆبەرە دەنکێکی لێ بکەمەوە؟!
هەموو ڕۆژێ لە باخەڵما بۆنی بکەم بەخەمەوە؟
- ئەگەر ناخت هاتە کوڵ و وتی ئادەی حەڵاڵت بێ؟-
حەزە پرسیاری دەروونە،
چۆن وەڵامی نەدەمەوە؟!

**٤- قەڵەمی شەل:**

هەرچەند ئەندێشەم سەردەکا...
قەڵەم دەگرم بەدەستەوە

هەرچی پەیڤی ڕێک و پێکە دەیانهێنم
تا بیان کەم بەداوی کرژی هەستەوە
ترسێ دەروونم تەی دەکا، هۆشم دەخاتە پێ مەلە
وەختێ بەخۆما دێمەوە...
خەیاڵ خاوە و قەڵەم شەلە.

**٥- چاوی شار**

باران، باران، بۆ دەبارێ؟
بۆ خۆش ناکا، دێتە خوارێ؟!
مزمەعیل بێ چاوی شارێ،
نەبارانی پەڵە و چلە و نەبای بەهێزی داراوس
دەیهەژێنێ
کەچی گڤەی ڕەشەبایەک، تۆزێ چەوریی بەسەراکا
خامۆش دەبێ و دەیخەوێنێ!

**٦- نەریت**

نەریت وایە، تۆ -ڕۆڵە- بی و منیش -مامە-
لەگەڵ هەموو -مامە- یەکتا...
نەوسم لە نوێ دەکولێتەوە
کۆنەزامە!
چی ڕوودەدا، ئەگەر نەریت لەژێر پێما
دابێنم و بەرز بمەوە؟
دەمم بگاتە خاڵانت
دەستم بگاتە باخەکەی ژێر باڵانت
لە باڵاتا خۆم نوقوم کەم، بچمە ناو ڕۆژ و ساڵانت!؟

**٧- یاغنیش**

بەشەوم وت: چاو لێک مەنێ
ئەمشەو دەڵێن شەوی قەدرە
ئەستێرەی لەیل و مەجنوونیش دەگەن بەیەک
پۆل پۆل فریشتەی باڵ چەرموو دەنیشنەوە
لەگوێ ڕووبار و سەرچاوە،



ئاسمان گەرای ڕامووسانی لەسەر لێوی عەردی دەنێ
وتی: من هەر بەخەبەرم، جێ ژوانی دڵدارانم
وتم: کەواتە یاغنیشم، بێ خەبەرم، هیچ نازانم

**٨- هەتوان**

بەیانی دا، هەڵسام لە خەو
دەرگام داخست لە قەپی شەو
بەکارواندا بەرەو ئاسۆ هەڵزنام و
شیعرێ بەری ئەم ژانە بوو
دەستم شکێ نە لە ئامێزی خۆم گرت و
نە، نامم نا!
نە، وەک، هەتوانی مێو و ڕۆن لە زامم نا!
نە، وەک، چێژێ لەبەرکولێ، لە زارم نا

***

## پشکۆ

١٩٩٠/٢/٢٢

لە شوێن خەرمانی ئاگرما...
پشکۆیەکی خۆڵ لێ نیشتوو، تومەز ماوە!
-چۆن وا دەڵێم، ئای کە خەیاڵی من خاوە؟!-
دوێنێ کە باسی ڕۆژانی ئەوینی من کەوتە سەر زار،
پشکۆی ئارام گەشایەوە
سەری کوانووی ژیلەی عیشقی جارێکی کە هەڵدایەوە!
سوێندم بەگیانی عاشقان...
زارم بوو بەزامی -وەلی-
زامم بوو بەزامی -عەلی-
داوام بوو بەداوای -مەنسوور-
سۆزم بوو بەسۆزی گەرمی -مەلا خدر-
لە شامەوە بۆ شارەزوور
گەلی برا... ئەمە عیشقە
کوانووی عیشقیش هەر ڕۆ دەچێ،

ئەم زامە نابرژێتەوە.
ئەسپی سەرکەشی داستانێ،
کتێبێ نایبەستێتەوە!

***

## خۆم و سکاڵام

تەماشای رووم بکەن دیارە کە جێ کوانووی خەم و دەردە
دڵێم بەستەیەک بچڕم هەمووی هەر داد و گریان بێ
درنج ڕێگەی مەلی شیعرم، نەوای سۆزم بدە و بەردە
چلۆن نابم بەسەرمۆرێ کە ناخم گێژی زریان بێ؟

*

ئەگەر بەهرەم بەسەربەستیی نەیاران، باخی لێ گوم بێ،
دەبێ کێ بەزمی ئازارم لەبەربێژێ لەتەک مندا؟
لەناو خەڵکێکی بێ چاودا، غەریبم من تەمای چم بێ،
لە من چۆن تێدەگەن کاسن، لە شیعری بێ سەروبندا؟

*

بەیان هەڵکەم بەئاسمانا و زەوی دەسباتە گرکانێ
سەدام وەک سۆزی -ئەزغەز- بێ، ڕەفیقان بانگ بکەم -طاهر-
هەوام هەوڵێکی بێ سوودە، وەکوو چووبێتمە زڕکانێ
لە دەورم نائومێدیمە سکاڵای خۆم دەکەم ئاخیر

*

دەبێ چ بکەم لە ڕۆژگارێ منی پێچایە ئەم توونە
نەشەو جەستەم دەسوکنێنێ، نە ڕۆژم سایەقە و خۆرە
حەبیبەم خەونی گیراوە و مەلای ئاوارە بێ نوونە
کە شیعرێکیش لە ناخ بگرم، سبەی بارێکی ناجۆرە

*

گلم، بۆ تۆ و دەشێم، لێکین... لەسەر تاتێکە ڕێژراوم
لەبەر لوورەی دەمی با، دام، ڕەهێڵەم لێ دەبارێنێ
دەپرسم بۆ؟... دەڵێن گوایا لە زاریانا نەکێشراوم!
گەلێ، گەل بێ، هومای عیزەت لە شاعیر بۆ دەتارێنێ

*



ئەوەندەم خەم لە کۆڵ ناوە، خەمان بێ کۆڵ و بێ لانەن
بەکێ من خۆم بناسێنم لە کوێ ڕێ دەربکەم چاکە؟
هەموو ڕێکان بەرەو هەڵدێر دەچن، ئەو ڕۆکەبێ -بانەن-
لە خۆم ئای و لە خۆم لێ لێ، لە شیعر و خەم حەسیب ڕاکە

*

مەڵێن دووریت، بڵێم چی من بەجێگەم ئاشنا نابم
سەلیقەی من دەشێ بخزێ، کە ڕەنجم بێ بەرامبەر بێ.
پەتایە ئەم هەموو لەرزە، بەنووشتەی کێ دەبێ چابم؟
خودا بۆچی لە ئاقارما هەموو دەردێ سەرانسەر بێ؟!

*

ئەوەندەش ئاسنی ساردم کوتا دەستم شل و خاوە
دەترسم بێ هیوایی وەک شەپۆلی شووم لە زاخم نێ
هەموو ڕێ ڕێی خەم و داخە سپاردی بەم دەم و چاوە
دەکێ -گۆران-ە من -ئەولا-م، شەلاڵی خۆی لە باخم نێ.

***

## عیشق و باوەڕ

نەوازش کەی، لێم بپرسیت...
هەرچیم لە دەروون گرتووە، دەی درکێنم
کە ناخیشم گڕی تێچوو...
بەئاگری ماچی لێوت من تینوێتی خۆم دەشکێنم
تۆ خۆت بت و بتخانەمی
تۆ خۆت مەی و مەیخانەمی
تۆ خۆت تاقانە و نۆسکەی ئەم پێچەن و ئەم ژانەمی
ئەگەر دنیام لێ هەڵبسێ،
تەشەر بارانی سەرم کەن...
ئازیزەکەم بلاوابێ...
خۆ، تۆ شەئنی ئەم شانەمی
کفرانی عیشق کەی ڕەوایە؟
وا تۆ چرای پرشنگداری ئەم پەیام و ئیمانەمی

له جیهانی عیشق و خەما بەزۆر بمکەن بەلانەواز
کەس ناتوانێ ئەو باوەڕەم لێ بسێنێ...
کە تۆ، هەر تۆ، هێلانەمی

***

## نان و ماست

١٩٩٠/٥/١٩

لووتەلایی لە تۆ نایەت
من نیشانەم بەشانتەوە
شکستەی تازە جوبرانە
دڵم، بۆچی شکانتەوە
لەگیانمدا توایتەوە
وەکوو شەراب و ئاوی ڕوون
من لە تۆدا بەدی دەکەم
مەعنای ژیان بوون و نەبوون
تۆ لەگیانی من باریوی
وەکوو ئاونگ لەسەر گوڵێ
بۆیە هەرچی جوانیی هەیە
لەدڵمەوە هەڵدەقوڵێ
تۆ ئەو مەیەی موغی موغان
نەزری گیانی منی کردووی
تۆ ئەو نان و ماستەی شوانە
بۆ خواوەندی عیشقی بردووی[(١)]
ماچێکی ئەو لێوە ئاڵەت
مافی خۆمە، بلێ: هانێ
کێ مەی لە من حەرام دەکا
دەپێم بلێ، کێ دەتوانێ؟!

(١) تێبینی: نان و ماست چیرۆکە هۆنراوەیەکە لە دێر زەمانەوە بۆ دەرسی منالآن دانرابوو، باس باسی شوانێکی سادە و هەژارە بەسادەیی عاشقی خوا دەبێ، بڕیار دەدا زیافەتێ بۆ خوا بکات، نان و ماستێک لەسەر کانییەک دادەنێ بۆ خوا، دەڵێن خەوی لێ دەکەوێ لەخەویا خوا دێتە لایی و زیافەتەکەی قبووڵ دەکا کە وەختی بەخەبەر دێ دەبینێ نان و ماستەکە خوراوە.





هانێ دڵم، هانێ گوڵم
هانێ بەستە و ها گۆرانیم
کێشی ڕەزمی لەنجەولارت
کەس نەیزانی هەر من زانیم

***

## بۆ ئەکتەری جوان تریفەخان

١٩٩٠/٥/٢٣

وتیان... مانگە و تریفەی دێ، لەسەر شارە
وتم، نەخێر... وەرزی نوێیە، نۆ بەهارە
ئەی ئەکتەری بەهرەمەندی دنیای هونەر
فەرموو ئەوە ناخی منە، شەقامە ڕێگە إعجابە
نەوازشکە بێرە گوزەر، خەمت لابە
ئێمەی خەڵکی شانۆی دڵم، بۆ پێشوازیت ڕاوەستاوین
لە جیاتی چاوێ هەریەکەو بۆگرتنی وێنەی جوانت
هەزار چاوین
تریفەت بێ لەناو شەوی ئەندێشەما
خەم و پەژارە ڕامالە
چاوەکانت هەڵڕفێنە بەرەو چاوم
بەچاوی تۆ هەتا ئێستەش هەر لانکەیەکی نەشکاوم
لەژێر باڵی پێڵووەکانما دەتکەمە خەو
شەو دەدەمە دەستی ڕۆژ و
ڕۆژیش دەدەمە دەمی شەو
گوڵی هەموو شیعرەکانم دەدەم لە باڵا و پەرچەمت
دەیکەم بەبەستەی شادمانی
دەنک دەنک نوقڵی دەمت.
تۆ تریفەی شارەکەمی بەهرەوەری
تۆ مەپرسە جێگەت کوێیە... تاجی سەری

***

## بۆ چریکە و سۆز و پەیام و پەیمان خان

١٩٩٠/٧/٣

پەیمان... ئەی تۆ سۆزی شەماڵ،
ناڵەی نەی و سروەی بەیان،
جریوەی مەل،
چپەی گەردوون قاقای مناڵ،
خورەی کانی و لایە لایە و قەتار نەبووی؟
ئەی تۆ کسپەی ناخی گەرم و سوێ نشینی
هەژار نەبووی؟
لە ئینجانەی دڵی مندا، ئەی تۆ خوشکی نیگار نەبووی؟
ئەی تۆ پەڵەی پایزانی بەستە و سۆز و ئەشعار نەبووی؟
ئەی توخوا تۆ پەیامبەری کزەی جەرگی بیمار نەبووی؟
ئەی کە ئاگر بەرەو رووی تۆ هەڵی کوتا
دەروونی گەل هەڵقرچێنێ لەناو زاما
بۆ خوا نەیوت... ئاگرە سوورە...
(کونی برداً و سلاما)؟
خوا نەخواستە، ئەگەر دەنگی پڕ لە سۆزی جامی مەنگی
تۆ نەمایە
دەبوو هەموو شاعیرەکان، دەبوو هەموو عاشقەکان
سەریان لە قوڕ بگرتایە.
چەپکە گوڵی باخی هونەر!
دەبا ڕێکەوت خەجاڵەت بێ و نەفرەت بکەین لە ڕووی قەدەر
دەبێ بووکی هەموو سۆز و ئاوازەکان
لە ئاهەنگیساڵانەیدا بتدا لەسەر
چاوەڕێتم ئەی فریشتە... وەکوو نەوا، وەکوو پەیام
چرای دڵم هەڵکەیتەوە
شیعرم ئێستە دیوانەیە
بەڵکو دڵی بدەیتەوە
ئەو دایکە بیت تۆ سبەینێ –ئەحە– و –ئەزغەر– بخەیتەوە(١)

***

(١) ئەحە– ئەحەی ناسر. ئەزغەر– سید علی أصغری کوردستانی.



## کاسە و قەدەح ١٩٩٠/٧/٣

وتیان: یاشێخ ویسکی دەکاتە کاسەوە
کاجیرەیان هەڵئاوسا بوو...
هێندە پێچران بەم باسەوە!
وتم: یاران، من بەشیری بزنە کۆڵێ گۆش کراوم
بۆ دەرمانی هەوەڵ گلی چاوەکانم
شیری مەڕیان کردە چاوم
هەر ئەو ڕۆژەی من لەمەمک بڕامەوە
لە سێبەری داربەڕوودا نان و دۆم خوارد
کاسە و کەوچک دەفرمان بوون
بەڕێزینە ئێوە وتتان دۆترش مەخۆ
کاسە لادە و قەدەح بێنە،
ویسکی بنێ بەسەرەوە
ئەو گرێیەی زۆر کوێرەیە، بەئاسانی بیکەرەوە
کوا قەدەحتان، کوانێ ویسکی
گرێ کوێرە کەڵەکە بوون
کاسەلێسی هەندەرانن، تیکەی قەپی تەڵەکە بوون
بەڕێزینە، هێندەتان وت: فری، فری
خێر نەبینن وەکوو نان و دۆی ئێمەتان وەها بری!

***

## دایە دایە

١٩٩٠/٨/٧

١– دایە، دایە... بۆ من مەگری
ئەگەر ڕۆژێ لە چیاوە،
چنگێ خۆڵیان بۆ هێنایت و
زانیت خوێنی حەمەی خۆتی پیاڕژاوە.
٢– دایە، دایە... ئەگەر ڕۆژێک هۆش و گۆشت
لە چیا بوو؟

بۆ من مەگری، چەخماخەیەک هەوری بڕی و
تاوە بارانێک دایکرد و، بۆنی گیانی منی تیابوو
٣- دایە، دایە، ئەگەر ڕۆژێک ڕووبارێک هات
لە چیاوە
بۆ من مەگری، سەری منی لەسەرا بوو
خوێنی منی لەبەرا بوو
٤- دایە دایە ئەگەر ڕۆژێ لە چیاوە
هاوسەنگەرێ پێ دزکێی کرد بۆ خوارەوە
بۆ تۆ دەگریم، بتدا بەدەم نەیارەوە.

***

لە ١٩٩٠/٦/٢٨دا شێخ جمالی ئامۆزام بەنەخۆشییەکی کوشندە (شێرپەنجەی خوێن) لە خەستەخانەی *(مدینة الطب) لە بەغدا بۆ دوایین جار چاوی لێک ناو* ئەم شیوەنەش لە ناخمدا گڕی سەند...

١٩٩٠/٧/٢٧

کێ بینیویە خەرمانی گوڵ زەرد هەڵگەڕێ و
هێشتا پایز بەری دوور بێ؟!
کێ بینیویە چامەی غوربەت بنووسرێت و
قەڵەم ڕەوی بەبەیش هێشتا شارەزوور بێ؟
کێ بینیویە ڕێبواری وەک کاکە جەمال
کۆڵ دابنێ و هێشتا هەنگاو لە گوڕابێ؟
کێ بینیویە درەختی وا شۆخ و بەهێز،
داهێژانی لە پڕابێ؟
مردن بارێکی گرانە و هەڵگرتنی ئاسان نییە
بەڵێ مەسیح خاچی خۆی نا بەشانەوە
بەڵام گیانی دا بەخووا
کاکە مەمیش مردن ڕۆحی هەڵدەمژی و
عیشقێ لەجێپیدا ڕووا
شێخ جەمالیش نۆ مانگ لەگەڵ مەرگی خۆیدا
دەستەویەخە ڕاوەستا بوو
گیانی نەدا بەدەستەوە، هەتا خوێنی لە دەستا بوو!
هۆ ئامۆزا... کاکی عەبدول، شەوم شینە ڕۆژم خەمە
گریان ئەمڕۆ داد نابەخشێ





وام دەزانی بەزەلزەلەی قیامەتیش لە دوای کەژاڵ
خۆڕاگرتن لە ناخمدا بۆی نالەخشێ
وا مردنی ناوەختی تۆ وەک ئاو ماڵک ڕادەماڵێ
لەم کەنارە بۆ ئەو کەنار
دەمخاتەوە ناو گێژاوی ئەشک و خەمی کەژە و بەهار
کەشتیم دەمەونخوون دەبێ
دەریام گەردەلوول و شێتە
خۆزگەی منیش لەم تۆفەدا وەکوو -ژینا-
هەموو چاشتێ چاوەڕێتە
هەموو ساتێ چاوەڕێتە.

***

## گوڵە سوورە

١٩٩٠/٨/٧

گوڵێکی سووری ئەم کوردستانە
کە لەسەر گڵکۆی شاعیر ڕووابێ
بەپەیڤی کوردی، وەکوو مەولەوی
لەگەڵ جوانیدا بەدڵ دووابێ،
ئەیدەم لە پرچی یارە جوانەکەم
وەکوو کازیوە دەم بکاتەوە
ئەوسا دەبینن ئەم دڵە شێتەم
سڵاوی یاران چۆن دەداتەوە؟!
ئەگەر پەیامی لێوی یاری خۆم
وەکوو پەپوولە با لە شەقەی باڵ
بنیشێتەوە بەسەر لێومەوە
دەبم بەساوا و دێمە گڕ و گاڵ
وەکوو گۆی مەمان دەیگرم بەدەم
دەبا بەشی وا زۆر و سادەبێ
دەبمە دەروێشی پیری موغانیش
زاری شەکر بار جام و بادەبێ

پایزی عومریش ڕێم لێ ناگرێ
هەمیشە وەرزی تازە بەهارم
بەستەم بەرامەی نێرگزە جارە
ڕشێنەی دەدات لە زوڵفی یارم
خاڵ و ڕوو لە تۆ، تاسووقیش لە من
با، یادی جاران بەسەرکەینەوە
بەتینی عەشق و سۆزی دەروونمان
هەزار مەم و زین خەبەر کەینەوە

***

لەسەر ڕەوتی سوارچاکانی شیعری کوردی

## بەهای شیعر

١٩٩٠/٩/١٥

کە من شیعرێکم بۆ وتی وا نەزانیت کەم بەهایە
تۆ خۆت قورسی و گران بەها هەزار شیعرت پێ ڕەوایە
بۆیە وەکوو وێنەگرێ گرتوومیتە بازنەی چاوم
چونکە سەرچاوەی پەیامم لەتۆوە دێ و لەتۆ دایە
لە دڵمەوە هەڵدەقوڵێ وەسفی نیگای دوورهاوێژت
بێ مننەتە هەر عاشقێ، قەرزی یاری خۆی لەلایە
نمەی بارانی نازی تۆ ئاوڕشێنی هەستم بکا
گەنمە بەهارەی هیوای من قەف و گوڵە و لەسەرایە
تەنها خەندەی لێوەکانت کەروێشکەی ئەو بەهارەیە
دڵۆپێکی بەرم کەوێ ئیتر سەرم بێ سەوایە
بەلاگەردانی سەرت بێ هەزار شیعری بالانەمام
دەروێشێکی کەمەن کێشم، لێرە و لەوێ و لە هەر لایە
کە ئەندێشەم شەیدا دەبێ، ڕوو لە ئاستانەی تۆ دەکات
ڕوونە لەلام نەخشی دەستم پەتک نییە و لە هەودایە
با، ئایەتی کۆڵمەکانت بەسەر باڵی فریشتەوە
بنیشنەوە لەسەر لێوم. ئاینی وا لە دڵمایە
بۆ ماچێکت هەزار نوێژم بەدەست نوێژێ بۆ نەکردی...



کوشتنی من چی پێ دەچێ؟، بێ یەک و دوو کەچ نیگایە
دەبا ژیان نوێنێک بێ و هەردووکمانی لە تویدابین
وەکوو من و تۆ هیچ کەسێ وا هاوسەرینیی لێ نایە!
هۆ ئەم دنیا بەشایەت بن کە دوو دڵدار لە نوێنێکا
شەو بدەنە دەمەو بەیان، دەبوو مردن هەر نەمایە
وەرە دەستت لەگەردن کەم، دەڵێن دنیا پێنج و دووە
نوقمی شەلاڵی حەز ببین، عەشق بەهرە و بەشی خوایە
من بەشەرابی تۆ مەستم، شەرابی من بخۆرەوە
کڵی دەروون هێدی دەکات، بەزم و ڕەزمی ئەم هەوایە
وار و یاری خۆم خۆش دەوێ، یەکەی بوونمان حەللاجییە
کوردە عاشق شایانیەتی، گەوهەری وا هەر لەوایە
ئەفراندنێ لە عەشقم دا وەکوو ئاسۆ دەکرێتەوە
شیعرم زاوای پەردەی سوورە، بووکێ چاوی لەخەوایە.

***

## بەهرەی خوایی

١٩٩٠/١١/٩

کوڕ– بەهرەی خوایی ئەی کیژۆڵە
لەسەر پەنجەم بنیشەوە
لە هۆشمدا ئۆقرە بگرە
لە ناخمدا هێلانەیەک بۆ خۆت خۆشکە
بەسەرمەوە وەکوو بازی بەخت و نگین ببیت بەتاج
ئاواز دەدەم بەدەنگەکان
باوەڕەکان بتەو دەکەم
شیعری هەموو شاعیرەکان دەبن بەخاوەنی ڕەواج
من شاعیری گڵکۆی تازەم...
بەهرەی خوایی! ئەی کیژۆڵە گوێ ڕاگرە بۆ ئەم ڕازەم
هۆ جوان، هۆ جوان، گیانی ڕەوان
کچ– هۆ سوار، هۆ سوار، هۆ بەهرەدار
گەر مەجنونی منیش لەیلم

گەر فەرهادی من شیرینی دەروون کەیلم
کاکە مەمیت خاتو زینم
ئەگەر وەلیت من شەمەکەی بێ نگینم
هۆ سوار، هۆ سوار
لەسەر پشتی ئەسپی قابیل وەرە خوارێ
وا سەرەتای وەرزی عەشقە،
سەرپەڵەیە گوڵ دەبارێ
با لێمان دات ئەم بارانە
چاری دەردی هەزارانە
هۆ سوار، هۆ سوار
هۆ بەهرەدار
کوڕ وکچ- ئێمە لەیەک گەیشتوویین
ئەی بۆ وا دوور ڕۆیشتوویین؟!
ئێمە وەکوو مەی و ئاوین
ئێمە وەکوو نیگاو چاوین
ئێمە وەکوو کەس و ناوین
ئێمە وەکوو ئاسۆ و خۆرین
ئێمە دوانێکی یەک جۆرین
ئێمە کورد و کوردستانین
وەک ئازادی و سەربەستانین
وەکوو جام و سەرمەستانین
کوڕ- هۆ جوان، هۆ جوان... بەهرەی خوایی
کچ- هۆ سوار، هۆ سوار، کوا یەک لایی؟
کوڕ- هۆ کیژۆڵە بەهرەی خوایی
بێنە دەستت هانێ دەستم
وا نەزانیت من بێ هەستم!
من درەختم، گەڵا و گوڵێت
من دەروونم، کەف و کوڵێت
دەتناسم و من دەناسیت
بۆ وەک چیا، چیایەکی ئێجگار عاسیت؟



کچ- تۆ خۆت ڕێگەی باخ و بەرەی...
ئەم ئاینەت ڕواندووە
تۆ خۆت خارت لەم ڕێگەدا وەها بەزۆری چاندووە
ئەوە دەستم ڕێ خۆش بکەین
ئەوە لێوم، باشەرابی چپە ماچی یەک نۆش بکەین
بۆ چنینی گوڵە زەردی ئەم باخەمان
بەرکۆش بکەین، پڕ کۆش بکەین
هەموو جوانێ بەئایەتی ئەم پەیامە
با، لە نوێوە وا گۆش بکەین
هۆ سوار، هۆ سوار
کوڕ- هۆ جوان، هۆ جوانی بەهرەدار
کوڕ و کچ- بێرە دڵم، دێمە دڵت
ببە بەدار، دەبمە چڵت
ببە بەنوێن، من ئارامم
ببە بەمەی، منیش جامم
تۆ هەتوانی و منیش زامم
هەر هەردووکمان ڕازی بوونین،
نازت کوانێ!
نێچیر عەشقە باز هەڵبدە،
بازت کوانێ!؟
هۆ سوار، هۆ سوار!
هۆ جوان، هۆ جوان!

***

## دوو کۆچ و دوو کۆچیاری مەزن

کۆچ هەر کۆچە؟!
کۆچێک تەنها هەر هاتنە و ڕۆیشتنە
کۆچێک هیچ جێ نەهێشتنە
کۆچێک دەردە،
کۆچێک بەردە

کۆچێک تەنها هەر شوێن دەستی ڕێکەوتێکە
کوتوپڕە جگەر بڕە لە تیر دەچێ
کە کۆچ، کۆچی أبو علی و کاکە، مان بێ(١)
لەناو کۆچاندا ڕەشپۆشە
گڕکانێکە کەس وا نەزانێ خامۆشە!
قەڵەم وا تاسەی تاساوی لە دەمایە
شیعر سەری لە قوڕایە
ئەفراندنیش بۆ کۆچی وا سەد پێوەندی لە گوڕایە
بۆ کێ بگریم؟... رشدی عامل، کاکەی فەلاح
ئاگر لە کوێوە هەڵبکەم؟
ئاگر لەکوێی خۆم بەربدەم؟
قوڕی دامێنی کام سەوزە، لەجیاتی گوڵ لەسەر بدەم؟
ئەویان دۆستێ، ئەم برایە
هەرچەند دەکەم، چاوی هەنسکم هەڵنایە
شیعری فرمێسک، بۆ ئەم کۆچانە توێشووە
کۆچی وەها هەتا فرمێسک لە چاوابێ، بیرنەچووە
ئەو عەرەب و ئەمیان کورد بوو
قەڵەمیان پاک بیریان ورد بوو
لە منداڵدانی ژیاندا، دوانەیەک بوون
لەناو سیفری تێکۆشاندا وانەیەک بوون
مردن حەقیقەت
حەقێکی زۆر ئێسک گران
تۆ ئەو ڕەوای لەتەک توخمی ناڕەوادا وەکوو بران
ئەوەی سەبووریم پێ دەدا لەم ساتەدا
نەوایەکە ئێجگار خۆشە
دەگاتە ناخ
لە ناخمدا دەبێ بەباخ
هەزار قاروونی نەوتین و کولاە لەسەر
دەژین نیشانەی لەعنەتن،
دەڕۆن وەک چشی ڕاگوزەر

(١) أبو علي: رشدي العامل، کاکە، کاکەی فەلاحی شاعیر



بەڵام شیعرێک دەبێ بەگیانی شاعیر و هەر بەنازە
هەر چامەیەک بۆ خۆی گەنجینەی سەد ڕازە
نەمر رشدی، نەمر کاکە
بۆ سەرباری ئەم کۆچەیان، لەمنەوە فرمێسک چاکە

***

## بۆ نیشتمان

لەو ڕوومەتە خڕینانەت سوکە گازێکم دەست کەوێ
نەفسم وەکوو مەستی بادە، شەو و ڕۆژێک لێی دەخەوێ
هۆ نیشتمانی هەڵکەوتوو، هۆ (کاوڕە) مێی پێدەشت و شاخ
بۆ هەڵبڕینی دروشمت، خۆم دەبمە داری بەیاخ
مژێک لەو لێوە پڕەی تۆ، نەشئەییێکی وام دەداتێ
تامی بەهەشت، حۆری و غلیمان، هیچ کام لەمانەی نەگاتێ

***

## مانگە شەوی باڵا

١٩٩٠/٢/٢٢

لە مانگە شەوی باڵاتا، تاڤگەی تریفەی پەخشانت، بەسەر لەشما بێتە خوارێ
لەمنەوە شیعر و هۆرە، بەسەر مەزاری عاشقاندا، وەک ڕەهێڵە دادەبارێ
دەشبم بەسەرچاوەی پەیام، بۆ هەزاران مەم و وەلی
دەبم بەهەتوانی فێنک، بۆ زامی وەک زامی عەلی
هۆ وەلییەکان، هۆ مەمەکان هۆ ئەندێشەی ناو خەمەکان
دەزانن ئاو چەند شەیدا بوو بگاتە سەر لێوی حسێن؟
شمشێرێکی ژەنگاوی بوو ڕێگەی لێ گرت
لە کەربەلای خەم و خوێنا، جەللادێک هات بێ بیسمیللا دەمی تێ خست
دەردی ڕەشپۆشیی خستەوە
بنەوانەی ئەشکی سووری لە مێژوودا هەڵبەستەوە
منیش ئەوینم زامدار و لێو بەبارە،
کێیەو بۆچی ڕێگە نادات لێوێ تەڕکەم؟
تەپڵی ئاپۆرای لەشکرم، بگاتە گوێی ئاسمانەکان

بۆنی نزای چاوەڕوانم بەباڵی خۆی
بگاتە سەر لێوی گڕی هەموو زامە پیزانەکان
هەڵاڵەی نوێی ئەم بەهاری ژان و شیعرەم، بێ خەم بگاتە شانەکان!
بەختی منە. لەناو شیعرا جەللاد هەیە
لە چیرۆکا جاسوس هەیە لە پەخشاندا سەگوەڕ هەیە
لەوەعزیشا فەرمایشی گوێ کەڕ هەیە!
بۆچ هەر حسێن لەناو سارای تینوێتیا
سەراب بگاتە نیشانی؟
بۆچ هەر یەزید لەسەر تەخت و لەناو بەختا خۆی بابدا؟
وەختێ گەدەیشی دەگیرێت بەکەوچکی شەرع و یاسا خۆی ڕابدا؟
بەدەمی فەتوای چەواشە نووکی ڕم و نووکی قەڵەمی دابدا!؟
لە پەناوە بەگومڕایی هەزار تەشەر لە خوابدا
چەقۆیەکیان لە زامێکم دەربهێنم، تیرۆریزمم
ئەگەر بڵێم من مرۆڤم، سنوور و شەرع و یاسایان کێچ تێی دەدا
ڕۆژی هەزار عاشق بکوژن، بەبێ پاساویش حەڵاڵە
گەر یەکێکیان ڕابچڵەکێ، دەمکەن بەدوژمنی خودا
دوام دەکەون بەناتۆرەی جودا جودا
هۆ دوژمنان هۆ دۆستانم
ئەوە کوردم و ڕاستییە
عەشقم بەڵێنی خودایە بۆ ئازادی و بۆ ئاشتییە
بۆ چاو ڕەشەکەی مەولەوی و حەبیبەی بەختی نالییە!

***

## بەبۆنەی کردنەوەی زانکۆی سلێمانییەوە

٩٤/١٢/٢٣

ئەگەر دەبووم بەهەورەکەی ئەو معدومەی کە دەیناسین
ئالێرەدا بێ یەک و دوو دەستم دەکرد بەدابارین
بەسەر ئەم گوڵە زەردەدا
بەسەر ئەم خاک و بەردەدا
بەسەر ئێوەی بەڕێزاندا
لەگەڵ هەوای ئاوێزاندا



ئەوەی چرایێک هەڵدەکا ئەو ئازایە،
ئەوی بانەیێک دەکێڵێ ئەو پاشایە،
ئەوی ئازادی کوردستان نادا بەنان
بێ هاوتایە،
ئەوەی بەسەرما خۆی دەگرێ و ڕوو ناکاتە هەوای بەغدا
خۆی پۆلایە
ئەوەی بەگیرفانی پڕی دەڵێ: ئادەی بکرێرەوە
منداڵی خۆیشی هان دەدا سنووقەکەی لێرە ڕۆکات
خۆشەویستی زاتی خوایە
ئەوەی قسەی حەقیش ناکات، ڕستی تانجیی لە ملدایە
هۆ قیبلەکەم زانکۆی نوێمان، خەونی خۆشمان
چاوگەی ڕوونی بیر و هۆشمان
من ئەو ڕۆژەم هەر لەبیرە، فاشستەکان، دایتیان بەکۆڵی گەڕۆکا
شارە و شار بوو
ساڵێکی کوێر، بێ بەهار بوو
بەدەن لەگیانی بێزار بوو
من بەدواتا فرمێسکم ڕشت
هەزار شیعری جوان و ڕێکم لە قووڵایی ئەندێشەما
بە ئاهێ کوشت
دەم و دڵم قۆچەقانیی تف و لەعنەت و نەفرەت بوون
دەم هاوێشتن بۆ ئەوانگەل
وەک بای ئەجەل
وەک پێشبینیی پەتای ئەجەل!
زانکۆکەمان! کە فاشییەکان، تۆیان هەڵکردە سەر دەستیان وەک گلۆڵە
ڕووم کردە ئەم خاک و خۆڵە،
وتم منیش وەکوو نالی ئەوا ڕێگەی کۆچێ دەگرم
ئەم شوێنە لام هەر پیرۆزە هەتا دەمرم
بەبادەکەی خۆش مروورا نامەی دڵمی بۆ دەنێرم
بانگیش بەدواتا هەڵدەدەم تا ئەو ڕادەی کە دەوێرم
زانکۆکەمان! کە تۆیان خستە سەرپشتی کینە و تۆڵە
هاتمە سەر ئەم خاک و خۆڵە

وەکوو خاڵۆی کۆماسیمان، شیعری گڵکۆم بۆ نەنووسیت
چونکە وتم هەر دێیتەوە
سەرچۆپی کێشی شاییەکەی هاتنەوەتم، بابمێنم
ئەمجارەیان نۆرەی منە، بەردی بناغەت بچێنم
زانکۆکەمان! کە تۆیان خستە ناو ئەنفال
چی فەرهەنگی جنێو هەبوو، هەمووم هانی
وەک شێخ ڕەزای تاڵەبانی
عەرش و قورشی داگیرکەرم دایە بەرجوێن
هەنگاو هەنگاو تۆ هاتیەوە، سەر چاوانمان
ئەی بووکەکەی نوێ باوانمان...
تۆ دیاریی ڕاپەڕینی پیرۆزمانی
ئەم بەهارە جێ ئاهەنگی نەورۆزمانی
بەدیارتەوە شیعرەکانم وەکوو بولبولی خۆشخوانن
تۆ، بەقیبلەی خۆ، دەزانن
نوخشەی حوکمی فیدراڵیت و
تاڤگەی خوڕی ئازادیت و بەهای خوێنی شەهیدانی
کەدەستیان دایە باڵی تۆ، کێ نەیتوانی؟
پەیکی مژدەت دا بەشارا، کێ نەیزانی؟...
گیرفان پڕی مایەپووچ بوون، ئاشن بەبێ ئاوەدانی.
زانکۆکەمان! ببە بەچاوگەی زانیاری
تۆ ئەمجارە نۆ بەهاری
ڕۆڵەکانمان لە ئامێز نێ و بەبیری نوێ گۆشیان بکە
بەبرێشکەی وشەی کوردی پڕی چاک و کۆشیان بکە
با خنجەرمان بەجامی تۆ ئاو بدەین و لە کێلاندا نەی خەوێنین
پۆلە مەلێک لەم کێڵگەدا کەوتە چینە، نەی تەرێنین
من لە ئاوی دامێننتەوە جۆگەی مۆبەد ڕادەهێنم
سکاڵای گەل لە نەزانین تەنها لای ئێوە دەشکێنم
من لەمڕۆوە بەیانیان ناشتا بەدیدارت دەکەم
هەر لێرەدا کە ماندووبووم کۆڵ و باری خەمم دەخەم
هۆ زانکۆکەم، هۆ خەونی خۆش، هاتیتەوە سەرچاوانم
وا تەلیسمیان دەکرێتەوە بوهتی دڵ و باری شانم





من ئاودێری باخی شیعری کوردستانم
کە ماندوو بووم، ماڵە گەورەکەی باوانم!
هاتیتەوە سەرچاوانم!
لە جێی نەوت و بەرگ و نانم
ئەی هەنگوینی نێوی شانی
هەنگەژاڵی دەرد و ژانم
هاتیتەوە سەرچاوانم

***

## ڕاپۆرت

١٩٩١/١١/١٣

من بینیمن، هەردووکتان بوون
دانیشتبوون، پێدەکەنین، ئاسمان لێڵ بوو
برین بەقەد جێگە دەمی پاچ و بێڵ بوو!.
پەڵەی ڕەشی هەوری وێڵ بوو
من بینیمن، هەردووکتان بوون
دەمەتەقێ و پێکەنین بوو
شەقام چەک بوو، شار چەک بەدەست
سەربان، سەنگەر
بنمیچ، خنجەر.
من بینیمن، هەردووکتان بوون... پێدەکەنین.
خامەی دەستتان ئیمزاکانی کۆن و نوێتانی خوێندەوە
بیکەیسی دەیکوژاندەوە
ئاڕیپجی سایەی سەرتانی لەسەرتانا دەشکاندەوە
من بینیمن، هەردووکتان بوون، پێدەکەنین
لە ئێستەوە بۆ نەورۆزی دوو هەزارتان
سروودی نوێتان دانابوو.
دووکەڵ ڕێگەی خۆری دەبڕی
لە بازێڕی بێکاراندا، جاشێ پێشمەرگەی دەکڕی!.
من بینیمن، هەردووکتان بوون پێدەکەنین

بەیەکەوە شێوتان دەخوارد
بەخەندەی چاو، بەبزەی لێو ماچتان بۆ یەکتری دەنارد
لەپشت پەردەی خەمتانەوە، فرسەت تەلەب ئەمبەرەوبەر...
بەڕووی یەکدا دەڕشانەوە!.
گوێم لێتان بوو بەڵێنتان دا...
ئێوەم بینی لەپێتان لەناو لەپی ڕەشی ئەهریمەندا زەردەهەڵگەڕا
داستانی مەرگی کۆڕەومان، بەبەرچاوی جیهانەوە هەروا دڕا!
ئەوەی دەیلێین گوێمان لێیە
هەزار شایەتیمان پێیە.
بیلێین، لە ئێمە مەترسن، داخۆ چیتان لەدڵدایە؟!
دڵەڕاوکێ ڕێگە لە ئەشکی ئاسمانی سایەقەمان دەشێوێنێ
ئەم وارەمان، تاکەی کانی ژیلەمۆ بێ؟
سەری ساڵە، جەژنانەمان ڕۆڵە ڕۆ بێ؟
لە دژواریی قسە و کارا، بەڵێن و پشتی پەردەوە...
کەم پەترۆی زام هەڵبەنەوە،
قوربان ئێمە بێ تاوانین، بەس هەناومان بەردەنەوە!
ڕاپۆرت... ڕاپۆرت!!
ئەم ڕاپۆرتە با نەسرەوێ
ئەوەی لە ئاشتی بەداخە
کۆستی خەست و قورسی کەوێ!
هۆ خەڵکینە بەس پەترۆی زام هەڵبەنەوە
منی شاعیر بێ تاوانم، بەس هەناوم بەردەنەوە
هێشتا جەستەم هەر سووتماکە
لە نوێ ئاگر مەخەنەوە
هێشتا گوێم لە خورپەی دڵ و ڕاچڵەکینە
نەفخی سوور لێ مەدەنەوە!
تازەزامم، خوێن دەچکێنێ
برینم تێ مەکەنەوە
بەس پەترۆی زام هەڵبەنەوە!

***



## برووسکەیەک بۆ یادی (دیلان)

١٩٩٥/٤/١٠

مامە کوڕنووم بەیاداهات، بوو بوو
بەکۆترە شینکەیەک
بە ئاسمانی ئەم شارەدا جەولانی بوو
دەیدا لەباڵ
شاری دەکرد بەگومەزێکی سەربەتاڵ
دەیدا لەباڵ... دەهاتەوە
دەتوت دەرگای بەهەشتی نوێ دەکاتەوە!
دەیدا لە باڵ... بە گمە گم دەهاتەوە
دەتوت باوە ئەفلاتوونەو
لەناو کووپەی شەرابایە و دەخواتەوە!
دەیدا لەباڵ... دەهاتەوە
دەتوت خەییامی سەرمەستە و
بە بەڵگەی ڕەز، وەڵامی خوا دەداتەوە!
دەیدا لەباڵ... بەقونەقون دەهاتەوە
دەتوت بۆ لای مامە یارە
مژدەی خۆشی دەباتەوە
دەیدا لەباڵ... دەهاتەوە
دەتوت بارانی ڕەحمەتە و گردی سەیوان دەشواتەوە!
وتیان چییە وا شەیدا بووی؟
وتیان لە کوێوە پەیدا بووی؟
وتی ئەو ساکە من مردم، تەواو مردم
بەقەڵەمی دیلانەوە گەڕامەوە
لەناو گەرووی دیلانیشدا
لە ئاوازێکی زۆر خۆشا خولامەوە!
تۆزی مەرگی لەسەر لادام
بووم بەئاڵای ژێر سێبەری
چوومە سەر خوانی ڕابەریی
بەئەمەکم... دەبێ پاداشت بدەمەوە
دەبێ ئاگری نەورۆزی پیرەمێردمان

له دامێنی مەزرای دیلانی شاعیرا بکەمەوە
دای لە باڵ و بەسەر شارا چریکانی
گمە گمی، بوو بەخوڕەی ئاوی کانی
بەسەر لووتکەی منارەکەی مەولاناوە پەیامی نارد
بۆ لای نالی، بۆ ئەستەمبووڵ
بۆ غوربەتی حاجی قادر...
بۆ مەولەوی و ئیشراقی قووڵ
بۆ بێکەسی ئاگری سوور
بۆ گۆرانی بێ شڵپ و هووڕ
وتی: دیلان لە بەهەشتا بەقەد دڵی هەموو کوردی
جێگە هەیە
وتی: دیلان لەم سەرخاکە
بەقەد چاوی هەموو کوردی ڕێگە هەیە
وتی: دیلان نەمردووە و قەت نامرێ
دەبێ عومری خولوودی ئەو
لەگەڵ عومری گەلی کوردا حساوکرێ
لەناو سروودی نەورۆزا،
لەناو ئازادی خوای کوردا،
لە قەتاری دەروێشەکەی گەرمیانی دا،
لەبەیتی بەردەشانی دا
دیلان سوولاوی زولاڵە
جەژنی خۆشە و شوورەی پۆڵا و
بەژنی ڕێک و چاوی ڕەش و لێوی ئاڵە.

***

## مەی دێر

مەی دێر، ئامانە، لاکە بەملاوە
دەرمانی دەردم جامێ شەراوە
قوربانی دەست و سینی و وادەتم
من هەر بەتەمای گفت و بادەتم
جەژنە و قوربانیم، کوا تیلەی چاوت؟
ڕۆحم داهێنێ وەک پرچی خاوت



مەی دێر من ئەمشەو حاڵم بێ حاڵە
ئاخم بۆ بادەی خەستی حەو ساڵە
ماچێک لە گۆنا و قومێک لە لێوت
بۆنێک لە تاڤگەی قژی پەشێوت
چ ئەم دنیامە و چ دنیاکەی دی
پێشکەش بەتۆ بن گەر زویر نەبی
لێوت پیاڵە بێ، چپەت مەزەی خۆش
منی دێوانە چم داوە لە هۆش؟!

***

## حەللاجی سەردەم

۱۹۹۰/۱۲/۹

دەشێت ڕۆژێ بەدوای منا بگەڕێیت و نەشم بینی
دەشێت ڕۆژێ وا بزانی من وێڵم و سەر گەردانم
دەشێت ڕۆژێ لێت بپرسن، بڵێن کوانێ؟!
لە وەڵاما بڵێی منیش وەکوو ئێوەم و نازانم!
هۆ خەڵکینە لاتان سەیرە شەرابی ناب
لەناو ئاوێکی زولاڵا بتوێتەوە؟
لاتان سەیرە کە تەلیسمی ڕێگەی عەشق
ئەگەر بەسۆزی شاعرێک مەحف ببێ و بکرێتەوە؟
لاتان سەیرە ئەگەر عاشق بەسەر باڵی سۆزێکەوە
چووبێتە ناو باخی جوانێ؟
ئیتر ئێوە بۆچی بەدوایا دەگەڕێن،
ئەی ئەو بۆچی دەڵێ کوانێ؟!
من ئەو چاوەم بەزریزەی شیعرێکەوە،
بەگەردنتا هەڵواسراوم
من ئەو چامە دەم هەراشەم، لەنێوانی مەمکەکانتا
بووم بەخاڵ و خپ کراوم
لەناو ژمارەی ساڵانما. وا خەریکە
نوقم دەبم هەتا لێوان

دەشتی وشکایی تێکەوتووم، دەڕوانمە لووتکەی کێوان
هەر بەهارە
گوڵ و تەمەن وەکوو ئالآن
لە خوارەوە تەکەیان دێ ڕۆژ و مانگی
تەزوێی سالآن(١)
ئەی بۆ لەمن تێ ناگەیت و شیعرەکانم لەبەر بکەی؟
باخی گولآنت بەپیتە، تاجێ گوڵم لەسەر بکەی؟
لە دامێنی هەڵوێستێکتا بمکەی بەهاوڕازی خەمت...
بەشانەیەک لوولم بدەی لەگەڵ تاڵێکی پەرچەمت؟
با، لە جۆلانەی پەلکتا بمکەی بەکۆرپەی بەرمەمت
ئەوسا لە ناخی شارەوە باوەڕم دەنگ دەداتەوە
من حەللاجی ئەم سەردەمەم
منم دەروێشی ئەم شەمەم
فەرهەنگەکان هەموو خەوتوون
هەر خۆم فەرهەنگی ئەم خەمەم!

***

## ئاوات

*لەسەر ڕەوتی سوارچاکانی شیعری کوردی*

ئاواتمە، ڕێکەوتیش بێ، ساتێک تەمەن بەکامم بێ
مەزەم شیعر و جام لێوی تۆ، شیلەی دەمت شەرابم بێ
لەسەر تەبارەی باوەشت ناخی حەزم بکەمەوە
چپەت پەیامی خۆشبەختی و نیگات مەرهەمی زامم بێ
کە مەستیش بووم بەم هەوایە، هەرچی هەوا و هەوەس هەیە
لە قومێکا پێشکەشم کەن وەکوو ژەهر حەرامم بێ
با شۆڕەبی خەم و مەمت سێبەر بکا بۆ جەستەکەم
دەچمە ئەو پایە و شکۆیە، شاهی شاهان خولآمم بێ

***

(١) تەزوێ: تەزبیح



## گوڵدان

١٩٩١/١/١١

من دەزانم تۆ گوڵێکی چەند ناسکی
بۆیە لەدڵما دات دەنێم
ئەی تۆ بۆچی، خۆت نازانی
من بۆ گوڵدانی تۆ دەشێم؟!
لەهەر شوێنێک کە بتبینم
وێنەت دەگرم بەچامەیەک
بۆ هەر کوێیەک بچیت، ئیتر
سۆزم دەبێ بەنامەیەک
لەشیعری هەر شاعیرێکا
بتخوێنمەوە دەتکەمە بەر
لە تاجی هەر هونەرێکا
نقێمێک بی، دەیکەمە سەر
من حەز دەکەم لە باوەشتا
ببمە دزی باخ و بەرەت
من حەز دەکەم وەک کیژە جاف
پێشکەشم کەی نان و کەرەت
من خەییام و تۆ جامەکەی
پڕ لە شەراب و لێو تەنک
وەهام دەوێ هێشووی مەمت
بکەم بەچێژ دەنک دەنک
تەنها شەوێک بەهەشتم بی و
پاراوی کەی لێوی بریام
پێشی ئەوەی بەیان بدا
پێشکەشت بێ هەردوو دنیام

***

## دڵداری تۆم

١٩٩١/٦/١٣

من دڵدارم، دڵداری تۆم
شیعر و بەستە و پەیڤ و نەوام هەموو خۆمن
نیگاری تۆم
من بەشێکی گوڵزاری تۆم
من دەمێکی بەهاری تۆم

*

لەو ڕۆژەوە هۆشم هەیە تۆم خۆش دەوێ
من دڵدارم
عومرێک دەبێ بەدووتا دێم
عیشق و خەمە کۆڵ و بارم
من دڵدارم
من نەژادی ڕێی ئازارم
بەڵام هیچ کەس وا نەزانێ دەسبەردارم

*

لەسەر تابلۆی قەدەری خوا
کە نەخشەیان بۆ تۆ چنی
وتم هەرتۆ یاری منی
لەو ڕۆژەوە لەناو گەمارۆی نەیارا
پەرچەمی تۆ خپ کراوە
دەلێلێی تۆ و دەلۆلۆی من
لەگەڵ نازی نازدارانا کپ کراوە

*

عاجباتیەکان ئەوسا حەوت بوون
لە بەهاری زەماوەنتا وا بوون بەهەشت
نەیارەکان بۆیان گرتمەوە قوڕی خەست
وەکوو نالی شار و شەوم لە پشتم بەست
دۆڵ و چەم و تۆفان و شاخ



بوون بەعەزیا و ڕێیان گرتم
نەیانزانی خۆ من کوردم
من تۆرەمەی هەندرێن و ڕێی هەڵگوردم(*)
منی عاشق بەناو شیعری جەهەننما
زۆر عەزرەتیم
ڕێگە تەیکەم دەستم بگاتە دامێنت
بیرم دەچێ سەد مەینەتیم

*

منی دڵدار
ئەگەر بەگەرووی مەرگیشا ڕام بکێشن
دەستم لە تۆ ناکەنەوە
ئەگەر هەموو ئەم زەمینەم بۆ تاپۆکەن
سلاوی تۆ نادەنەوە
من دڵدارم
خۆ من ئەمرۆ دڵ شکست و بەئازارم
نایگرمەوە کۆڵ و بارم
هەتا بەعیشق و خەمەوە نەچمەوە ناو دڵی شارم
ماچی نەکەم لێوی یارم
نەبن بەیەک دڵ و زارم
من دڵدارم، من دڵدارم

*

هەر کە بینیم ئاوەدانی و نەخشی پری،
مەی نۆش دەکەم لە چاوی تۆ،
لە ئاوی کانیباوی تۆ،
قنیات دەکەم بەنان و دۆ،
تاجی عیشقیش لەسەر دەنێم...
با شەق بەرن نەیارەکان، خۆ من دەبمە خاوەن شکۆ
من دڵدارم، من نەژادی ڕێی ئازارم

(*) تۆرەمە: نەسل، نەوە

## سەنگەری ئازادیخوازان

١٩٩١/٣/٢٧

*بەبۆنەی ٣/٣١ ساڵیادی دامەزرانەنی حزبی شیوعی عێراقەوە.*

ئای کە ئاگر بەسەر تۆدا هاتە خوارێ و
هیچ کەس نەبوو بزووتکێکی ڕەش کاتەوە!
ئای کە قرچە کەوتە ناخت، تەقیتەوە
شاخێک نەبوو قرچەییێکت لێ وەرگرێ
بەرەو جیهان دەنگ باتەوە!
ئای لە سیفری بێ وچانتا خوێن، ڕژاوە: سەر، بڕاوە
دێڕەکانی هەموو دێراوی ئازارن
وا چەند ساڵە وەرزەکانی تەمەنی تۆ بێ بەهارن؟!
ئەی سەنگەری ئازادیخواز،
ئەی سەنگەری چۆڵ نەکراو!
ئەی سەنگەری خەون و خەمی هەژارانی ئەم وڵاتە
دنیا لە تۆ شەوە زەنگ بوو
مێژوو لە گشت ئەو ستەمەی ڕێی دەگرتی
هەر بێ دەنگ بوو
هەر بەپەنگ بوو!!
خەمان لە تۆدا خەملێو بوون، هەرچەند دەهاتنە چرۆ
بوختان دەبوو بە بژار و دەدرایتە بەر تۆپی درۆ.
ئەی سەنگەری بەرەی خەبات، تۆ پێم بڵێ
مژدەم بەرێ باوەڕ بکەم وا خۆر هەڵهات!
باوەڕ بکەم خۆر هەڵدێت و تینی دەگاتە دەروونت
ئیتر ڕێییەک دەکرێتەوە هەر بۆ هاتوچۆی بۆچوونت؟!!
ئەی سەنگەری ئازادیخواز،
ئاگربارانت بەس نییە؟!
تۆ پێم بڵێ، مژدەم بەرێ
ئەمجارەیان بەردەمی تۆ هەرەس نییە!
ئەی کورد، گەلی ستەم دیدە!



تۆ شایستەی کە نەیێڵی سەنگەرێکی ئازادیخواز
هەرەس بێنێ و
گەمە بەهارەی ئەمساڵمان لە کێڵگەدا خۆرە لێی دا،
کرم تێی دا.
ئێوە مەردن ئەی مەردینە!
با بگەینە خەرمانان و سووری خەرمان هەڵبەینەوە
سووری خەرمان تا دەس هەڵدەی پیت و فەڕ بێ!
ئاشتی خۆشاوی دوای شەڕ بێ!
کورد دەروونی فراوانە و دیوەخانی کراوەیە
کورد ئەمجارە، تۆ پێم بڵێ، مژدەم بەرێ،
نای دۆڕێنێ براوەیە!
سەنگەرەکانی ڕێی خەبات شوورەی شاری هیوای گەلن
پێشمەرگەکان مانگ هەڵدەکەن، خۆر هەڵدێنن
ئیتر هەزار هەزار ئیتر
قەت سەنگەری ئازادیخوا نارووخێنن!
سەنگەرەکانی کوردستان، نێرگز دەگرنە یەکتر و
بەماچ یەکتر هەڵدەسێنن!!

***

## بەڵێن

١٩٩١/٦/٣

ئاواتی چەند ساڵەمە ساقی تۆ بەڵێن بدەی
کە، هاتمە ئاسانەت بەرچاوی خۆتم بخەی
من بەخەندەی تۆ دەژیم بەنیگاوە تێم گری
نەیار بەکینەیە لێم تۆ بەقسەی ئەو نەکەی
جام و دوو جام بەس نییە، دەمێ ساڵە تینوومە
لێم مەگرەوە دەخیلە، بمخەرە بەر تافی مەی
مەی بڕژێنە نێو گەرووم، مەی بڕژێنە بەسەرما
وێکڕا سەر و چاو و دەم بڵێن خودایا ئۆخەی
من عەزرەتیم چاوەکەم، پەلەم لەجێی خۆیەتی

ئەمڕۆ عـومـر هەڵی دام، نەکـەی بمخـەیتـە سبـەی
سبـەی کێ دەڵێ دەژیم، سـاقی ئەمـسـاتە سـاتە
بەڵێینی دا، وادەمـــە، قـــوربانی بم ئەو دەمـــەی
مـــەییت ناب و نایابە، مـــەیخـــانەکـــەت مـــۆبەدە
من، ئاگـــر و برایم، کـــاری خـــوداوەند دەکـــەی!!

***

## لێو

١٩٩١/٦/٥

وەی وەی لەو جووتە لێـوە
چ سیـحـرێکیـان وا پێـوە
خـونچـەی نەوشکۆفـەن و
گـولاویشـیـــان لە نێــوە
ئالَن وەک دەنووکی کــەو
ناسکن وەک شیـرین خەو
قـوتن وەک گـۆپکە و چرۆ
ئەســتـێــرەن لە تیـرەشـەو
عــەقــیـــقی دەوری دوڕن
چاوی نازیش نـاســــــڕن
تەنـهـــا بەخــــەندە نەبێ
پـــەردەی بـــەیـــان نـــادڕن
جـــووتێ مـــانگی چەژنـانن
وەرن بـــۆیـــان بــڕوانـــن
دوو بەیتـێکی مـــەوزوونن
گـــەر لە شـیـعـــر دەزانن؟
جـامی دەم لێ نەکـەوتوون
خومـاری چاو نەخـەوتوون
خـــوایا ســـا بکرێتـــەوە
برژێ شـــەرابی گـــوڵگوون
ئەوەڵ ســۆز و خـــەمی من
ئەوەش گـیـــان و دەمی من



ئەی جـۆبـاری مـەی و مـاچ
بشـکـێــوە ســەرچەمی من
هەی هەی لەو جـووتە لێـوە
کـە هەڵهـاتن لە کـوێ وە
کـــیـــژێ بیـــان کـــەرەوە
بەجـــــوێنیش بێ لەڕێوە

***

## لەنگەرگرتن

١٩٩١/٧/٣٠

ئەگەر بلێم لەسەر دەنکی لێوی ئاڵت
تەنها ماچێک دەنووسم و دەم لادەبەم
ئەرز هەڵدەچێ و ئاسمان دەخات!
گەر داواکەم لەسەر سینەت بەگازێکی ئێجگار هێواش
دوگمەییێکت بقرتێنم
خوا دەزانێ چی ڕوودەدات!
ئەی هاوارە خۆ باوەشت ئەوە هەر نا ، و قەسدی سەرمە
کاول بوونی ناو و دەرمە
ئێ من کەشتیی ناو گەرداوم، دە ڕووی خۆتم لێ گرژ مەکە و
ئاوا نەبێ لە ئەگریجە خاوەکانتا
بەشکوو منیش هێدی هێدی لەنگەر بگرم
لە دەفتەری چاوەکانتا

## قەڵبەزەی شیعر

١٩٩١/٩/٢

قەڵبەزەکەی بێتواتەیە شیعر و وشەم
سەروچاوە دەگرێتەوە
وەکوو هەڵۆ دەزریکێنێ و
بەسەر هیزۆپ و دووکاندا
هەردوو باڵی دەکرێتەوە

له کۆیەوە مامە حاجی بانگم دەکات
دەڵێ وریابە ماندوو بووی، کۆڵ دانەخەی
بۆ من نەبێ، پەنا بۆ هیچ کەسێ نەبەی
لەسەر مەزاجی «فانی»یە
شیعر دەڵێ بمهۆنەوە
بۆ نازانیت، دەگەیتە زێ و ئاڵتوون کۆپری و
له شۆریجە و ڕەحیماوا
منداڵە کورد دەتخۆنەوە؟!

***

١٩٩١/٩/٨

## ئافرەت

خۆشم دەوێی تۆ ئافرەتی
خۆشم دەوێی تۆ نازاری
تۆ هاوسەری کێش و سەرەوای ئەشعاری
تۆ سەرینی، تۆ نوێنی
تۆ چرپایەی ئارامی
تۆ سێبەری سەرەوژوورەکەی
ڕێی ئاوارە و ناکامی
تۆ خەونمی، تۆ شەونمی
دەباریتە نێو چیمەنی زەردووامی شیعرەکانم
دەستە مەرهەمی زامی
تۆ بەرچایی و تۆ قاوەڵتی و تۆ شامی
هەر لە تۆدا گڕی جەستەم خامۆش دەبێ
تۆ پریاسکەی سەر ئێشەمی
تۆ پێچەنمی، تۆ کێشەمی
تۆ دژوار و تۆ دۆستمی
ئاشنامی
تۆ نەخشەمی، تۆ ئاڵامی
تەنها لەسەر گوڵی دەمت
مەلی خۆزگەم بای باڵ دەدا



تەنها لەسەر سینەی تۆیە گیانی خەستەم
ڕێگەی شنەی شەماڵ دەدا
من، مەسیحی نەوسی ژیرم،
هەر بە خاچی باڵای تۆدا هەڵدەواسم!
من لە تۆوە شیعر و جوانی و
چێژ و ئارامیش دەناسم!
من زیندانم، کلاوڕۆژنەم، چاوی تۆیە
دێمە، جاڕم،
ئەی شەتاوە ڕۆشنەکە
هێڵ بەهێڵم چاوەڕوانی ئاوی تۆیە
دانەوێڵەم، لە تەبارەی سینە و مەمتا بمڕوێنە
پەیغامبەری ڕەنگ و بۆنتم
دەتۆی هەیوولانشینیش بەپەیامێ بمدوێنە
ئەو دروشمەی گشت هەنگاوێ،
گشت قۆناخێ
ڕەوتی مێژوو دای نەناوی
تۆ ئەو کتێبە پیرۆزەی هەتا هەتا لەسەرچاوی
من کاوەش بم...
تۆ چەکوشی، تۆ بەرکۆشی
کە دەشخزێمە دامێنت خوا دەزانێ
تۆ چەند خۆشی؟!
خۆشم دەوێی چونکە جوانی
هەر تۆ بەخت و تۆ فریشتەی جێ ژوانی
هەر باوەشی تۆ ئارامگای ئەندێشەمە
گۆڕەپانی تێکۆشانە و،
«ئەی ڕەقیبی» ئەم کێشەمە
شەو و ڕۆژێ بیست و چوار جار
منی خۆزگە لە پانتایی
جوانیی تۆدا هەردەوێڵم
لە پێشمەرگە کۆنەکانم
یا دەکوژرێم، یا سەنگەرم جێ ناهێڵم.!!

***

## قەڵادزە

١٩٩١/٩/١٩

هۆ هۆ شارە وێرانەکەی دڵی پشدەر
خۆ من سەرم لە قوڕناوە،
لە شوێن ماڵێکی کاولتا دایک مردووم و شین دەکەم
لەوەتەی تۆ لە وێرانی هەڵکێشراوی
لەهەر کوێیەک ئیسلام هەبێ و شار خاپوور بێ
بێ یەک و دوو ئامین دەکەم
بۆ تۆ بمری و قسەی زلی زەرد هەڵگەڕاو...
باسی بەهەشت و جەحەنم بدا بەگوێی ئەم و ئەودا
هیچ میحرابێ نەی لاوانی!
هیچ ئیسلامێ نەیخستیتە سەر باوانی!
کە تۆیان کوشت هەر کورد وتی: ئای دایکە ڕۆ
هەر کورد قوڕی گرتە سەری
دانی شاشی ئوممەمیەت بەدانە چۆقە هەڵوەری!
لەسەر گۆڕی تۆ وەستاوم
چاوەڕوانم وەکوو مەسیح هەڵسیتەوە
خۆڵی مەزرات بکەم بەسورمەی چاوانم
منیش وەکوو (سارا) خاتوونی هەڵکەوتووت
بێمەوە کۆشی باوانم
ئەگەر ڕۆژێ تۆم لەبیرچێ
ئەو کاتە من ڕشانەوەی ئێڵنجەکانی تاوانم!
قەڵادزێ، قەڵای دوو زێ
من زێیەکم لەو دوو زێیە
ئاخۆ سارای شاعیری تۆ
لەمەش زیاتر چی دی پێیە؟
تەنها دەنگی شاعیری کورد سۆزی شەقامە ڕێمانە
دەبا دوژمن خەمی باربێ
قەڵادزێ، بوو بە کەعبە و قیبلەگایەکی نوێمانە



دەسارا خان(*) بەگەردوونا بانگێ بدە:
قەڵادزێ دیوانی شیعری وێمانە(*).

***

## قەسەم

١٩٩١/٩/٢٨

*بەهەوای گۆرانیی کوردی*

قەسەم دەخۆم نات ڕەنجێنم
وەکوو بولبول بۆت دەخوێنم
تۆوی شیعرت بۆ دەچێنم
ئەم دنیایە و هەرچی تیایە
ئەم دیوانە و هەرچی تیایە
ئەم گلێنە و خەون و ئاسۆ
خەون و هەرچی تەپاوتلە
چاوی ڕەش و هەرچی کلە
لێوی ئاڵ و چی خەندەیە
هەرچی خەندە و کریکەیە
هەرچی پەیڤی فەریکەیە
دەیانخەمە ناو بوخچەیێک
دەیبەستمە پشتی سەفەر
دەبنە توێشووی ڕێگەی خەتەر
بۆ چامەیێکی دەم هەراش
بەدیوانا تێ دەپەڕێ
بەکتێبا بۆی دەکشێ
کێشی هەنگاوی بێ کێشە
چزەی گەستنی بێ ئێشە
چرای قافییەی پێ نییە

(*) سارا: کچە شاعیری قەڵادزێیە
(*) وێمانە: خۆمانە

خەڵکی دەڵێن چاو لە نوێیە
دەشڵێن گەریدەی بێ ڕێیە
دەڵێن هەموو شتی پێیە
دەڵێن هیچیشی پێ نییە
دەڕوا و خودی خۆی خڕ دەکا
گۆمی داڕووخاو پڕ دەکا
دەکەوێتە سەر زار و دار
بەسەر هەورا تێدەپەڕێ
بەناو هەورا دادەبارێ
دەدا لە بانی هەر شارێ
دەچۆڕێتە نێو دڵی خاک
لەگەڵ تۆودا دەڕوێتەوە
لەگەڵ لێوی گوڵە بەڕۆژەی -بیتوێنا- دەکرێتەوە
لەباڵ دەدا تا دەگاتە مەغریبستان
سواری ملی عەنقا دەبێ
دەخزێتە شاری جابوڵقا
بە-شێخ ڕەزا- دەڵێ من هەم
من پێیەکم ئەم دنیایە
من دەستێکم ئەو دنیایە
ئەم دنیایە و هەرچی تیایە
ئەو دنیایە و هەرچی تیایە
قەسەم دەخۆم بۆ تۆی دێنێ
ڕەنگە تان و پۆی ئاسمانت هەڵوەشێنێ
چامەی منە و لە جام دەکا
بەرچاییمە و لە شام دەکا
خەم بەلێوە، گوڵ بەلێوە
وەکوو بووکی شوو نەبەدڵ
چاوەڕوانی باوانییە
سووری خەرمان لە تۆ دایە
ئەو، (نەهات) و (بێ نانییە)



دەبارێت و تەپ و نمە
وەکوو ساوا دەم دەگێڕێ
تۆ دوو مەمکی پڕ لە فرۆی
وەکوو بەرخی ناو کۆزانە و
تۆش مێ پەری زۆر بەهورۆی
بەرەو لات دێت، لاکەرەوە
هۆوێ بکە و بادەرەوە
قەستەم دەخوات چاوەڕێیە
بۆنی مژدەی لەنوێی پێیە
تۆ، دەریاچەی، ئەو، ماسییە
تۆ زێڕیت و ئەو باییە
کوانێ دەستت، دەستی وێدە
کاڵای سفتە ناپوترکێ
تادەتوانیت زێدەی پێ دە
قەسەم دەخۆم من پسپۆڕم
بۆ هیچ کەسێ ڕا ناگۆڕم
بیگرەوە ناو هێلانەت
با، لانەوازیی فێر نەبێت
دەستەمۆی کە ناشکێتەوە
کە تۆ بووی بەڕاز و نازی
بەخۆت نەبێ ناکرێتەوە
قەسەم بخۆ دەیلاوێنی
لەناو بێشکەی چپە دووتا
لە مەسقەڵی گۆنا و ڕووتا
لە عارەقەی بەرگەردنتا
پەیژەییێکی بۆ ڕاهێڵە
بەسینەتا بێتە خوارێ
بەسەد بارا نەک هەر بارێ.
قەسەم دەخۆم خۆرئاوایە
قەرسی پایز، ڕەشەبایە

چامەی شێتم هاتە سەرپێ
ئەپرمێنێ وەک ئەسپی شێ
تۆ، لغاوی بۆ شل بکە
چەپۆکانە خۆی دەهاوێ
ئەو مەیدانی کەم نەفەسی هەرگیز ناوێ
نەفەس بدە بەمەیدانت
سورمە بکەرە چاوانت
من سوێند دەخۆم ئەویش قەسەم
ئەو ئەو کەسە و من ئەم کەسەم
ئەو نامەیە و من خۆم پەیکم،
شارەزام لە، شارەزوورا
وا نزیکی دەکەمەوە
کە خۆم ون کەم لە ناو دوورا
قەسەم، قەسەم، قەسەم، قەسەم
چامە دەڵێ
من ئەو گوڵاڵە نەورەسەم
بمدا لەسەر، ئێش نامێنێ
لە شیعرمدا کێش نامێنێ
بمکا بەنقێمی مێژوو
هەنگاوی دواو پێش نامێنێ!
هەمووو شتێ دەبێ بەیەک
هەموو یەکێ دەبێ بەدوان
هەموو دەمێ دەبێ بەکاس
هەموو سینگێ دەبێ بەخوان!
گشت دیوانان هەر بۆ منن
هەموو دنیاش هەر بۆ تۆیە
کورد و سێبەری داربەڕوو
شوان و خەمی نان و دۆیە!
قەسەم بخۆ درۆ ناکەی
تۆ تریفەی مانگەشەوی



جێ ژووانی جووتە و تاکەی
تۆ ئەو کچە کوردە قۆشمەی
ئەو بێ ترسە، ئەو بێ باکەی
کە سەر دەنێیتە سەرسەرین
دەیکەیتەوە دەمی برین
کە برینت پێچایەوە وەنەوز دێنی
بەناو پێڵووتا دەیچێنی
جامی خاڵیی خۆت ناشکێنی
جامی پڕی کەس ناڕژێنی
دەخۆیتەوە
دوگمەی شەتەک دەکەیتەوە
تاریک و ڕوون ختووکەی دایت
گورج سەلامی دەدەیتەوە
ئەو گرەوەی بۆیان دانای
بەخەندەییێک دەی بەیتەوە!
جاسوێند دەخۆم نات ڕەنجێنم
وەکوو بولبول بۆت دەخوێنم،
من خوا بکا تۆ بهێنم.

***

## ماچ

۱۹۹۱/۹/۲۹

*لەسەر ڕەوتی سوارچاکانی شیعری کوردی*

وا دەم ئەمرۆ دەمی ماچە، هەموو شتێک بەولاوە نێ
جەستەم هەمووی لەخۆشیا هەڵدەپەڕێ، پێدەکەنێ
ئەگەر دەڵێن ئەم قسانە لە تەمەنی مندا نییە!
منیش دەڵێم: ڕەقیبەکان، ئەرێ ئێوە چیم دەدەنێ؟
وەکوو ڕەهێڵە ماچێکی سەرپەڵەییێک، دادەبارێم
بەسەر گۆپکەی دەم و لێوا، تا سوورایی لێ دەچنێ

ملوانکەییێکی ماچینە، دەکەمە گەردن و ملی
مەگەر خووا خۆی بزانێ، حەسادەتم چەن دەبەنێ!
دەیخەمە بەر شەستی ماچم لە چاویەوە تا بەری پێی
ئیتر گیانم لەجەستەما دێت و دەچێ، خۆی دەژەنێ
لەناو باخی سینە و مەما، دەبمە سوورە چناری ماچ
وا ڕەگی خۆم دادەکوتم، کەس نەتوانێ هەڵم کەنێ!
دەمم میرزای دیوانێکە، دەفتەری تۆی دراوەتێ
هەر پەڕەیێک هەڵداتەوە، مۆری ماچێکی پیا دەنێ!
گەر نەیاران ماچت لە من حەرام بکەن، هاوار دەکەم...
هۆ یارەکان، وا دەمکوژن، ئێوە لەسەرم هەڵبەنێ!
وەک ئازادی، دەمی ماچ و ماچی دەمە ئاواتەکەم
منم شنەی شەماڵی ماچ «گەلاوێژ»م پێ دەخەنێ.

***

## چەند کورتە شیعرێک

١٩٩١/١٠/٥

### بنی گیرفان

من لە بنی گیرفانمدا
چۆپی گێڕی ئاهەنگێکم لە خوا دەخواست
باو باپیران ئەسپێیان نارد
بۆ نەمزانی جێ هەڵپەڕکێ وێرانەیە،
وەکوو ئاشەکۆنێکی سارد؟!

### دەست

دەستی ڕاستم قەڵەمێکە و چەپیش کاغەز
چی بنووسم؟، چی داهێنم؟
چۆن چۆن ڕاستم لەگەڵ چەپا
لە ئەندێشەما ڕاهێنم؟!

### دەم

کونەباییێک بووە بەدەم



بیکەمەوە ڕەنگە سەری خۆم هەڵگرێ
دایشی بخەم ڕەنگە سینەم هەڵتەکێنێ!
ئێوە بڵێن من چی بکەم؟
چۆن واز بێنم، چی بکەم بەخەم؟
ئایا دەشی بێ دەم بژیم؟
ئایا دەشێ بێ خەم بژیم؟!

### زمان

حەزم دەکرد هەر گۆی مەمان ختووکەدا
کاسە لێسان ڕەزا قورسن!
حەزم دەکرد هەر لێوی یار پاراو بکا
کەچی بوو بەچلۆسکی گڕ...
کەچی بووە بەشمشێرێ
بەیتی جنێوان دەنێرێ،
بۆ ئەوانەی گۆی مەمک و لێوی ئاڵیان
کرد بەتووتکەی پەناماڵیان!

### گوێ

کۆچەڵەییێک بەلا سەرما هەڵواسراوە
جێ تاقیگەی دەم و دووە
دەنگ هەر لەوێ لە خۆی دەگا
دەنگیش هەیە کۆپانێکە و
بێ یەک و دوو لە خۆی دەکا!
کە زانییان مێیینەیە
هەر دەمەو دێ،
ئارەزووی خۆی لە گۆڕەپانیا ڕۆ دەکا
نەدەپرسێ، نە کۆ دەکا!

### پێ

دوو دارشەقم لەژێرایە: ناویان پێیە
کە بەگوڕن

دەڵێی کوڕن
کە بێ وزەن، وەک ئافرەتی لەش بەدۆشاو
لەسەر چیچکان ڕێ دەماڵن
کالیارێکی چرچ و تاڵن

## چاو

بە ملیۆنێ دێرا گەڕا،
بەناو نەخشەی ئەم دنیادا گەڕیدە بوو
بەسەر هەموو جێ کیشوەر و جێ شارێکا خەمیدە بوو
من بێ خەتام، ئەو وای لێهات
بێژ لە نەخشەی ئەم جیهانە بکاتەوە
کە لە ئاستی کوردستانا زێی نەزۆکە
ئەینا لەسەر و بەرەوە
ئەڕوا و دوو خوێن دەکاتەوە
دەڕوا و دەوڵەت دەخاتەوە
منیش هەرچەند چاوم دێنم
بیکەمەوە و سورمەی تێ کەم
سورمە خۆڵی دێی سووتای خاکەکەمە!
کلتوور چاوی ژنە کوردێکی جل ڕەشە
خوشکەکەمە، داکەکەمە!

***

## دار ئەرخەوان

١٩٩١/١٠/١٩

وا هاتمە ڕوو، دەپێم بڵێ
داخۆ لە من داوات چییە؟
خۆ ئەز نەک خۆم، وا سێبەریشم لەترسا هەڵدەلەرزێ!
خۆت دەزانیت کە من بەرگەی
تیلەی چاوی تۆ ناگرم،
لە پێش دەمتا دەبمە دارێ...



بەری فرمێسکی هۆن هۆنی لێ دەبارێ
لە دووری تۆ، دەبم بەڕادیۆی چەند شەپۆل
هەر ساتێ خۆم دەکەمەوە،
هەر ساتێ بێن بمکەنەوە...
بەدرێژی هەر شەپۆلی
کیلۆ هێرتزی هەرچەندێ بێ
لە ئێستگەی جوانیی تۆوە، ئەو سەدایە!
لە خەرمانەی چاوی ڕەشتا گەلاوێژی نێو نیگایە
لەسەر لێوە گۆشتنەکەت، ئاهەنگی شۆکە و شیلەیە
خەیاڵی ئێسکە سووکەکەت لە چاویدا بیلبیلەیە!
سروودی گشت کردنەوەیێک
-بەناوی خوا، ئەو کیژۆڵە جوانکیلەیە!-
بەترسەوە وا هاتمە ڕووت، دەرگای سۆزت بکەرەوە
وەڵامی داد و هاوارم بەهێوری بدەرەوە
من خۆم سەیوانی ئازارم، گۆڕستانی شڵەژاوم
من خۆم نیگای ئەفسووسەکان دەنووقێنم
دەیان پەستێنمە نێو چاوم
هەر بەتەمام وەرم گری وەکوو چەمکی دارشتنێک
لە شیعرێکی زۆر ڕەهادا بەگەردنتا بمهۆنەوە
لەسەر گۆنات، لەسەر سینەت بمنووسەوە
بەبێ کێش و بێ سەرەوا
با ئارەزووم ڕوونووسی کا...
وەک ڕاچڵەکێن لەناو خەوا
داوا دەکەم، پێ دادەگرم
لە باوەشی چاوەکانتا، بمکە بەساوای بەر مەمان
لەسەر سەیوانی ئازارم، ببە بەداری ئەرخەوان!!

***

# خەون و ماچ
## چەند کورتە شیعرێک

١٩٩١/١١/١٢

١– خەونم دەدی... لە باخێکا دارهەرمێ بووی.
ڕام وەشانی
هەرمێ باران دەستی پێ کرد،
دەمگرتنەوە، دەبوون بەماچ
دەمم لێ کرد بە بەرکۆش و هەر هەموویم دا بەلێوم
ئەوسا زانیم بەم پایزەش چلۆن دزێکی بزێوم!

٢– خەونم دەدی... تۆ ئاسمانی
وام دەزانی، ئەوا ئەستێرە بارانە و
دانە دانە دەمقۆزتەوە
لەناو دەستما دەبوون بەماچ
منیش بەرکۆشم گرتەوە ماچی تێکەم
کاتێک کە بەخەوا هاتم...
هەردوو دەستم لە دەمما بوو!

٣– خەونم دەدی... کانییەکی زۆر سازگار بووی
زۆر ڕۆشن بووی
کەچی وەکتر کە دەمڕوانییە چاوگەکەت
گۆمە ماچێکی بێ پەی بووی
چیت پێ بڵێم؟ نای شارمەوە
وەکوو تینووی گەرمەسێرێ
لەسەر چۆکم دەمم تێ نای
کە خەبەریشیان کردمەوە
تۆ سەرین بووی، من هەر لێوم پیا دەهێنای!

٤– خەونم دەدی... تۆ کتێبی
کردمیتەوە
دیوانێک بووی، شیعرەکانت هەمووی ماچ بوو



دەستم کرد بەخوێندنەوەت، تاکە پیتێکم نەپەڕاند
کە خەبەریشم بووەوە
بەری جەستەم هێشووە ماچ بوو...
خۆم نەلەراند!

٥– خەونم دەدی... ئەتۆ باخچەی گوڵە ماچ بووی
بەرچینەیێکم پەیداکرد
دەستم کرد بەگوڵچنینی گوڵە ماچان
تا بەرچینە لێواو لێو بوو
کە ڕاچڵەکیم... دەمم پڕ بوو لە تامی ماچ
هەتا ناخم هەر نشێو بوو!

٦– خەونم دەدی... قوتابیم و وام لە پۆلا
وانە، ماچ بوو،
مامۆستامان هەرچیی هەڵسان
لەسەر تەختە ماچی نووسی
خوا بیهێڵێ، لێوی منی کرد بەسورگی
ماچەکانم پێ هەڵمژی
لە گەرووما بوون بەسروود
کە خەبەریشم بووەوە
وەکوو بلێی ماچ هەڵدەدەم بۆ لێوی خۆم
ئاگام نەبوو لە نێوی خۆم!

٧– خەونم دەدی... تۆ وا کێوی
تۆ وا دەمی، تۆ وا لێوی
تۆ وا بەهێی، تۆ وا سێوی
وەکوو گەلاوێژی کێوی، تۆ مەزنی، تۆ بچکۆلەی
تۆ کەروێشکی، تۆ بەرخۆلەی
وام دەزانی لەیەک ناچن
کەچی وەکتر هەموو ماچن
کە ڕاپەڕیم، دیم: تەونەکەم،
قاڵییەکی ئاوریشمینی ئێجگار نەخشین

لە ماچەکانی خەونەکەم!

٨- خەونم دەدی... وا سوور گەرمە(١)
عەشاماتێک تێکڕژاوە
تۆ نۆ بووکی و...
ماینێکی ناو چاو مارۆت لەژێرا بوو
لەناو تارای پەمەییدا، گەلاوێژ و خەرمانە بووی
خۆم زاوا بووم
لەسەربانێ ڕاوەستا بووم
ویستم گەنم بارانت کەم
تارات لەسەر هەڵبەمەوە، تێر تێر سەیری چاوانت کەم
هێندەم زانی بووم بەماچێ...
نیشتم بەسەر لێوانتەوە
هێندەم زانی وەکوو ماچێ
بووم بەکلی چاوانتەوە
هێندەم زانی بووم بەماچێ
کرامە نێو چاڵی تینەت
هێندەم زانی وەکوو ماچان
ڕژامە ناو شنەی سینەت
کە باری خەو لە چاومەوە کەوتە فڕین
هەردوو دەستم شەکەت بوو بوون
بەجل دڕین

٩- گری گری، کورگەل هەموو دەستەسڕی لێ بابدەن
دەست بەنەشەن
خەرمانی خەم بەبا بکەن
ئەمڕۆ جەژنی ئافرەتانە
هەرچەند ڕێگەمان فرەیە، بەڵام جەژن دوو جەژنەیە
هەمووی دەچێتەوە بانە

***

(١) سوور: شایی





# ڕێ بەندانی وەرزی ئاگر

*بۆ شەهیدانی ڕۆژی ٧/١٠/١٩٩١ لە شاری سلێمانی: مامۆستا عیززەتی هونەرمەند و مامۆستا خاتووزین و لە عەربەتیش مامۆستا حسێن.*

چێشتەنگاو بوو...
ڕەبیەکانی قەراخی شار وەکوو سەگی تەرەکیوی
ناو کولانە کەوتنە گەفین
وا سەگ وەڕە و ئاگرباران ڕووی لە شارە و
ئێمە بەرەو کام لا بچین
کە دوژمنت کەوتە گەفین دەبێ پەڵی بۆ بهاوی
دەبێ چاوی لێ سوور بکەی
دەبێ دانی هەڵوەرێنی
دەبێ ئاگری بۆ ڕاخەی، قەمچی نیڵەی تێسرەوێنی
دەبێ بەچاوەشی قەمچی، مەیموون و سەگ هەڵپەڕێنی!
چێشتەنگاو بوو...
چەخماخەی مەرگ بەسەر شاخا تەقییەوە
ساماڵی ڕووی قوتابییان ڕەوییەوە
قوتابییان! وا سەگ وەڕە،
دێڵە سەگی تەرەکیوە شالاو دێنێ
مەرگی زۆر لە ناکاو دێنێ،
هەمان سەگن، لە کتێبدا هەر دەوەڕن
لە مێژوودا هەر دەگەفن
لە ئاینا حەپەیان دێ
لە جزمیشا هەمان خولیایان لەسەرە:
ئەنفال هی خوا و پێغەمبەرە!
شمشێر بەدەستی ڕاستەوە چەپیش کیسەی وەعز و ئایەت
ئەم بۆ ئەویان ڕێ و خەبەرە!
ئاگر بارانە کوڕینە!
ئاگر بارانە کچینە!
دوورکەونەوە، نەوەک ببێ بەڕێ بەندان!

قوتابییەک –خۆ، ڕێ بەندان کاری بەفرە–
ئێمە بەفریشمان ئاگرە و ڕێ بەندانی ئاگرمان هەس
دوورکەوتنەوە مەدەن لەدەس!
چێشتەنگاو بوو...
قوتابخانە وەکوو دایکێکی سفتەڕۆ
هەر قوتابی بەڕێ دەکرد
– خوا حافیزت کاکە عیززەت،
خودات لەگەڵ خاتوزینم،
خوایە مەرگتان نەبینم–
هێشتا دۆعای دایە سۆلاڤ[1] لەسەر دەم بوو
هێشتا دڵی دایە سۆلاڤ، کلۆی خەم بوو
هێشتا چاوی دایە سۆلاڤ پڕ لە تەم بوو...
لەناو لوورەی تۆپی خەشا چنگی مردن هاتە دەرێ
هۆ خوای ئەنفال، ئەم ئەنفالە
ئاخۆ گیانی کێی کە، بەرێ!؟
دایە سۆلاڤ! کاکە عیززەت ئەوا لە خوێنا خەڵتانە
چاوێکی لە بالای تۆیە، چاوەکەس دی لە ئاسمانە
ئەوان، ئەوسا خۆ کەعبەیان بەمەنجنیق داگرتەوە
ئەوان ئەوسا، خۆ عەلییان
بەخنجەرێکی ژاراوی لەناو هەردوو دەستی خوادا
داگرتەوە!
ئەوان، حسێنیان سەربڕی
حەقیقەتیان کرد بەحەلاج، هەزار سەگی پێ دەوەڕی
ئەوان، ئەوان، ئەوان، ئەوان
ئەوان، شمشێر بگرنە دەست، کەس بۆی نییە ورتە بکات
ئەوان، ئەوان کە شمشێریان لەدەستا بوو
هەر خۆیان خوان!
چێشتەنگاو بوو...

(١) دایە سۆلاف: قوتابخانەی دواناوەندی سۆلاڤە لە سلێمانی



ئەوە دڵی داخورپاوی خاتووزینە،
خوێنی عیززەت چراوگی بۆ هەڵدەکات
بەڵام دڵی داخورپاوی خاتوزینمان
چاوی لێک نا.
ژیان لەناو گەفەی سەگی تەرەکیودا چۆن دەردەبا
چۆن درەختی ڕەنج و ئاوات...
لەناو شالاوی ئاگرا سەوزەگەڵا لەبەر دەکات؟!
لە عەربەتی ئازەربتا بۆ کاک حسێن...
کێ قەڵغان و سوپەر دەبات؟
دایکە سۆلاڤ! وا کاک عیززەت پێڵووی قورسە
تۆ بەلێڵی بەدی دەکا
نوقمی دەریای ئارام دەبێ
ئەوا دڵی داخورپاوی خاتووزینیش ناکام دەبێ!
بەڵام، نەکەی دایکە سۆلاڤ، دەرگای دڵی خۆت دابخەی
دەبێ تیشکی خوێنی عیززەت لەبەر بکەی
ڕۆژگار جێگەی باوەڕ نییە، بیرت نەچێ
دەبێ تاقیەی خاتووزینیش لەسەر بکەی
ئەوانی سەگ! زۆر دەترسم وەکو (ثانوي الوطن)
خوانەکەردە، بتکەن بەجێ ئەمنی تازە
وا بزانن، ئاسمانی کورد، بێ هەڵۆیە و بێ شابازە!
بنو کاکە، بنو دادە!
ئێوە مەلی بەهەشتێن و
من ئەو ڕۆژەی ڕەببیە و خەش و ئەمن و ئاگر دەنێنە چاڵ
من ئەو ڕۆژەی دەیسووتێنن سیحری ئەنفال
دەمە گمەی ناو دەنووکتان
سروودی (ئەی ڕەقیب) دەڵێم لەسەر ئارامگای هەردووکتان
لەسەر گۆڕی کاک حسێنیش
سۆزی ئێزەدی دادەنێم
لەسەر سەوزەی شەهیدانمان
ئالای شیعرم هەڵدەکرێ.

هەر مەزرایە، بەرت لێ ویست
نایێتە بەر، سەر نەکرێ!

***

## بۆ مامۆستا حسێن

١٩٩١/١١/٢١

وتیان مۆمێ کوژایەوە
ئەستێرەیەک لە ئاسۆوە بێ دەنگ کشا
وتیان ئەمڕۆ بروسکەیەک لە هەورەوە
گڕی بەردایە کێوێکمان
سەرچاوەییێکی ڕۆشنی بەر مانگەشەو
ناچێتەوە سەر زێیەکمان
وتیان ڕۆژێک لە مانگێکا و
مانگێکیشمان لە ساڵێکا و
ساڵێکیشمان لە چەرخێکا لەیەک بڕان
وتیان ئەوا ساڵنامەییێک پەرەییێکی لە خۆی دڕان
وتیان دەرسێک پۆلی جێهێشت
سؤالێکی ئێجگار گرنگ
شی کردنەوەی تێدا تاسا
وتیان دەنگێک وا کۆڵی خۆی پێچایەوە لەناو باسا
ئەم قسانە لەناو هۆشما خڕ بوونەوە
چوون بەیەکا و بوون بەخەبەر
کاکە حسێنی ڕۆشنبیر،
کاکە حسێنی مامۆستا، چوو بۆ سەفەر
بۆ لای کۆڕی شەهیدانمان
بوو بە تەتەر
مژدەی دانێ، وا ئازادی گەلەکەمان
زۆر نزیکە
وەکوو نێوانی (عەربەت) و دێی (باریکە)
وەک نێوانی شیعر و دەروون



وەکوو مەرگی دیکتاتۆری ڕیسوا و زەبوون!
وەک نێوانی هۆش و گوێمان
وەکوو ئاوەدانی و دێمان
وتیان بەخێربێی کاک حسێن،
ئەمە دوایین سەفەرمانە
ئەم کۆچەمان بوو بەپەیام
پەیامێکی ئێجگار وردە
لە دەفتەری خواوەندیشا
تاپۆی سووری ئەم خاکەمان
سەرانسەری لەسەر کوردە!!

***

## ئۆف هەژاری

١٩٩١/١٢/٦

ئۆف هەژاری، ئۆف ئەو زامەی پۆرکی هەموو زامەکانی
ئۆف هەژاری، ئۆف ئەو دەردەی گرێی هەموو نامەکانی
ئۆف هەژاری، ئۆف ئەو بارەی لادیوار و تاشەبەردی
ئۆف هەژاری، ئۆف ئەو خەمەی خەمی گەورە و ئاهی سەردی
ئۆف هەژاری، ئۆف ئەو ناخەی هەموو دەردێکت تێدایە
ئەوەی خرایە جوغزی تۆ، هەزار کۆسپی لە ڕێدایە
ئەی تۆ هەژار بۆ هەڵناسی، بۆ ناپرسیت... کوانێ چارە؟
ئەوەی سەبری لە تۆ ئەوێ، با خۆی بێتە ژێر ئەم بارە!!

***

## کۆپلە شیعرەکان

١٩٩٢/٤/٢

١- ژنێک وتی: ئەرێ خاڵە دەنگوباسی ژیان چییە؟
حاڵی کوردان لەچیدایە؟
وتم... دادە، دڵنیابە هێشتا سەنگەر نەڕووخاوە
خۆ چیامان هەر سەرکەشە

ئەمڕۆ خەرمانی تێکۆشان
سوورە پوختەیە بێ خەشە.

٢- ژنێکم دی قەترانی بوو
سەرپۆشی ڕەش، کراسی ڕەش، پێڵاوی ڕەش
چاوی کەیلیشی هەر ڕەش بوو
کەچی لە تابلۆی سینەیا، ڕەنگی هیوا هێندە گەش بوو
دەتوت خۆری لێدراوە
وەهام دەزانی پوولەکەی ئەم دنیایە
بەبالآیا هەڵکراوە

٣- هۆ ژنینە... کە دایک بن
وەکوو تاجن لەسەر سەری هەموو پیاوێ
کە خوشکیش بن، براکانتان پەرژینتانن
کە هاوسەر بن، فەریزەی خوان لەسەرمانن
ئێوە وەرزی بەرەکەتن، ئێوە پیتی سەر خەرمانن.

٤- هۆ کچەکە، کە تۆ دەبی بەخاتووزین... کاکە مەمم
کە دەشبمە دەروێش وەلی،
توخوا بڵێ منیش شەمم
گوڵەکەی خۆم...
کە دەبیتە بەستەی ئەوین قوربانتم
ئەمن مەستی مەیی خەستی چاوانتم
کچە کوردە ئازیزەکەم، خەمت نەبێ
هەر منی کورد یار و کاک و باوانتم!!

٥- قەت پێت ناڵێم، قۆڵ هەڵماڵە بۆ سەر کارێ
گەر تۆم لە خۆم لا کەمتر بێ، بەردەبارێ
تۆ پێشمەرگەی، تۆ مامۆستای، تۆ ڕابەری
تۆ دەتوانی، پەچە لەڕووی گورگەنێری ئەم سەردەمەمان لابەری!
پێڵاوەکەت لەسەرسەری ستەمکارە
دەرگای دڵت دەکەیتەوە، هەزار شارە،



هەزار زارە!

٦- گوێ ڕاگرە، لەم کەلامە
دەڵێن نەزەرت حەرامە
وتم یاشێخ تۆ ڕات چییە
-ڕستەییێکی زۆر بێ تامە-

٧- سوێندم بەخەم، بەئازارم
بەکەژەی جوان و بەهارم
بەچاوی شارۆ و نیگارم
هۆ دایکە کورد، ئەندێشەمی
تۆ سروودی زامانمی
تۆ گلێنەی چاوانمی
تۆ مۆبەدمی قیبلەگامی
تۆ خۆت مەیی، تۆ خۆت جامی.
٨- لەبەر ئەوە تۆم خۆش ناوێ لێو تەنکی و دەمت پاراو
وەکوو شووشەی بەرباخەڵی پڕ لە گوڵاو
لەبەرئەوە تۆم خۆش ناوێ چاوت مەستە
باخی سینەت پڕ بەدەستە
لەبەرئەوە تۆم خۆش ناوێ قژت لوولە، گۆنا ئاڵێت
سی ساڵە من شاعیری تۆم، هێشتا دەڵێی چواردە ساڵێت
لەبەر ئەوە تۆم خۆش ناوێ پەنجەکانت دە دەنووکە نێرەکەون
گەلاوێژی چاوەکانت، نەک هەر بەشەو
خۆ بەڕۆژیش هەر ناخەون!
لەبەرئەوە تۆم خۆش ناوێ وەکوو سوێسکە لەنجە دەکەی
وەکوو کاراسکی سەرکاوان سەما لەسەر پەنجە دەکەی
لەبەرئەوە تۆم خۆش ناوێ هێڵی برۆت...
قولاپێکە نەرم و نیان، ڕام دەکێشێ
لەبەر ئەوە تۆم خۆش ناوێ، کە لالووت بی دڵم دێشێ
لەبەرئەوە تۆم خۆش ناوێ باڵا بەرزی یا خرپنی،
تۆم خۆش دەوێ چونکە ژنی
لەکتێبی ئەندێشەما تۆ ئایەتی

تۆ شازادەی پەریزادەی حکایەتی
تۆ نهێنی ئەم گەردوونەت لە چاوایە
ئای کە جوانی
مەمکی لەسەر زاری ساوا، نانی ناو باوەشی شوانی!
ئای کە جوانی!

***

## خەون و خەیاڵ

١٩٩٢/٥/١٢

هەموو شەوێک، کە خۆم دەخەمە توێی نوێن
خەیاڵی من بەرەو لای تۆ خۆی دەهاوێ
لەو چەرچەفەی کە تۆ داوتە بەسەر خۆتا، خۆی دەساوێ
دەچێتە ناو سەرینەکەت، هەناسەی تۆ هەڵدەمژێ
دەبێ بەگارد، خەوی ناخۆشی ناو جێگەت بۆ دەکوژێ
لە نێوانی مەمکەکانتا، خۆی مات دەدا
یەخەی سوخمەت دەکاتەوە
لەبەر گڵۆپی سفریشا لێفەت لێ هەڵدەداتەوە
وەکوو ساواییێکی گڕۆز، گۆی مەمانت دەگرێ بەدەم
بۆنی عارەقەی باخەڵت تۆزە تۆزە دەکات بەژەم
هەموو گیانت دەپشکنێ، لەسینەتا خۆی خڕدەدا
بۆ سبەینێ هەزار شیعر و وشەی جوانی بەقڕ دەدا
کە وەنەوزی چاوەکانت دەتەکێنێ و
کەمێ باڵی چاوت دەدەی
کە دەست دەبەی، تێبڵ لەمپی لای سەرینی بۆ هەڵدەکەی
خەیاڵی من دەپەشۆکێ و بۆ گرتنی
نازانیت دەست بۆ کوێت ببەی
بەر لەئەوەی خەو داتگرێ، دەگاتە نێو چاوەکانت
وەک شەهیدێ، هێدی هێدی تارای پێڵووتی پیا دەدەی
ئەوسا منیش لێی دەنووم و بەلێومەوە هەردەمێنێ
تامی خۆشی هەزار ئۆخەی!

***





## غەزەب

١٩٩٢/٦/٢١

یادت کە دەرگای دڵمی کردەوە
وەک مژدەی ناکاو هۆشمی بردەوە
گۆچانی عەشقم گرت بەدەستەوە
سەرلەنوێ وزەم لە خۆم بەستەوە
شیعری چاویشتم کرد بەسروودێ
هەر تۆنێکی ئەو بوو بەدروودێ
کە هاتمە دەرگات وەهام دەزانی
گوڵم ڕازییە ببمە قوربانی!
هیچ نەبێ دەڵێی ها ئەوە دەستم
بینێ سەرچاوت، بەس بڵێ پەستم
هیچ نەبێ دەڵێی ها تیلەی چاوم
تیرە و بەئەنقەست بۆ تۆی دەهاوم
کەچی گرژومۆن لێم لووتە لابووی
من شۆڕەبی بووم، تۆش ڕەشەبا بووی!
هەرزەو مناڵیت دەگرمە دڵم
من هەر لقێ بم، تۆی تۆپی گوڵم
غەزەب دەبارێ و من هەر لە دوو دێم
بۆ خوا خەندەییێک، ئەوا دەسووتێم
ئەینا ها چەقۆ، ئەوەش گەردنم
لووتەلایی تۆ، واتە مردنم!

***

## گرەو

١٩٩٢/٧/٢٠

سووتانی من بەردەوامە... تۆش ناپرسی لە حاڵی من
حاڵ و ماڵم موڵکی خۆتە، بۆ سەرنادەی لە ماڵی من؟!
ئەندێشەمە ڕاڕەوی تۆ، ڕەزمی لەنجەت شیعری منە
دەروێشێکی کەمەندکێشم، هەر ناوی تۆ زیکری منە
لە چلچرای چاوەکانتا، چرای خۆشیان دڵی منە

لەناو باخ و بەراویشتا، هەرچی گوڵی پشکووتووە
پشکۆی گەشی کوڵی منە
خۆ من زۆرم لە تۆ ناوێ...
تەنها گوڵی دەم و لێوتم بدەرەوە
داوا ناکەم هەرچی دەرگای باخت هەیە بیکەیتەوە
تەنها دەرگای باخی بەیان بکەرەوە
لەپێش دەمتام، نیگاکانت دابەزێنە،
بەس بڕوانە، بۆ سەرەوە
لە ئەتوونی وا عەشقێکام، کە خۆم لە بیر دەچێتەوە
دەتۆ خۆمم بیرخەرەوە
گرەومان کرد لەسەر ماچێ... تۆ نەتدامێ!
گرەو بکەین لەسەرگیانم، گرەوی وام لێ بەرەوە!

***

## کاروان

١٩٩٢/٧/٢٢

کە کاروانی ماندووی بادە، دەگاتە هەورازی سەرم
لە ناخمەوە دەکرێمەوە
وەک شۆڕەبی گوێ چەمی وشک بەسەرخۆمدا
دەشکێمەوە
لەڕێی خۆری واقیعماندا، تەپکەی بێژنگ دەنێمەوە
ئەو زۆ قورسە و منیش هیلاک
ئیتر بۆ خۆم دەتوێمەوە
کێ دەتوانێ خەبەر بدا... منی عاشق جارێکی کە
دەڕوێمەوە؟!

***

## سەفیر

١٩٩٢/٧/٢٢

کە تۆ بۆنی لێوی خۆتت دا لە لێوم
لەو ساتەوە من یەخسیرم
تۆ یارێکی بچکۆلانەی تووڕە و بزێو



من عاشقێکی زۆر ژیرم
وەکوو دەڵێن، تۆ سوڵتانی و من دەروێشێکی فەقیرم
تۆ کاندیدای ڕابەریت و ئەمن باشترین مودیرم
لە کابینەی وەزیرانتا هەتا دەمرم هەر وەزیرم
بێ نمەک نیم...
تامی بۆن و بەرامەتم لە چێژایە و دێتە بیرم
خۆ من بەسەر تۆ دا نیمە...
چونکە لەناو دەستی تۆدا هەموو ساتێ وەک هەویرم
بۆ هەر لایێک ڕەوانەم کەی لە هەندەرانی دووریشا
مۆری شاهانەی تۆم پێیە، ئەمن سەفیری کەبیرم.

***

## فریشتە

١٩٩٢/٧/٢٨

بۆ گۆرانی

مـن بـۆ شـــــــۆخێ چـاوەڕوانم
قـــوربانی بێ ســـەرو گـــیـــانم
پێـــشی دەرگـــای مـــاڵەکـــەیان
دەکـــــــەم بـەمـــــــاڵە بـاوانم
تـیـــــــشکی چاویم بـۆ دەهاوێ
دەبم بەنێـــــچـــــیـــــری ڕاوێ
من شـــایســـتـــەی دووچاوت نیم
بمکـە بـەقـــــــوربـانـی چـاوێ
کـــە شـــەو دابێ، خـــەیاڵمی
شـــەرابی عـــەشـــقی تاڵمی
هێندە ســـــۆزت لەدڵمـــــایە
مـن دەروێـش و تـۆ حـــــــاڵمی
مـن دەزانم چـەنـدێ جـــــــوانی
ئەســـتـــێـــرەی ناو گـــۆمی وانی

ئەگەر جوانیی ببێ بەخوان
لەگەڵ شیرینا هاوخوانی
کیژە کوردی گوڵ وەدەمی
هاوڕێی خەج و زین و شەمی
هەموو جوانان تاکە تاکەن
تۆ هەمووانی، تۆ سەرجەمی
عەشقم بۆ تۆ ئێجگار پاکە
عەشقی وەهاش بۆ تۆ چاکە
ئەگەر لاریت لە من بینی
توخوا بمبەخشە بەم خاکە
کوردستانە هێلانەمان
کوردایەتیش پێوانەمان
تۆش ئەو سروودە خۆشەمی
بووی بەگۆرانیی سەر، دەمان
عەشقی تۆ بۆ من ئالآیە
دروشم و بەخت و بڕوایە
تۆ فریشتەی ئاسمانیت و
گیانی منت لەدەستایە

***

## نووری پاک

١٩٩٢/٩/١٤

خۆشەویستیم بۆ تۆی ئازیز
کەس نازانێ چۆن چۆنییە
یاسای بوونە، لە گەردوونا
هیچ ڕووداوێ بێ هۆ نییە
تۆ زۆر جوانی و من ئەو شنەم
بۆنی جوانان دەکەم بەباڵ
گەڕیدەی شاری دڵانم
دەدەم لە دەرگای ماڵ بەماڵ



کە من جوانیی تۆ هەڵگرم
شارانی پێ ڕوونکەمەوە
نیگای سلاوم تێ بکا
چۆن وەڵامی نادەمەوە؟
لە جوانیتا دەتوێمەوە
لە بازنەتا دەخولێمەوە
من بڕینی عەشقی کۆنم
بەچاوی جوان دەکولێمەوە
شوێن پێیەکت بەردە مۆرەی
نوێژی شام و بەیانیمە
چی بفەرمووی هەر (لَبَیّكَ)ەو
چیم پێ دەکەی هەر ڕازیمە
ئەو ڕۆژەی تۆ بڕیار دەدەی
نوقڵی لێوت بدەی بەمن
کێوی ستەم لە دنیاما،
لەناخمدا دێنێ لەبن
بەفرمێسکم ئەو ئەندێشە
دەشۆمەوە نووری پاکە
ئازیز هاوتای خۆشەویستیت
تەنها گەل و بڕوا و خاکە!!

***

## خەون

١٩٩٢/٩/٢١

لەدەرگام دا... وتی: کێیە؟
وتم: خۆمم،
وتی: خەبەری نوێت پێیە؟...
یا، دیدەنیم بۆ تۆ سایەی سەرە ڕێیە؟
وتم شەوێ خەونم بینی:
من کەڵێ بووم بە زەردەوە،

دنیا هێلکەی بەرچاوم بوو،
شاخەکانم چنگیان خستە سینە و مەمکی ئاسمانەوە
چاوەکانم تا گەلاوێژ، ڕۆیشتن و گەڕانەوە
تۆ لەوێ بووی... لە زەردەوە من پرمانم،
وتم خاوەنی فرمانم
فرمانم دا گەلاوێژیان خستە پێشم
دەستم هێنا، بەرەو لای خۆم ڕاتبکێشم
وتت: نەکەی
دەست لە نهێنی خوا نەدەی
ڕقم هەستا و شۆقێکم گرتە ئاسمان و هات بەسەرما،
شەلاڵی عارەقەی خۆم بووم لە جێگاییێکی زۆر گەرما
کە پێڵووی چاوی خۆم پروان... گەلاوێژم لێ ئاوابوو
هەر بۆنی تۆ لە ناوابوو
هەر ناوی تۆ پڕ بەسرووودی زارم بوو
هەرچاوی تۆ کاروانکوژەی سەرشارم بوو
خەونامەکەت بکەرەوە
ئەم خەونەم بۆ لێکدەرەوە

***

ئای لەو شەوەی چواردە سەعات.
لەم شوێنەدا خۆم دابووە لا دیوارێ
وام دەزانی ئەم ئاسمانە دەریاییێکە و
بەسەر مندا دادەبارێ
وتم مردم، تازە چرۆیەک دەرناکەم
(ماوەت) وتی تۆ نامریت...
تۆ دەبیتە لێرەوارێ!

ئەم کورتە شیعرە لە ماوەتی وێرانە مانگی ئابی ١٩٩١ لەو خانووە نیوە ڕووخاوەدا خوێندمەوە کە لە ڕەوی بەهاری ئازادیی کوژراوا چەند هەزار کەسێکی سەر لێ شێواو شەوێکمان بەبرسێتی و لەژێر لێزمەی باران و سەرمادا بردەسەر.

***



### بۆ منداڵان
## قوتابخانەی ڕەفیق حیلمی

١٩٩٥

قوتابخانە ئازیزەکەم شانازیمە!
فێرگەی منە و جێگەی دڵخۆشی و وازیمە.
ناوی، ناوی مامۆستایەکی زانایە
تا کورد مابێ، ڕێزی لەناخی دڵدایە
ڕەفیق حیلمی، ڕابەری ڕێی بیری ڕوونە
بۆ ڕەشماڵی هیوای ئێمە وەک ستوونە
من نارینم(١) بەرچاو ڕوون و هیوادارم
خوێندن دەکەم بەسرووودی خۆشی زارم
بۆ کوردستان، ئاوەدانی و، بۆ کورد: ژیان
خامە چەک بێ و وشە ئاسۆی، دەمەو بەیان
من لەباخ و لە ئاشتیدا زوو پێدەگەم!
کام وانەیە کە زۆر قورسە لێی تێدەگەم!
من بولبولم، جێگەم سایەی چڵ و گوڵە
تەنها باخی پڕ لە گوڵان، جێی بولبولە
ڕەفیق حیلمی خۆی مامۆستا و خۆی ڕابەرمە
لەژیانما هەتا مابم تاجی سەرمە!

***

## شەهیدان مژدەی شەفەقن

من بۆ شەهیدان چێ بڵێم چاکە؟
کێ وەکوو شەهید بێ خەوش و پاکە؟
کەسێک بتوانێت گیانی ببەخشێت،
بەگەلی، مێژوو هەر بەو دەنەخشێت
بۆ نیشتمان و گەل و مرازی

(١) نارین: کوڕەزای خۆمە، قوتابی ئەو قوتابخانەیەیە.

هەر گیان بەخشینە مایەی شانازی
هۆ شەهیدەکان سەروەرن ئێوە
لەرێی خەباتا، رابەرن ئێوە
هۆ شەهیدەکان خاکتان پیرۆزە
عەتری مەزارتان گوڵی نەورۆزە
لەگەڵ باوەڕا ئێوە مەبەستن
ئێوە پەیام و ئیلهام و هەستن
لە کۆڕی عەشقی گیانبازەکانا
لە سۆز و نۆتەی ئاوازەکانا
شەهید! شابەیتی چامەی ژیانی
مژدەی شەفەق و ئاسۆی بەیانی!

***

## بۆ یادی میرزا مەنگوڕی

١٩٩٢/٧/٣٠

جارێک وتم ئەگەر رۆژێ چاو برێژم
کلم بەردی کێوە رەشە(١)
ئەگەر رۆژێ داوای ئاوی زەمزەم بکەم
ئەوە «قولە» و ئاوی روونی(٢)
ئەگەر رۆژێ وتم دەبێ خۆم لە ئاڵتوون هەڵبکێشم
گوڵەبەرۆژەی بیتوێنە دەیکەمەبەر
ئەگەر بووکی شیعر و وشەم داوای خشڵانم لێ بکات
گوڵە گەندمی پردانی دەدەم لەسەر
ئەگەر ویستم حەجێ بکەم، دەستم بۆ خوا هەڵببڕم
لەسەر مەزاری (مەنگوڕی) دێم بەچۆکا
ئەشکم بلووریی کفنەکەی بۆ لەشۆکا(٣)
ئۆخەی میرزا، لە ئامێزی کێوەڕەشدا،

(١) کێوەڕەش ئەو کێوەیە کە شاری ڕانییە لە دامێنیدایە
(٢) ئەو گۆماوەی کە لەناو جەرگەی شاری ڕانییەدایە ئاوی شار دابین دەکات
(٣) لەشۆکردنی هەر کاڵایەک یەکەم شتنیەتی



مەمکی بیتوێنت لەزارە،
لە داوێنی مەزارەکەت، جەژنی ئازادی و بەهارە!

***

## بۆ یادی پیری شاعیران
## میرزا مەنگوڕی

١٩٨٨/٢/٢٢

مامە میرزا،
پیری شیعر!
چەپکێ خەمی پیرۆزی خۆم
دیارییە و بۆت دەنێرم
مامە میرزا!
دیاریی من
پەیکی ئازاری عومرێکە و
وا بۆ لای تۆ رای ئەسپێرم
مامە میرزا،
دەروونی من...
جێ نزرگەی شاعیرانە
شاعیرانی وەکو ئێوە
مامە میرزا،
چاوەکانم
خۆرنشینی یادەکانتە
من تۆ دەبینم لەوێوە!
مامە میرزا،
دەخیلت بم
گریپەکم لە دلایە
بەشیعر بۆم دەکەیتەوە؟
مامە میرزا،
سوێندم بەتۆ
ئەگەر شەختەی ئەم زستانە

ڕەویەوە و بەهاریٚ هات!
خۆڵی دامێنی مەزارت
دەکەم بەسورمەی چاوەکەم
بەبیٚ هاوار،
بەبیٚ شکات!

***

## سەری ساڵی ١٩٩٦

*«شیعر بۆ منداڵانی کورد»*

ئەمڕۆ جەژنی سەری ساڵە
ئێمەش ماڵمان بیٚ ئەحواڵە
دێوەزمەی شەڕی ناوخۆ
لەناوماندا هێزی زاڵە!
ئێمە زەدەی هەژارین و
سەرما هەڵمان دەقرچێنیٚ
ڕۆژگار تاشەبەردی مەینەت
بەسەرماندا دەڕووخێنیٚ
گەلان ئەمڕۆ لەشادی دان
سەما و بەزم و هەڵپەڕکێیە
بەرەو هۆڵی گەرم و ڕووناک
ڕاکەڕاکە و پێشبڕکێیە
ئێمەش گەدەمان خاڵییە و
شەومان بیٚ شەوق و چرایە
لەسەنگەری بەرەوڕوودا
برا، نیشانی برایە!!
ئەگەر شەڕتان بۆ ئێمەیە
بەپێی بڵندگۆی هەڵەوەڕ
ئەوا ئێمە ئاشتیخوازین
چش لە ئێوە و نەفرەت لەشەڕ!
ئێوە شەیدای دەستەڵاتن
هەرچۆن بڕەخسیٚ تەواوە،



گرانییە، وێرانییە،
یاخود سێلاوی خوێناوە!!
خەونی ئێمە، ژیانێکە
بیٚ مەترسی و خۆش هەوایە
هەژارانیش لەسایەی دا
بەشی خۆیان پیٚ ڕەوایە.
کوردستانی ئاوەدانە
بەستە و سروود و ئاوازە
ئەوەی ژیان دەشێوێنیٚ
لە توخمی گورگ و بەرازە!
منداڵانی ئەم دنیایە
ئەگەر دەنگمان دەتان گاتیٚ؟
وەرن لەگەڵ ئازارماندا
بمێننەوە هەر بۆ ساتیٚ!
سەری ساڵە و گوایا جەژنە!
نیوەی گەلمان ئاوارەیە
هەر مەینەتی و خەم و ترسە
بەروبوومی ئەم بارەیە
نەفرەت لەڕووی پاوانخوازی
لەعنەت لە تۆش بیٚ، داگیرکەر!
بۆ نایەڵن لەم خاکەدا
کوردیش بژی وەکوو بەشەر؟!!

***

## سروودی خانی

*پێشکەشە بەلالۆ ڕەنجدەر بەو هیوایەی بیکات بەسروود*

١٩٩٥/٦/٢٧

دەرگای ئاسمان بکەنەوە
یەکەم، دووەم هەتا حەوتەم
من خەڵوەتیی ئەو ئەشکەوتەم...

کلاورۆژنەی دەنۆڕێتە گیانی خانی
بەزێڕ ناوی دەنووسنەوە لەسەر تابلۆی کوردستانی
ئەی شاعیری پایەداری ئەم دەڤەرە
تۆ نەک هەر خۆت...
داستانەکەی مەم و زینیشت ڕابەرە
عەشقێک کە تۆ کردت بەئایەتی جوانی
بەکوێرایی چاوی هەموو ڕۆمی و عەجەم
بانگی ئازادیخوازانیش کردی بەسەر دێڕی ژانی
ئەم کوردستانە سەرجەمی جێژوانی عەشقی تۆیە
دیوانی شیعر و نامەتە
پەڕەی بێگەرد و خاوێنی بەردەمی نووکی خامەتە
شیعری تۆیە ئاڵای ئێمە
ئاڵای خۆمان داناگرین
ئێمە تۆرەمەی خولوودین، بۆیە دەمێنین نامرین
خانی قوربانی نامەت بم، قوربانی خاکی یەکگرتووت
قوربانی عەشقی پیرۆز و ناوی هەرگیز لەناو نەچووت
هەر ئیتیفاقی کوردانە
دەرمانی دەرد و زامانە
هەر مرۆڤی کوردی دلێر
مەبەست و نیاز و سامانە

***

## چراوگ

١٩٥٥/١/٧

دڵم وەک مەل خستە سەردەست
هەڵۆی چاوت بۆی دانەهات
خۆم دەمەوێت قوربانت بم
بەختی ڕەشم بۆ کوێم دەبات؟!
من لەشەختەی بێ سۆزیتا
وا گیانیشم بەستوویەتی
بۆچی تینێک ناکات بەتیر
خۆ چاوت خۆی خستوویەتی؟!
من مەولەویم و کۆماسی
دەروێش وەلیم و کاکە مەم
خۆت بەولاوە کێ شایانە
تامن هاواری بۆ ببەم؟!
لەمەیکەدەی ئەندێشەدا
پڕم وەکوو سوراحی مەی
ئەم مەیکەدە وێران دەبێ
ئەگەرجارێ سەری نەدەی
چراوگێکم بۆ هەڵکە
دەستەچیلەت ئەشعارم بێ
ڕێناست لەم دەیجوورەدا
ناڵەی سۆز و ئازارم بێ
من هەندێکم لەخودی خۆت
بۆ ببمە پۆڕێکی خوراو
نەیجەی قامیشەڵانی تۆم
مەمکە بەنایی دابڕاو
کەخوا وەکوو دیارییەک
تۆی خستە ناو باخی گوڵان
وەک بولبولێکی کوردی خوێن
منیشی خستە سەرچڵان

***

## هونەری جوان

(بۆ منداڵان)

١٩٩٣/١٢/١٣

هونەر تابلۆ و ئاوازە
شیعر و سروود و ڕازە
هۆرە، گۆرانیی شوانە
شمشاڵ، بانگی ژوانە
دوم دوم دوم دەنگی تەپڵە

چەپ چەپ چەپ هارەی چەپڵە
دن دن دن عوود و تارە
وژ وژ وژ بای بەهارە
بولبول خۆشخوانی باخە
بەستە هەڵچوونی ناخە
سۆزیش بای بەیانییە
قەتار خوڕەی کانییە
بەهار شایی سروشتە
کوردستان... ئەم بەهەشتە
سەربەست و ئاوەدان بێ
بۆ هەژاران باوان بێ
ئاشتی خەونی هەمووانە
هونەر بەهرەیە و جوانە
من هونەرم خۆش دەوێ
جەختێکە بۆم هەڵکەوێ.

***

## بۆ ئافرەتان

١- وەکوو دایک سەرم لە ئاستی پێتایە
وەکوو خوشکیش سەرم قەڵغان
ناخم سوپەر، چاوم دۆعای چاوەزارە
وەک خۆشەویست، لەناخمدا هەر ناوی تۆبە نازارە
کە هاوسەر بی، بەڕۆح یەکین
جەستە دوانین...
کە بووین بەباوک و دایک خوا ئەزانێ چەندێ جوانین!

٢- باشە وەرن چاوی کچێ بخەنە نێو شیعرێکەوە
گوڵێک بێنن بیکەن بەیەخەی باخاندا
ئێوە بڵێن کامیان جوانە؟!
پیری موغان، بۆ دەروێشان کامیان دەکاتە ناو جامێ؟!
کامیان دەکاتە سەروێردی نوێژی سوبح و زیکری شامێ؟!



کامیان دەبێ بەتەوار و لەسەرەوە دێتە خوارێ،
وەکوو سۆزی وەلی بۆ شەم
بەسەر شیعرا دادەبارێ؟!

٣- بێن کوردستان دۆڵا و دۆڵ کەین،
بێن مۆبەد و مەیکەدەمان هەمووی چۆڵ کەین،
بێن بگەڕێین لەفەرهەنگی پێداویستا، چی پێویستە
بینووسین و ئەزبەری کەین...
بەبێ ئافرەت بۆچی چاکە؟
ئافرەت جووتی هەموو تاکە!

٤- ئافرەتەکان ئەوەندەی من خۆشم دەوێن
ئێوە جوان بن!
ئێوە هەموو خان و مان بن!
ئێوە جامی لێوانە بن،
ئێوە کێشی شیعرەکانی من و وەلی دێوانە بن!
ئێوە دایکی ڕۆڵە کوردی سەربزێو بن،
ئێوە سروودی سەر لێو بن.
ئێوە هاوسەر، ئێوە بووک و ئێوە دڵدار
من و شیعریش پۆیلانەین و بەسەرتانا هەڵدراوین!
من و شیعریش چرایەکین لە باخانا هەڵکراوین!
بەژنی ئێوە درەختێکە ئێمەی مناڵ
وەکوو سروودی گرۆگاڵ
هەڵدەزنێین بەقەدتانا...
پەل دەهاوین!
ئێوە نهێنی ئەم بوونەن، ئێمە بەئێوەوە ماوین!

٥- پەنجە بێنن بەسەر دڵما
پەرچەم بدەن بەسەر گوڵما
دەبم بەچامەکەی ئێلزا
لەبەر لێژگەی چەنە و کوڵما!

***

## خەڵوە

١٩٩٣/٧/١

که دەچمەوە نێو ناخی خۆم
ئیتر دەبم بەخەڵوەتی و گۆشەگیری ئەو دەبەرە
تەنها مۆمێکی داگیرساو لەسەر ڕەفەی خەم لێنیشتووم
دانراوە... بوونی تۆیە!
جار جار وەها گەورە دەبێ لەبەرچاوم
دەڵێی –نامەخوا– ئاسۆیە!
من و خەڵوەم دەبین بەیەک...
ئەو دەفتەری فرمێسکی من دەکاتەوە،
ئەو خوێواوی زامانی من دەخواتەوە،
منیش لەوێ کوڕنووش دەبەم
بۆ هێزی باڵای عەشقی خۆم؛
دەتوێمەوە لە خودیدا
دەتوێتەوە لە خودمدا
ئەو کەسەی دێت من ببینێ ئەو دەبینێ
ئەوکەسەی دێت ئەو ببینێ من دەبینێ!
عەشقی باڵا، عاشقیشی هەر باڵایە
ئەم نهێنی ئەوی پێیە و ئەو نهێنی ئەمی تیایە!!
هۆ خەڵوەکەم. هۆ ناخی خۆم
دەرگەی خۆتم لێ دامەخە
چونکە هەر کات ئەندێشەیێک، دەمخاتە سەر
هەردوو باڵی
ئیتر دەبم بەڕووبار و، دایکی ڕووباریش دەریایە
دەریا... ڕازی کانی و جۆگە و ڕووباری شێتیشی تیایە.
من لە گێژاوی شێتیدا، بانگی عەشقم ئاشکرایە
نەدەستگیرم لامەبەستە و نەپێویستم بەچرایە!
دەچمە شوێنەواری (ئەلەست) بۆ وەڵامی خۆم دەگەڕێم،
بیرم نایە من چۆن وەڵامم دایەوە!



تەنها بۆ بارانی ئەوین شەقاری من کرایەوە
وشکەساڵی شیعر و ئەشکم هەر بەباران پاراو دەبێ
(شان)ی شیعرم جمەی دێت و چاوم زێگەی هەتاو دەبێ!
من شەرابی کووپەی دێرین لەگەڵ شیعرا تێکەڵاوکەم،
لە چاوی تۆ دەیخۆمەوە.
شوێنەواری ئەلەستەکان بەو مەستییە دەشۆمەوە!
لە حوزورام، پێکی (رەجعە)م لەدەستایە،
ڕێگەم دوورە... هەر بەتوێشووی ماچێکی تۆ، ئاغر ئاغر دەڕۆمەوە!
ڕۆیشتنەوەم بۆ خۆی زادی هاتنەوەیێکی لە نوێیە،
کەسم ناوێ خۆم شارەزام
خاچ لە کوێیە و ماچ لە کوێیە!

***

## بۆ منداڵان

منالێنە وەرن وەرن
باسی گوڵە ڕەنگینەکان بۆ لای هەنگەژاڵان بەرن
خەبەر بدەن وا بەهارە
چرۆ پۆپەشمینی دارە
هەڵاڵە تارای چڵانە
ئاورنگ بریسکەی گوڵانە
کە باسی گوڵ کەوتە زارێ
بەسەر باخا هەنگ دەبارێ
لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ بازدانە
لەگەڵ گوڵان خۆسازدانە
پەیامی گوڵە نێرینە دەبەن بۆ مێ
بەلێو و دەم بەباڵ و پێ
زیندەوەریی هەر وا بووە
لە نێر و مێ پەیدا بووە
گوڵیش بۆن و بەرامەی خۆی
دەدا بەهەنگ و دەیهێنێ

لەناو قوڵکەی شانی پاکا دەیان چێنێ
ئەوسا دەبێ بەهەنگوین و ماڵ ئاوەدان
دەرمانی دەرد، دەرمانی ژان
هەنگوینی نێو هەنگەژاڵان
زۆر بەکەڵکە بۆ منداڵان.

***

## وەرن

*بەڕەوتی سوارچاکانی شیعر*

١٩٩٤/١١/٥

وەرن وەرن کۆببنەوە
شێختان پیری خەراباتە
شێختان پیرێکی سەربەستە
شێختان پیرێکی بەزاتە!
لە پێش دەما پێکی پڕم
ئامادەیە بۆ هەڵدانی
ڕەقیب، ئادەی ئەگەر وەک من
لەڕێ و ڕەسمی وا دەزانی!
من چاوی جوان دەکەم بەجام
من شیلەی لێو دەکەم بەمەی
من ئەم پێکە چۆڕبڕ دەکەم
هەموو دنیا بڵێ نەکەی
کاتێ کە چاو دەبێ بەجام
کە ماچی دەم دەبێ بەمەی
ئیتر کافری موتڵەقی
بۆ ئەم بەستە سوجدە نەبەی
لە پێش دەما جام و مەیە
خۆیشم دیوانەی ئەم خەمەم
دەمیش دەمی عەشقی نوێیە
من کاکە مەمی ئەم دەمەم
بۆ ناو ئاسمانی چاوانم
کۆتری چاوانت هەڵبدە



جێ وەنەوزت باوەشم بێ
سەگی دووروەڕ بەر پەڵ بدە
لەم حاڵەما تۆ حەڵاڵی
حەڵاڵ و حاڵم یەک شتن
زمانیشم ببڕنەوە
بۆ حاڵی وا دێمە وتن
سروودی نوێم مەی و جامە
کۆڕم کۆڕی عەشق و خەمە
من دەمەوێ گردی گیانم
هاوسەفەرەبێ بۆ ئەم ژەمە
کە کوردستان گوڵی وەک تۆ
بدا لە زوڵفی ئەشعارم
لەم عومرەشا بمدوێنی
وا دەزانیت هەرزەکارم!
گەر میوانی ناوەختەش بم
لە دەرگام دا بمگرە خۆت
ڕۆژێ قوربانیت پێویست بێ
بێ یەک و دوو، من دەمرم بۆت

***

## بۆ شێخ محەمەدی خەطیب

علیکم بۆ کێ تۆ سەلام نەبی؟!
جەماعەت بۆچی، تۆ ئیمام نەبی؟!
تۆ خەتیب نەبی، گوێ ڕاناگرم
ئالای ئەم خەمە قەت داناگرم
میحراب و مینبەر بەتۆوە جوانە
یەکەی لازمی بۆ ئەو دووانە
بۆ هەموو نوێژێ قەصد و تەکبیری
بۆ ئایاتی خوا شەرح و تەفسیری
تۆ بە(إنما) لە خودا ترسی
بەشیت لە معنای (ئاية الکرسي)

ئیمامی هەموو ئیمامانی تۆ
پەناگەی سەدای (الأمان)ی تۆ
فتبَّت یدا ذلك الوغدِ
لە نوێژی عیشای ئەو شەوەی کردی
عیشای کەم و کۆ بۆ مەغریب بێنن
میحراب چۆڵ بکەن، مەلا ، مەمێنن
کوانێ (إمام الأئمة) کوانێ؟
بەرەو حەقیقەت بەچاو بڕوانێ
(صرخه الحق)ي (الله أكبر)
بۆ عیباد الله بکات بەڕابەر؟
فتبت یدا هذا اللئیمِ
کوێرایی و کینە، بوون بەنەدیمی
بۆ کوشتنی تۆ ئەو دەستی داگرت
لای وابوو جمەی تأریخی ڕاگرت!
نووری ئیمانت دای لە چاوانی
چاویشی کوێر بێ بەخۆی نەزانی
تۆ جوابی (بلی)ی پرسی (ألست)ی
پشت بەقائلی (ألست) دەبەستی
بەڵات لێ دووربێ بمێنی بۆمان
خۆشەویستتری لە خۆم و خۆمان!

***

## ڕۆیین

١٩٩٤/٤/١٠

کە تۆ رۆییت دڵم ڕۆیی
مەگەر ئەم دەرد و ئازارە بگاتە ئاستی بێ تۆیی!
هەموو ڕۆژێک دەیان شیعرم
دەخوێندەوە لە چاوانتا
لەژێر کەپری قژی خاوتا کەتۆ دەتدا بەسەرشانتا
بەبۆنی تۆ هەموو ناخم دەبوو بەشووشە بۆ عەترێ



سەرم سوڕمابوو ئەو باخەت
دەبێ کەی دەستی بۆ ببرێ!
خۆ تۆ نەتهێشت بەرەو گۆنات
پەپوولەی ماچی خۆم هەڵدەم...
لە باخی سینەتا دەستم وەکوو کاراسکی شێت بەردەم!
دەسووتێم و کەچی تۆ هەر بەدەردی من هیچ، نازانیت
لەلام حەیفە هەتا ئێستە کە نازانیت چەنێ جوانیت!

***

## خوازیار

١٩٩٥/٥/١٣

تۆ منت کوشت، خوا نەیکوشتم
جام لە دوای جام شیعرت ڕشتم
وەک داستانی ئەفسانەکان
دەیگێڕنەوە پشتا و پشتم!
من چیم لە تۆ داوا کرد و
تۆ چۆن وەڵامت دامەوە!؟
تۆ وەک ئاهم تاوت سەند و
من وەک بەهەشت کرامەوە!
من خوازیاربووم نوقڵی لێوت
بکەم بەمەزەی عومری تاڵ،
لەسەر زاری ساوای جوانیت
ببم بەنەغمەی گڕ و گاڵ!
خۆ من دەمویست لەسایەتا
پەیامی شیعرم بگاتێ...
ژیانم وا شیرین ببێ
ساڵم ببێ بەساعاتێ!!
بەخێرهاتی و بەخێر بڕۆی
پێی قایلم هەرچی بکەی،
زاری برینم دێتە سوێ...
دەست لەهەر کوێیەکم بدەی!

لەگەڵ عومرا کە ناکۆکم
دەڵێم نەکوو دڵ بخەوێ،
دڵی عاشق تەختی یارە...
بێ دڵ چۆن عەشق دەسکەوێ؟!

***

### *بۆ برای کۆچکردووم باوکی دوو شەهیدە جوانەمەرگەکان کاک شێخ عثمان قەرەداخی* (١)

لەنوێ شیوەنمە، شیوەنمە ئەمڕۆ
بۆ (ڕێبوار) بگریێم، یا بۆ یادی تۆ!؟
ئەوە (سەردار)ە بانگ دەکا بابە...
چین چین ئەم گڵە لەسەر من لابە!
بابێم و بگریم لەگەڵ ڕێبوارا،
بەسەر دوا گوڵی وەرزی بەهارا...
لەگەڵ مەرگی تۆ ئەویش هەڵوەری
ئەی باوکی خەمی دنیای سەروەری!
هۆ کاکە عثمان سەری کێ شین کەم
دڵی کام تاوان پڕ لە برین کەم؟
تاوانی خوێنی سەرداری نۆدەم؟
یا ڕێبوارەکەی ڕێگاکەی عەدەم؟
ئەو گڕەی چووە ناخ و هەناوت،
زامێک کرایە دڵی سووتاوت
پیرەمەگروونێ دێنێتە خوارێ
بەرقی ڕۆچوونێ دەدا لەشارێ
ئیتر چۆن خورپە دڵت دانەخات؟
بۆ شوعلەی ژینت زریان هەڵنەکات؟
هۆ کاکە عثمان، بۆ بەجێت هێشتم؟
وەکوو وەعدی خوا هەر چاوەڕێتم!

(١) کاک شێخ عثمان ڕۆژی ١٨/٤/١٩٩٥ بەدەردێکی لەناکاو سەری نایەوە بەداخ و کەسەری شەهیدکردنی سەرداری قارەمان بەدەستی فاشییەکانی بەعس و شەهید بوونی ڕێبواری تێکۆشەر و ئەندازیار و ئەدیب بەدەستی تاوانبارێکی ناوخۆ ساڵی ١٩٩٢ لە سلێمانی.



(بەختیار) تینی ڕێ و هەنگاوت بوو
گریکی دڵ و سۆمای چاوت بوو...
چۆن بەجێت هێشتین، تۆ چۆن دڵت هات؟
تاکەی من بڵێم هەیهاتە هەیهات؟!
ئەی هاوڕێی عومرم، ئەی هاودەمەکەم،
ئەی جگەر سووتاو، ئەی هاوخەمەکەم،
سەفەرت دوورە و خۆت پێچایەوە،
گرێ کوێرەی خەم هەر نەکرایەوە.
دڵم وەک دڵت کوورەی ئاگرە
کە دڵ داخورپا، دنیا ئاخرە.
ئا لەو چرکەدا کە دڵت وەستا
چ قیامەتێک بۆ ئێمە هەستا!؟
من هەر ئەو داخە دڵم داخ دەکا
زامی کولاوەم پڕ لە زاخ دەکا
من لە ژوور سەرتا کاتی مەرگەسات
وەک تۆ پەیامی مەرگم بۆ نەهات!؟
ئاخۆ کەی دەمرم کێ دەگری بۆ من!؟
ناوم دەچێتە نێو ناوانی ون؟!

***

## بۆ مامی گەورەم، مامۆستای مەزنمان مامۆستا عەبدولکەریم

١٩٨٩/١١/٢٥

هەرچی حەرفم هەس دانسقەی دڵمە
باخ و بەراو و گوڵزار و گوڵمە
هەمووی پێشکەشی دەست و خامەکەت
خاکی بەری ڕێی سوبح و شامەکەت
دەردت لەگیانم کەوێت شیفایە
شیفای دەردی من لەم حەولەدایە
نۆژدار... بتەوێت، هیچ پرسی ناوێ
هەردوو چاوەکەم دەدەم بەچاوێ

با مـــــامی گــــــەورەم چاوانی ڕوون بێ
بۆ خـــووا چیـــــیـــە (کن فـــیکون) بێ.

***

## کوێربێ بووار، بڕووخێ پرد

١٩٨٧/٤/٢٢

«ڕیگن» چۆنی؟...
ئاخۆ ئێستەیش شێرپەنجەکانی ناوسکت پەل بەسراون؟
ئاخۆ چرای دەوروبەری پەیکەرەکەی (نیویۆرک)یش هەڵکراون؟
ئاخۆ ئێستەیش بۆ «زەخارۆف» «کۆشکی سپی» قوڕ بەسەرە؟
ئاخۆ ئێستەیش «مەدام کارتەر» بۆ سنووری «ئەفغانستان»
کلاش لەپێ و بارەبەرە؟
ئاخۆ مافی توخمی مرۆڤ لەبازاڕی «واشنتۆن»دا، بە بەهایە؟
فرۆشیارە چاوسوورەکان «نیۆترۆن»یان لە چنگدایە؟
موغی کۆنی –سی. ئای. ئەی–تان
فەرمایشی «مەکارسی»یان لەسنگ دایە؟
چۆنی چاکی؟
ئاخۆ ئێستەیش هەر خەریکی سەرتاشینی بێ دەلاکی؟!
ئاخۆ ئێستەیش بۆ لاسایی،
هەر کاوبۆیەکی چالاکی؟
چۆنی چاکی؟...
تۆزێک گوێتم بۆ ڕاگرە، ئەگەر وەڵیای باب و داکی،
با لەتونێلی گوێتەوە دەنگم بڕوات...
بێزاری بێ نەکو شکات!
ئەی واعظی بێ تەیلەسان... وا نەزانیت
من شاعیرێکی زۆر وێژم،
یا بەدمەستی مەیخانەم و پەل ئەکوتم، مەی ئەڕێژم!
من هەر ویستم مستێ خۆڵی دەشتی دڵم،
هەڵدەم بەرەو دەم و چاوت،
بەرەو کەمپی گەشت و ڕاوت!



گوایا ئەڵێن فەخامەتتان گوربە و سەگتان زۆر خۆش ئەوێ!
ڕاپۆرتێکی سەیرم پێیە:
٣٠ فڕۆکەی «تورگۆت ئۆزاڵ» دایان بەسەر ٣ دێی کوردا
دێکان ئێستە وەک ژیلەمۆن!
دڵنیابە کەسیان نەمان وەکوو شاتێلا سەگ بخۆن!
– لەعنەت لەتۆو هەزار لەعنەت لەو کەسانەیش کە پیاوی تۆن–
وا بزانم ئێوەی بەڕێز، هەتا ئێستا کورد ناناسن!
وا بزانم ئێوەی بەڕێز، ئێجگار دژی دەنگوباسن
٣٠ فڕۆکەی تۆرگۆت ئۆزاڵ
دایان لەباڵ...
وەک تارمایی ڕەشی خەیاڵ
ئاگریان دا، ئەزانی چی؟... بێشکەی مناڵ!
دەنگوباسی «پارتی کار» و قوتابخانەی ئەم سەری ساڵ!
ڕاپۆرتێکی سەیرم پێیە:
مامە «کاوە»م دی لەخەوا،
«ئەژدەهاک»م دی لەشەوا
ماری شێرپەنجەی سەرشانی، ئەیان لووران لەبرسانا
ئەیان فیشکان لەترسانا
«لۆلۆ» و «گۆتۆ» چوونە «قۆپی»
«ئەسکەندەر» هات «داریۆش» تۆپی!
خەو هێنامی، خەو هێنامی...
بانگی «ألله اکبر»ە:
زەید و عەمرە یا عومەرە
ئەوا «بابک»ی خوڕڕەمی سەرلەشکرە
سوارچاکێکی پێ داگرە.
خەو هێنامی، خەو هێنامی
وا لەشکری «بەبە» و «ڕۆمی» بەیەکا دێن
شێخ و مەلا دەستەویەخەن!
کەچی هەموو هەر فێستەکەی «مەلای خەتێ» لەسەر ئەکەن!
خەو هێنامی...

ئەم دەربەنە «بازیان»ە
ئا ئەم گوندە «ئاو باریکە»
ئەم دوورگەیە «سەرەندیب»ە و
ڕێڕەوی خەو چەند تاریکە؟!
خەو هێنامی کش مەلیک بوو،
وتمان: ئۆخەی
چاوسوور وتی: نەخۆی، نەکەی!
خەو هێنامی خەم ئەباری،
چیا دەشتی کرد بەباری
خەڵکی لەخۆیان بێزار بوون
هەزار فسفس پاڵەوانیش بۆ سەرقفڵانەی دووکانێ
سەگی هەوشاری ناو شار بوون!
خەو هێنامی... ئاشمان خەواند
دەستمان خستە سەر دەم و دڵ،
چاوەڕێ بووین ئەمە خوایە دەروونێکمان بۆ بێتە کوڵ!
خەو هێنامی... لوتکەی «قەندیل» وەکوو چراوگ هەڵکرا
وتیان وەرزی ڕەشبەڵەکە
با هەڵپەڕکێ شێخانەبێ،
نەء، هەڵپەڕکێ کوێخانەبێ
هەڵپەڕکێمان هەرچەپییە، نەء ڕاستەیە!
لەم عاستەیە، لەو عاستەیە!
خەوم زڕا، خەونم ڕۆیی
زەماوەندی «بناویلکە» بوو بەشانامەی ناوخۆیی
بای دەستی دێو دای لە ئێمە بۆیە خۆرمان لێ هەڵنایە
یا وەک ئەڵێن ئەمیش هەمووی ڕەزامەندی زاتی خوایە!
یا کورد ئەبوو وەکوو گەلان خووای بۆ خۆی بانگ کردایە،
ناوی کوردی لێ بنایە،
برا گەورەی نەویستایە!
بوون بە«مارەکەی شێخ هۆمەر» وا لە گەردنمان ئالاون
بە ئاییینا چوونە سەرمان، جووتەیان گرت لەوێ زاون!


تەشتە ناتۆرەی گیراوە ئەکەن بەسەر جێ و ڕێماندا
ئەگەر هەنگاوێکیش بنێین پاژنە ئەنێن بەپێماندا.
چۆنی ڕیگن؟... کوردت ناسی؟
ئەڵێن پیاوێکی سەر ڕاسی!
توو چاوەکانی زەخارۆف لەسەر باڵی تورگۆت ئۆزاڵ
ملت درێژکە وەکوو داڵ،
لەوڵاتی عیشق و خەما...
لە وڵاتی خۆڵ و تەما
لووتکەی شاخە بڵندەکان ئەبڕنەوە!
ئاوڕووی تکاوی حوزەیران لەلای ئێمە ئەکڕنەوە!
ژاراوی مەرگ ئەکەن بەسەر ئاو و گڵا،
ئەکەن بەناو چاو و دڵا
هەر مناڵە و لانکەی ئەبێ بەئاگردان
هەر دڵدارە و ئاگر لە خەونی بەرئەبێ
هەر ئافرەتە و پیتی ئەڕوا و وەک داری زڕ بێ بەر ئەبێ!
هەر سرووده و بەردە لە پارووی ناودەما
هەر فرمێسکە و ئەکرێ بەسەر چاشتی خەما
هەروا گوندە و هەڵ ئەپڕووکێ و شوێن ون ئەبێ
هەروا پیاوی کەڵە پیاوە و ملکەچ ئەبێ و شەرمن ئەبێ
هەروا بارگە و بنەی خەمە لەسەر پشتی ڕێی ناچاری
گوندی وێرانە جێ دێڵێ، بەڵکوو بگاتە ناو شاری
شارویرانە بۆ کوێ ئەڕۆن!
وەکوو بڵێی ئەم کەسانە دەست لەژین و ژیان ئەشۆن!
لەگێژاوی گەرداوێکی وا سامناکا دێن و ئەچن
کەس نەی دیوە، نەی بیستووە
کام «هۆلاکۆ» نەخشەی وەهای ڕاخستووە؟!
کام خوێنڕێژی جانەوەریش ئەم بەیاخەی هەڵکردووە؟
لەگەڵ شاخا بجەنگێت و لەگەڵ باخا بجەنگێت و کانیاوەکان کوێر کاتەوە
هەموو بانە کێڵراوەکان بەژار و ژەنگ نێرکاتەوە
باوک لەجیاتی کچەکەی دایک لەجیاتی کوڕەکەی...

ئەکرێن بەبارمتەی – هەتا
کوڕ کوژراوە و کچیش ئاخۆ سەرمایەکەی ئەبێ بەپێکی کام خەتا ؟!
کوردێک کە دێت لەسەر پەڕەی مێژووی هەموو خوێنرێژەکان
پەنجەی سووتاوی دائەنێت...
کە بیر لە خۆی ئەکاتەوە...
تاسێکی قووڵ ئەی باتەوە
«هیتلەر» ئەبێ بەفریشتە و هەزار ڕەحمەتی بۆ ئەچێ
دروشمەکانی «گستابۆ»یش بۆ پلێپلەی منداڵ ئەشێ
ڕیگن... توو چاوی زەخارۆف ئەمە نانە، ئەمە دۆیە ؟
لەعنەت لە تۆو لەو کەسانەیش ڕووی باوەڕیان هەر لە تۆیە!
ئەمجارەیان خەو نابینم
من خاوەنی بەسوێترین ئێش و ئازار و برینم
برینی من ئێجگار قووڵە
داستانێکە بەیتەکانی پتر ئەبێ لەسەد هەزار!
لەکاوەوە دەستی پێ کرد هەتا گەیشتە «هەندرێن»
پاشارێکانی زۆرداران هەموو بوون بەگۆماوی خوێن
ئەڵێی کورد بێ ئازار ناژی! وا سەلماوە ئازار باشە ؟!
با خەڵک نەڵێن میللەتی کورد ئەمسەرەوسەر هەمووی جاشە–
ئەی دۆستەکان!... ئەو گەلانەی پشتمان بەئێوە بەستووە!
زۆر نەنگییە سەنگ و مەنتان
جل و بەرگی بازرگانیان لەبەردایە!
هەودای شیعری عیشقی «لەنین» لە بازاڕی سیاسەتدا
ئەبوو پەتکی لێ نەخرایە
من وا داخی ئەم دیاردەیەم لەدڵدایە
من مەتەڵی وەها چەوتم بۆ هەڵنایە
خوێن ڕشتنی گەلی کوردیش وەکوو خوێنی گەلانی تر ناڕەوایە
ڕەگەزپەرستە دێزەکان لەناخەوە سوێندیان وایە
ئەڵێن نابێ گوڵاڵەیەک خونچە بکات لەو چیایە!
بۆچی سینە و بەرۆکی کورد، چەپکە گوڵاڵەی لێ نایە ؟!
کێ وەکوو کورد زریێی چیا و کەژ و کاوی لەبەردایە ؟



داد ئەی مرۆڤ، داد ئەی گەردوون، داد ئەی مێژوو
داد خودایە!
بۆ کەس نییە بڵێت مەکەن؟
بۆ کەس نییە بڵێت بەسە ؟
بۆ لەبەختی ئێمەی کوردا، ئەم دنیایە هەر هەرەسە ؟!
ئێمە لە خوێن هەڵکێشراوین؟
ئێمە بەخەم داڕێژراوین؟
ئەی بۆ لەسەر تابلۆی ژیان
لەلای دۆستیش هەربێ ناوین؟!
هەزار ساڵە دەرد ئەو دەردە...
هەموو وەرزێ، قڕانی کورد بۆ دوژمنان هەر لەبارە
بەڵام نەبووە نەبیسراوە وەکوو قڕانی ئەمجارە!
با هەر تیژ بێ لووتکەی چیا و
دەبا «هەزار بەهەزاری» کێوەکانمان لێژتر ببێت
تا، دوژمنی قین لەدڵمان حۆلتر ببێ و گێژتر ببێت
لەجێی سنان قوزەڵقورد بێ
چەمی هاتوو سامی هەیە بووار نەدات و بێ پرد بێ!
کوێر بێ بووار، برووخێ پرد!
دوژمن دەستی ژاراوییە، (ئاوڕوو چوونە) مەی قۆزنەوە
سەد ماشەڵڵا ئاهەنگ گەرمە...
ئیتر پردی بۆ مەبەستن، بوواری بۆ مەدۆزنەوە
ئەوجا شیعر و بەستەی کوردی ئاڵای گوڵاڵە سوورەیە،
نانی گەرم و هەڵاتوویی ئەم ئاگر و تەنوورەیە.

***

## شەو

شەو بوو بەدێو، خۆی دا بەسەر شان و ملما
نووچم برد و چۆکم دادا
خەوێکی قورس درا بەسەر چاوەکانما
لە خۆچووم و بۆ خۆم ڕمام

خەونێکم دی لە ولاتی ئەشک و خەما
فرمێسک خومی دەگرتەوە...
بۆ من بیکەم بەسەر سەرما
منیش شیعرێکم ڕواند و دامە دەستی تین و گەرما

***

## دایە حەوا

لەسەر لووتکەی شاخێکەوە
هەردوو چاوم پێیان خزا
سەر بەرەوژێر هاتنە خوارێ
هەتا بوون بەدوو خاڵی ڕەش، بارینە بەر پێی دیوارێ
سەردەشت وتی ئاوارەکان...
ئێوە لە کوێوە هاتوون و بۆ کوێ دەچن؟
وتیان لەخاکی خەمەوە کۆڵ بەکۆڵین
وتیان لە خاکی خەمەوە تۆز و خۆڵین
مردن توێشووی سەفەرمانە
ئەشک و دووکەڵ دەخۆینەوە
تەن لەگێژاو و بۆرانی کۆچی ڕەشدا دەشۆینەوە
دەچین بۆ لای دایکە حەوا
لێی دەپرسین لە میراتی باوە ئادەم
ئێمە چیمان پێ براوە؟!
سەردەشت وتی: هەر مەپرسن
داوی ستەم لەو ڕۆژەوە ئەو دەیرێسێ و لەسەر ئێوە هەڵکراوە.

***

## بەدمەست

١٩٩١/٥/٨

بەدمەست و مەست و مەستم
ساقی وەرە بەم لاوە
جامێ بدەرە دەستم
من پێکەکەم ڕژاوە



ساقی بەمەیلی چاوت
چاوم لەدەست و جامە
مەلم کەوتوومە داوت
نەڵێی لیقات حەرامە
ساقی مەزەیە لێوت
چاوت پیاڵەی شەرابە
بەخ لە نیگای بزێوت
کەمێ پەرچەمت لابە
سینەت شیعر و نەوایە
سینی و گلاس و مەیە
بڵێ تو ئەو خودایە
چاوەڕوانیم تا کەیە؟
مەیخانە گەرم و سازە
من کەی نۆرەم دەگاتێ
چاوت ڕەش و بەنازە
کەی مەیلێکم دەداتێ؟
یاران جەمن، دەست بەجام
موتریب هەوا دەبێژێ
سوبح دەدرێتە دەم شام
بەدمەست شەراب دەڕێژێ
دەبا ساقی ڕێم بدا
من لە خۆما بەدمەستم
جەزبەی عیشق لێم بدا
دەگاتە باخی دەستم
بەدمەست و پەست و مەستم
چاوم لەباخ و بەیە
لۆمەم مەکەن نەوەستم
منیش نەفسێکم هەیە
ساقی چارەیەک، شێتم
دەمەت وا دەمی داوە

خۆ من هەرچاوەڕێتم
پێکی پڕم ڕژاوە
دەمت بێنە، دەمی دا
خۆ من باوانی خەمم
وەلی لە ڕووی شەمی دا
تۆ زین من کاکە مەمم

***

## مەهاباد

١٩٩١/٥/٩

بەخەون و خەم...
هەزار جارم دیبێ کەمە
دوێنێ پێم نایە ناو خاکی. چووم بەتاسا
دڵم کەوتە وا لێدانێ، وتم ئێستا هەڵدەفڕێ
بوو بەهەڵۆ و بەئاسمانی چوارچراوە
لەنگەری گرت
قاضی کرابوو بەدارا
خۆڵ کرابوو بەسەر سەروچاوی شارا
مێژوو مل کەچ و سەر شۆڕ بوو
چەرچەڵ ستالینی گوشی...
باوەڕ قرژاڵی بن تۆڕ بوو
جارچی لە ئامون جاڕی دا
تاوانێکە زۆر گەورەیە
ڕۆژگار دەوران و دەورەیە!
خۆڵی ژێر سۆڵەکەی قاضی درا بەدەم شەماڵەوە
لەسەر تەوێڵی ئەم چەرخە بوو بەتایتڵ
زۆردارانی ئەم جیهانە خوێندیانەوە:
- کە، سۆڵەکەی پێشەوای کورد
لەشەرەف و شکۆی ئەوان، پیرۆزترە
کە، تاوانی کوشتنی ئەو
پەڵەی ڕەشی سەر نێوچاوی ئاینیانە



قەفقەفی زنجیری داخی بەرگەردن و پاینیانە!
چوار چرایە ئەو مەشخەڵەی لەجێ سێدارەکەی ئەوا
هەڵکراوە
مەهابادی پێ سوور بووە
لەجیهاندا ناونیشانی ڕووی لە هەزار سنوور بووە!
ئەگەر جێگە قیبلە بۆ کورد،
پێغەمبەرێک ناوی نایە
چوارچرایە قیبلەی ئێمە و مەهابادە قیبلەگایە!
هەرمەینەتی بەهاری خوێن،
کۆچی شەو و گریان و مەرگ...
سۆزی ئەم ڕازەمی تیایە!

***

## لەسەر گڵکۆی شاعیری پایەدار «هێمن»

هێمن... منم لەسەر گڵکۆت ڕاوەستاوم دەستەونەزەر
ئەی تۆ لە حاڵەتی ئێمە لەلات هەیە باس و خەبەر؟
خەڵکان لە تاریک و ڕوونا مژدەی بەیان ڕەچاو دەکەن
ئێمە لە تاریک و ڕوونا شەوانمان کرد بەڕاگوزەر
ناڵەی منە وا تێکەڵی ناڵەی جودایی تۆ دەبێ
ئازاری من بهۆنەوە و بیخوێنەوە و بیکەرەبەر
کورنوشی من بۆ پایەتە، ئەی خاوەنی پایەی بڵند
مردنی تۆ لە شارەکەی من لێی دەدا زەنگی خەتەر
مەهابادە چاو جوانەکەت، چاوانی جوانی ڕشتووە
کلاوزێڕی شیعرەکانت وەک تاجی گوڵ دەکاتە سەر

***

## درەخت

١٩٩٢/١٢/٢٤

درەختێکی گەورەم بینی پەلهاویشتوو
هەرزەکاران لق و پۆپیان دەشکانەوە
خۆیان هێشتا لەبنیا بوون بەسێبەریا دەڕشانەوە

هەرزەگۆیی و بەرد بارانە
هۆ شێخ هۆمەر، داخۆ کامیان شای مارانە؟!
عەجەب، عەجەب، والله عەجەب
ئەم دنیایە زۆر عەجیبە
هەرزەکارە و قژی دایکی دەڕنێتەوە
سەری باوکی خۆی دەشکێنێ،
کەسیش نالێ نانەجیبە!!

***

## چاوگە

١٩٩٢

چاوگەیێکی ڕوونم بینی
وەکوو ئاسمانی سەر زەوی ڕاخرابوو
ئەستێرە باران کرابوو
هەرزەکاران لەوێ ئاویان خواردبووەوە
کەچی پەڵیان بۆ دەهاوێشت
هەرزە گۆیی پەڵ باران بوو
هۆ شێخ هۆمەر، داخۆ کامیان شای ماران بوو
عەجەب، عەجەب والله عەجەب
ئەم دنیایە زۆر عەجیبە!
هەرزەکارە و ئەو مەمکانەی شیریان دایێ
دەیان بڕێ
ئەو کتێبەی کە زمانی تیا گرتووە وادەی دڕێ
کەسیش نالێ نانەجیبە!!

***

## شیعرێکی کاریکاتێری

١٩٩٤/٢/١٥ (هەفتەنامەی ڕێگای کوردستان)

**ئەرێ و نەرێ**

کە وڵاتێ هەمووی بوو بەئەرێ و نەرێ
خوا ئەو وڵاتە و چی تیایە، بۆ خۆی بەرێ



ساڵ بەو عەیام...
خێرەوەمەندێکی خۆش کەلام
گێڕایەوە:
هەبوو نەبوو، باژێڕێکی وەها هەبوو
کوێخاکەیان هەر بەئەرێ گۆش کرابوو
گوێی لای -نەرێ-ی کپ کرابوو
ئەو قەڵەمەی ئەو زمانەی، یا هەر شتێک
«ئەرێ»ی دەکرت،
دەستیان لەبینی گیر دەکرد...
هەتا دەمرد.
ئیتر باژێڕ ئەم پەڕە و پەڕ،
ئیتر خەڵکی گوێ سووک و کەڕ
ئیتر قەڵەم بەئاشکرا، ئیتر دەروون بەپەنهانی
ئیتر خەڵکی ناو کەلاوە، ئیتر خەڵکی ئاوەدانی
ئیتر لرفەی وتارەکان
ئیتر هەڵپەی بێ بارەکان...
هەموو یەک دەنگ ئەرێ، ئەرێ
دەست بەدوعا... خوا کوێخامان بۆ بهێڵێ،
بیباتەوە بۆ خۆی «نەرێ»
ئەرێ و ئەرێ ئەرێ و ئەرێ
هەموویان چوون بەناویەکا، بوون بەکەرێ
کوێخا سواری پشتی دەبوو
وەک تاعون سوار دەهات و دەچوو
لووتی بۆ ئاسمان هەڵبڕی
دەی وت خۆشە شاری -ئەرێ-
هەبێ وەک من ڕێی پێ بەرێ؟!
وەک ئەرێکان بوون بەکەرێ...
دەگێڕنەوە دار بەڕوویێک بەشاخەوە
«نەرێ»یەکی گرتبووە خۆ لەناخەوە
لەکەلاوەی باژێڕەوە هەڵاتبوو
ڕۆژێک کوێخا سواری کەری ئەرێکان بوو

حەزی لە گەشت و سەیران بوو
گەیشتە لای داربەڕووەکە و چاک تێیڕوانی
هات بەبیریا... لەوانەیە
بەڕوو –نەرێ– بگرێتە خۆی بەپەنهانی!
ویستی شالاّوی بۆ ببات
وەکوو نەریتی چەند ساڵەی کەمەندێکی بۆ هەڵبدات
بەلاّم چونکە لەسەرپشتی کەری –ئەرێ– ڕاوەستابوو
هەڵمەتی برد،
وەک حەمامۆکی مناڵان...
هەر –نەرێ– یەک داپڕووخاند و لەت لەتی کرد(*)

***

## ٣١ی ئازار

١٩٩٤/٣/٢٩ (هەفتەنامەی ڕێگای کوردستان)

٣١ی ئازارە ئەمڕۆ نۆ بەیانی کارگەرە
یادی حزبی کۆمۆنیستی هاوڕێ «فەهد»ی ڕابەرە
حزبەکەم حزبی خەباتە و هەر بەخوێنیش ئاودرا
بۆ شەوی تاریکی مەینەت مەشخەڵێ بوو هەڵکرا
تا خەبات و خەم بمێنێ حزبەکەم ڕۆڵی هەیە
بۆ گلارەی مۆنی دوژمن مستی پڕ خۆڵی هەیە
داد و ئازادی و ژیان و مافی ئینسانم دەوێ
من لەهاوبیر و خەباتم دەنگی ویژدانم دەوێ
ئەی گەلانی سەرزەمین و ئەی ستەمدیدەی جیهان
گوێ گرن کوردیش گەلێکە و تێدەکۆشێ بۆ ژیان
دەستی من دەستی خەباتە. بێنە دەستت یەک گرین
داینەمۆی مێژووین هەمیشە. تێبکۆشین نامرین
٣١ی ئازارە ئەمڕۆ، پەرچەمی سوورم هەیە

(*) ئەم هۆنراوەیە لە ڕۆژانی ڕەشدا نووسیومە کە وڵاتمان لە ئاستی خواستی سەدامی خوێنڕێژدا هەر ئەرێ بوو. بەیعەت لەسەر بەیعەت دەکرا بەکلاّش و دیکتاتۆری ڕەزا قورسی لەپێی دەکرد. منیش ئەو ساڵانە و دوای ئەوانیش نەم توانی ئەم هۆنراوەیە لە هیچ کوێیەکا بخەمە پێش چاو.



من هەوارگەی زۆر نزیک و خەونی زۆر دوورم هەیە
حزبەکەم چامەی ژیانە و چامەنووسان ڕابەرن
تەپڵی ئازادیش بکوترێ، هەر شەهیدان سەروەرن

***

## بۆ ڕاپەڕین

١٩٩٤/٣/٧

دوێنێ دڵی خۆم ڕاچڵەکان... تەقیبەوە
وەکوو بەری هەردوو دەستم کرایەوە،
گۆڕستانی شەهیدان بوو
مەزرای سووری خوێنجمان بوو،
هەڵەبشیما و سێو سێنان بوو
پۆلێ شەهیدی ڕاپەڕین گۆڕی خۆیان دا بەکۆلاّ
هاتنە ئەوەی دڵم چۆڵ کەن
چاوی شیعرم پڕ لە خۆڵ کەن
وتم: بۆچی؟ سەرمۆرگێری کۆڕی ئێوەم
ڕەنگی ئێوەم کرد بەشێوەم
چاوەکانم چل چرا بوون
لەناو چەتری مەزراتانا هەڵم واسین
چۆڵم مەکەن...
من سەبووریم بەئێوە دێت، جێم مەهێڵن
چەقۆیەکی زۆر تیژ بێنن بەری زمانم بکێڵن
مەڵێن خوێنمان بێ بەهایە
ئەمڕۆ، خەڵکی، پووشی کوتراوی بەربایە!
ئەمڕۆ، خەڵکی نان لەئێوە داوا دەکەن
برسێتییان لە پریاسکە دەپێچن و دەیخەنە سەر گۆڕەکانتان
چۆقەی دانیان دەکەنە نێو تووڕەکەوە، دەڵێن هانێ...
بەڵێن، کوانێ؟!
فرمێسک دەڵێ من بۆ خەسار قوڵپم داوە
دایک دەڵێ من بۆ خەسار قوڕی خەستم لەسەرناوە

ئەو پیرانەی بەدوای هێلنجی ئەنفالا ژیانەوە
عەرز و حاڵیان وەرگرتەوە... دەڵێن... هانێ
بەڵێن کوانێ؟!
دڵشکاون، ئەوان مردوون، ئێوە ماون،
نوێژی غائب، مزگەوت دەرگای لەسەرداخست
هەزار لەعنەت لەو پەتایەی لە کوردستانی ئازادا شەهیدی کوشت!!
پێی دایە بەرپێی ڕاپەڕین
شەهیدەکان لە دێبەرەی زوڵم و خەما، زەردووامن،
گوڵاڵە سوورەی ناکامن
شیعرەکانمان ناخوێننەوە...
وا خەریکن گۆڕی خۆیان بەن بەکۆڵا
کۆڕەو بکەن بەدیوانی وشکو چۆڵا
بەهوتافی گڵ و خۆڵا
بەوتاری چەم و دۆڵا
ئەمڕۆ دڵم ڕادەچڵەکێ و لەناخمدا دەبێ بەگۆم
هۆ... ڕاپەڕین، من شاعیری دەرباری تۆم
نەکەی دڵم جێ بهێڵی
لەسەرپەڵەی فرمێسکمدا بۆ تۆ، بۆ تۆبە شەست دەکەم
من دەست و پێت دەشۆمەوە
من شەپۆڵی زامانی تۆ دەخۆمەوە
من بەشوێن پێی ئەسپەکەتا، بەتاو دێم و دەڕۆمەوە
دەتۆ لەمن مەیێرە دەنگ... من دێوانەم
من عاشقم، کەی من دەفرێکی پێوانەم؟!
هەزار لەعنەت لەو پەتایەی، ڕاپەڕینی خستە جێگە
شەهید لەگۆڕ وەدەردێنێ، دەیکا بەقۆڵی سەر ڕێگە
دەیکا بەقوربانی حزب و پراکتیک و پرەنسیپ و
هەندێ پێگە!!!

***



## مێروولە

مامە، کاکە!
ڕێگە مەدەن ڕێچکەی مێروولە بگاتە باخی دڵتان
کە مێروولە ڕێچکەی کێشا دوایی نایە
کە مێروولە ڕێچکەی کێشا
ژەهرەڕێژێ بۆ وەی ئەم ڕێچکە ون نەکا
کە مێروولە گەیشتە ناو باخی دڵتان ڕووەکەکان بێزار دەبن
گوڵە مێلاقە و وەنەوشە فێری بۆڵە و هاوار دەبن
کە مێروولە گەیشتە نێو باخی ناختان،
زەوی هەمووی کرمە ڕێزە،
پیت نامێنێ، کێڵگە وەک ئاردی بێ پێزە،
کاکە، مامە!
بەڵێن مەدەن بەمێروولە. هەر ئەوەندەی کە چەشە بوون
شاریان دانا، ڕێچکەیان بەست، ئەوسا لە خۆشتان دەترسم
پێی کورسیتان دابێژێ
ئەمجا لە خۆتان دەپرسم: هاوارمان کرد کە مێروولە ژاراوییە
هەر مێروولە بەژنی مێژووی دابێژاوە بۆ دارمان!
مامە، کاکە... ئەمە سروشتی مێروولەی ڕێچکە بەستە
کاکە، مامە... ئەنجام لەڕێی مێروولەدا قوڕی خەستە
مامە، کاکە... ئەم مێروولە ژەهراوییە
ئەم کوردستانە بچووکە، ئەمانخاتە سەر بێژنگی تەنینەوە
ئەم مێروولە، تۆوی مارێکی دێمییە، کوشندەیە
لە هەر کوێیەک بانگێ بدرێ ئەو بەشاری خۆی دەزانێ
پێگەی ولایەتی ئەوە هەموو کەلاوە و سەربانێ.
کاکە، مامە، مێروولە هەن بەکوللەوە دادەبارێن
گەرایان نا، سەوز و زەرد و سوور دەهاڕن
ئێوە تەریک و بێ بەشن، خۆیان خاوەن وەرد و جاڕن!
مامە، کاکە!
من لەگیان و من لە ناخ و من لەدەست و من لەدەمتان ترسم هەیە

خوانەخواستە نەک مێرووڵە ڕوویان تێکا
لەشەوێکا ببێ بەقەڵای نامەردان...
بەرەو ئینجیلی باخەڵتان، دزە بکا و گەرا دانێ
ئەم میللەتەیش پێی نەزانێ!!

***

## هۆنراوەیەکی سادە

١٩٩٦/١١/١١

لێرە نەبوون هەر دەمان وت گوڵی پاکن
لێرە نەبوون وامان زانی خەونی خۆشن
لێرە نەبوون دڵ و دینمان لەلاتان بوو
نزا و دوعای سک سووتاوان
چاوەزاری ڕێگاتان بوو
لێرە نەبوون جێی ئومێد و شانازی بوون
لێرە نەبوون مێژووی نوێتان دەنووسییەوە
لێرە نەبوون بەڵگەی مافی ڕەوامان بوون
لێرە نەبوون پەیامی زاتی خوامان بوون
کە ئەم گەلە هێنانیەوە وتمان خێرە
دەمێ ساڵ بوو هەر چاوەڕێی هاتنەوە بووین
وتمان شەوێک لەشەوانمان بێ خەم دەنووین
وتمان ئەنفال و سوێکانی دەخۆینەوە
وتمان هەڵەبجەی مارانگاز دەشۆینەوە
خەومان دەوڵەت و ئاڵابوو، گەلی کوردین
دەوڵەت نەبوو، ئاڵاشیان بۆ هەڵنەکردین
کەچی ئەفسوس کەچی هەی داخ ئێمەو ئێوە
تێڕوانینمان لەم ژیانە لەیەک نەچوون
ئێوە بوون بەخەمی قورس و تەبا نەبوون!
ئێمە دانمان بەخۆدا گرت وتمان بەڵکوو
گەر بیری ئێمەشیان نەبێ خۆیان بیر بێ
وتمان طیفلی سیاسەتیان کەمێک ژیر بێ



تەنها ئێمە هێلانەمان لێ تێک ناچێ
ئەوان دەبنە کلکە تەورێ داری بەڕوو
دەبڕنەوە بەفرمانی بێ یەک و دوو!
ئەوەی بەعارەق و خوێنمان پێکمان هێنا
ئەوان هاتن خوێن و فرمێسکیان تیا چێنا!
ئێمە داوای ئاشتیمان کرد گوێیان نەگرت
ئێمە وتمان لێبوردنێک ئەوان سوور بوون
وتمان نێوان بێننە یەک ئەوان دوور بوون!
هاوارمان کرد سازش لەتەک دوژمناندا
ڕێگای ڕۆچوون و هەڵدێرە، ئاگاداربن
حەیفە لەمڕۆی سیاسەتدا هەرزەکاربن!
گوێیان نەگرت داوگرتنی، تێڕاماون
نێچیری ناو پەل و هەڵپەی سوارەی ڕاون!
بێن بمکوژن سەددام پەنای ناوبژییە
چیلەر خەمی ئێمە دەخوا، تەنگەتاوە!
ئایەت جامانەی کوردانی لەسەر ناوە!
بێن بمکوژن هەرچیمان وت بێ سەمەر بوو
ئاگری خەش لە ئازارمان بێ خەبەر بوو!
بێن بمکوژن تەماشاکەن دنیا چۆنە
لە قوڕاومان هەڵدەکێشن وەکوو دەڵێن
باکمان نییە چوینەتە ناوپێستی سۆنە!
نە کوردستانمان ئازادە و نەبەهارمان...
بەڕوو سووری ماوەتەوە لەدەفتەرا
سەری بەرزیش قوڕی خەستیان کرد بەسەرا!
کوردایەتی بوو بەقوربانی دەستەڵات
دۆزی کوردیش کەوتە ناو بازاڕی مەزات!
زمان و ڕەنگ دابەش کران بوو بەهەرا
دەرامەتیش کەس نەیزانی بۆ کوێ برا!!
گوێ بۆ هاوارمان شل بکەن خەڵکە هاوار
خەونی ئێمە لەم ناوەدا مەدەن لەدار!

ئایەت لەو ســـەر بەرزانەوە دێت و دەچێ
گـوێ مـلاسـە و چاوی هەر لەشـارەزوورە!
ســەددامــیش ئەو تاوانەیە لەبیــر ناچێ
یارمــەتیــشی بەهەر نیــازێ نامــشکورە!

***

## دیاری

١٩٩٦/١٠/٢٧

من دەمەوێت دیارییەکت پێشکەشی کەم
تۆ خۆت بڵێ چت بۆ بێنم؟
لەگەوهەری دەریای شیعرم بۆ ملوانکەت
کامیانت بۆ هەڵبژێنجێنم؟
ئەوەندەی تۆ لە پێش چاوما جوانکیلانەی
بووکێک نییە بەو بەهایە!
نەقشی وەها و بەم هونەرە دارێژرابێ
هەر شایانی دەستی خوایە!
کچە کوردە بێ یانەکەی بێ نانەکە
بۆ بەپەلەی لێم ڕادەکەی؟
ڕۆژی مەینەتی ئەم ڕۆحەم لەهەگبەتا
هەتاکوو کوێ و بۆ کوێی دەبەی؟
دوێنێ سۆزانیی سیاسەت وەکو تەتار
هات چەپاوی توانامی کرد،
ئەژنۆم نییە کە دوات کەوم ئازیزەکەم
پەنام بۆ ئەم سۆزانە برد
لاکەرەوە و گۆشە نیگای چاوەکانت
بەرەو ناخم بنێرەوە
ئەم قەفەسەم تاریک مەکە و باسی عەشقم
بۆ هیچ کەسێ مەگێڕەوە
توێشووی ڕۆحم تەنها ماچێکە لەو لێوەت
پێت نەبەخشیم!



چۆن دڵت دێ جێم بهێڵی کە نازانم
هەتا سبەی چۆن چۆن بژیم؟!
کە گەوهەری شیعرت نەویست دانە دانە،
ئەشکم دەکەم بەتاڵەوە
تاڵە تاڵە هەڵیان واسە وەکوو مەسیح
بەدار ئەستێریە خاڵەوە
ئاواتم بوو «وەلی»ی عەشقم هەر بۆ شەوێک
لەگەڵ «شەم»تا ببێت بەجووت
نەتهێشت، بەڵام تەنها ماچێک
لەو گۆناتە دەبێ بەقووتی لایەمووت.

***

## بەندەی خودا

١٩٨٥/٥/١

*بۆ شەهید عەبدولخالق مەعروف*

سەگوەڕ گەرمە...
(بەندەی خودا) ئەمڕۆ نەچیتە دەرەوە،
پارسەنگی ڕۆژ بدەرەوە.
سەگوەڕ گەرمە...
هەوشارەکان هەموو گیانیان بوو بەقەپاڵ
حەپەی سەگەل لە ئاسماندا ئەدات لە باڵ!
وەکوو دێوڕەش وەک دایکی هاڵ!
سەگوەڕ گەرمە...
وا سەگەکان بەکەڵبە و کلک
ئەدەن لەدەرگای ماڵ بەماڵ
سەگوەڕ گەرمە بەندەی خودا!
ئەمڕۆ مەچۆرە دەرەوە.
سەگوەڕ کەوا ئاگری سەند،
کە سەگ شالاوی وای هێنا...
لە هەرکوێیەک ئاوێ پاک بوو گلاوی کرد و خۆی تێنا

که سەگ بەم چەشنە لوورانی...
ڕۆژی شوومە و کارەساتێک بەڕێوەیە
هەرچی بەڵا و موسیبەتە لە عاستی خۆی سەر دەردێنێ
بۆڕفتی مەرگ وا هەڵی کرد...
ئاخۆ ماڵی کێ ئەڕمێنێ؟!
بەندەی خودا ئەمڕۆ مەچۆرە دەرەوە
بچۆ خەڵوەخانەکەی خۆت
دڵی کتێب بدەرەوە،
ناخی کتێب بکەرەوە.
بەندەی خودا ئەمڕۆ مەچۆرە دەرەوە!
سەگەڕۆژە، گورگە ڕۆژە
پەنا بەخوا مرۆڤ هێندە بێ نرخ بووە
خەم و خوێنی خیرەومەندان
تەنها فیشەکێ ناهێنێ!
شارەوانی شاری سەگەل
شەرع و یاسا
لە تۆڵەدا کەڵبەی سەگێ ناشکێنێ!
بەندەی خودا...
دەخیلت بم ماڵ نشین بە، سێ ڕۆژ مەچۆرە دەرەوە!
وەڵامی کەس مەدەرەوە
سێ ڕۆژ ڕۆژوو بخە گەردن، قسە لەگەڵ مرۆڤ مەکە!
لە میحرابی کتێبێکتا سوجدە بەرە
بەڵکو بەبێ ئافەت بڕوات ئەم قەدەرە!

*

بەندەی خودا چووە دەرێ،
بڵێی سەگەل وا، هار بووبێ
شاڵاو بۆ ئەم پیاوەش بەرێ؟؟!
خەڵکی گەڕەک چاویان لێ بوو
دوو سێ سەگی سەرگوێ بڕاو
قەپیان گرت لە چاوی هەتاو!
کەڵبەکانیان وەکوو فیشەک زەرد هەڵگەڕا



بوو بەدەستڕێژ...
ئای چیتان کرد سەگەلی هار؟
ئای سەگەوان، ئەم گۆبەندەت بۆچی گێڕا؟
«طواسین»ی بەندەی خودا نۆبەرەی بوو،
ئەم (تکفیر)ە چ زوو گەیشت؟
ئەم خوێنە چۆن حەڵاڵ کرا؟!
هەرچی وتە و فەرمایشە، کۆن و کۆنتر، پشت گوێ خرا!؟

*

«حەلاج» وتی: -أنا الحق- و خەلیفە شیری هەڵکێشا
پەلپەلیان کرد.
هەرچی دەماری جەستەی بوو پەتی فتوایان لێ بەست و
یەکە یەکە دەریان کێشا.
ئیتر بوو بە -هو الحق- و هەرچیشی وت بوو بە ئایەت!
لەو ڕۆژەوە کنە ئەکرێ لە دیوانی طواسیندا
ئەوسا بۆیان نەشاراوە و
ئێستەش بۆیان دوایی نایەت!

*

بەندەی خودا شەهیدێکە، برای هاودەردی مەنسوورە
کێوی کوردستانی سوورە!
بەندەی خودا، بوو بەحەرفی -أنا الحق- و
لەناو ناخی وشەی گەرمی ئەم بەستەدا
وا ڕازێکە ناکوژێتەوە.
بەندەی خودا ڕووبارێکە سەرچاوەکەی حەقیقەتە و
بەسەگوەڕی هەموو دنیا بەرەو دواوە ناچێتەوە

***

## برین بەدوای بریندا

١٩٩٤

برینی تۆ بێ پەترۆ بوو
زامەکانت قووڵتر دەبوون
لە کوچەییێکی وێرانەتا گوڵێک بۆنی بهێنایە

ئەتدا لەیەخەی شەهیدێ
چەند ساڵ دەبێ هەر بەتەمام، کە زامێکت سارێژ ببێت
بەهارێکت نێرگز بخاتە سەردەستی
تۆ بەپێوە ڕابوەستی!
کەچی هەر زامت قووڵ دەکەن
کەچی هەر چەقۆی ئاگردار بۆ دڵی بیمارت دەبەن
تۆ ئەی باخە سووتاوەکەی ڕێی هاتوچۆی
هەواڵ دزانی سەفەرمان، ئەمجارەیان چەندەمینە،
ئاسمان لە تۆ کێڵگەی پشکۆ داوەرینە؟!
شەقامی چاوی ڕووخاوت، بلّند گۆی ڕێی
مەرگەساتە؟
وەرزت کلتووری نەهاتە؟
ئەی میهرەبان، ئەی دایە گیان...
ئەمە شەڕە،
شەڕ بێ فەڕە.
تۆ و و خوشکەکەی شارەزوورت
تۆ و گەرمیانەکەی خاپوورت
هاوار بکەن... سینگ کوتانە
شەڕ حیمایەی ڕێی شەیتانە!
با شاخەکان دابڕووخێن بەسەنگەری شەڕکەراندا
با شیوەکان بێنە یەک و زۆڵە سەنگەر بتاسێنن
ئەم تاوانە خوێناوییەش
بەگەلی کورد بناسێنن!
ئەمە شەڕە...
شەڕ، بێ فەڕە
شەڕ سروودی ڕاپەڕینی ئاوەژوو کرد
شەڕ سەگوەڕە!
هۆ دایەگیان... قەڵادزێ...
خۆڵی هەڵشۆ بێنە و بیکە سەر زمانت
لۆیەکی پشتێن بکەوە،



برینی خۆت بپێچەوە...
کە ئەم بارەت لێ بووەوە
کە خەڵوەکەت پێ بووەوە
ئەم ساوایەت بەژەکی زامت گۆش بکە
ئەم ژانەیشت خامۆش بکە
بڵێی دەرگە نەکرێتەوە لەسەر گاڵەی دەم هەراشان؟!
بڵێی قەدەر هەروا کوێر بێ؟!
بڵێی ئەم وار و دەبەرە ئەمجارەشیان ڕەدوو کەوێت؟
بڵێی بەختیش بەتەنها تۆی
بۆ شین گێڕان، بۆ سنگ کوتان!؟
بۆ سک سووتانی نوێ بووێت
قەڵادزێ ئەی میهرەبان...
قەڵای زامان ئەی دایەگیان!
لەشیری پاکت سەڵەوات
کێیە هێندە بەدنمەکە دەست بۆ سەر و پێچت دەبات؟!

***

## بۆ یادی بوێژی نەمر -عەلی مەردان

١٩٩٢/٩/٢٣

«گۆران» لەگەڵ دەروێشێکا ڕاز و نازی هێنایەوە
فووی شیعری خۆی کرد بەگەرووی شمشاڵیدا،
وەک نەفخی خوا و دایە «مریەم».
چ شۆڕێکی خستە نێوان!
لە کۆمەڵگای کوردەواری، تەرازوبازێ نەمابوو
دەست نەداتە کێش و پێوان.
ئەی من... منی شاگردی گۆرانی مەزن؟
من ناتوانم بدوێم لەتەک شمشاڵێکا
کە دوو سەرە و باڵا کون کون
من ناتوانم دەروێشێکی وەکوو «ئەولا»
ببەمە ئاستی بتهۆڤن!
من خۆم ئێستە شمشاڵێکم هەریەک سەرم و جگەر سووتاو

من خۆم ئێستە دەمجێ و گۆرانێکیش نییە کەمێ بمدوێنێ
کە شیعرێکم، کە ئاهێکم، کە خەمێکم هەڵسەنگێنێ!
من ئەمێستە برسییەکان گوێم لێ دەگرن بەترسەوە
شیعرەکانم لێ وەردەگرن بەپرسەوە!
منیش وەڵامم لا نییە
ساخ بۆتەوە ئەمڕۆ شیعر پەیامی زاتی خوا نییە!
لە جێگەی نان و چا نییە!
ئەمن دوێنێ (ئەحمەد بێکەس) خەبەرێکی وەهای دامێ
سبەی ساڵڕۆژی مەردانە،
وەرە و لەگەڵ ڕێزی ئێمە قەدری هونەرمان بزانە
هۆ کاک ئەحمەد... من خۆم پیرم،
خۆزگە پیری موغان بوایەم
ئاخۆ چەندێ بڵند دەبوو، کورسیم یاخود پلە و پایەم؟!
من ئەمێستا لە شمشاڵێکی دووسەرا، هەر ئەو فووم و
قەتیس ماوە،
شمشاڵژەنیش فڕێی داوە.
هۆ کاک ئەحمەد، بۆ نازانیت ئەمڕۆ لای ئێمە چی باوە؟
لەسەر بارێ ڕامەوەستە، کتێب زۆری پوترکاوە.
قسەش زۆری هەر پەنگاوە.
من نەگبەتم یاخود مەردان!؟
خۆ ئەو پیرە نەک دەروێشە
ئەو مەولایە، نەک ئەولایە!
سۆزی گەرووی عەلی مەردان گیانە و لە فرمانی خوایە.
هۆ مەولاکەی ئەلاوەیسی، دەخیلت بم نەڵێی مردووم
لەگشت ئاهەنگی کوردی دا قەتاری تۆ
کەلێنی ناخی پڕ کردووم!.
قەتارەی خەم کە ڕێ دەگرێ قەتاری تۆیە پێشەنگی
دڵی من وەک کەنیسێکە، گەرووی تۆ بوو بەشازەنگی
دەسا مەولای وەجاخ ڕوونم، تۆ گۆران بە و من دەروێشم
کوا ئاهەنگێ خرۆشێ با بەناخی پڕ خەم و ئێشم؟!
لەسیماتا بەدی دەکرا گرانیی باری ئەم ژینە



دەسا بۆیە لە سۆزیشتا دەماندی قوڵپی ئەو سینە
مەگەر دەروێشی ئاشیانەت بناسێ قەدری ئاوازت
لە شیعرێکا هەوێنی کا سروودی مەینەت و ڕازت
بەڵام چ بکەم کە ناوچاومان بەجووت وەک یەک
شەوەنگێزە
زمانی بەد لەڕێماندا، دەبێتە خەنجەر و نێزە؟
مەولام دیسان وا هاتمەوە
بەخۆم و هات و باتمەوە
چەند پێم خۆش بوو تۆ بمایەیت
خەمێکی نێو فەرهەنگەکانم دەربێنی
شووشەی سەرمۆری بشکێنی
وردە وردە ڕۆی کەیتە ناو گەرووتەوە... بەبای بدەی
دیارییەکی جوان بوایە و بەخوای بدەی،
بەکەمان و بەنای بدەی
قەتاری شێخت ناو نایە،
ملی زەویت پێ بادایە.
منیش لەگەڵ شانازیما، کاسە خەمێکی زۆر خۆشم بۆ هەڵدایە
مەستیی ڕووی لە، سەری کاسم بکردایە،
تۆ و دەروێشم دابنایە، گۆرانیشمان لەگەڵ بوایە
قرچەی زامی ئەم میللەتەم تا عەرشی خوا ببردایە.
هۆ مەولاکەم، مەولای زیندووم
تۆی کەلێنی هەموو شانی خەمەکانمت بۆ پڕ کردووم
هۆ مەولاکەم، من دەروێشی بێ گۆرانم
من قەدری خۆیشم نازانم
ئەمن دوێنێ «شەرەفکەندیم» لاوانەوە
پرسەم خستە سەروو پرسەی باوانەوە
کەچی خۆم و شیعرەکەیشم
نەبووینە ئەو بالۆرەیەی نێو مەولودیی ژنانەوە!
هۆ مەولاکەم... کوا ئای ئایە؟
هۆ مەولاکەم... توخوا بۆچی دەنگت نایە؟!
هەر شیرینی ئاوازی تۆ تاڵی عومرم لا خۆش دەکا

هەر گوڵچنینی گەنمی تۆ لە پەرێزدا پڕ کۆش دەکا
هۆ مەولاکەم، سۆزێکی تۆ و چاوێکی جوان
کە تێکەڵی جامێکم بوون
با ، یارانم خەمیان نەبێ، گەر بەهێشووی زامێکم بوون!

***

## دەزانیت...؟!

١٩٩٢/٩/٢٥

دەزانیت چەندم خۆشەوێیت؟... پڕ بەم خاکە
بەژمارەی هەرچی جووتە و هەرچی تاکە.
کێشی هەرچی کردەی چاک و وشەی پاکە،
بەقەد ڕێزم بۆ شەهیدان... تۆم خۆشەوێ
خۆشم دەوێی بەقەد فەرهەنگی خەمانم
کێشی هەموو ترس و بیمی سبەی ڕۆژی بێ ئەمانم
تا هەژاری ڕێم پێ بگرێ، ئەمن زیاتر تۆم خۆشەوێ
بۆ نازانیت من منالێکی ساوام و
حەتحەتۆکەی دەستەکانتم بۆ باوەش و بۆ کۆشەوێ؟
مەمکە مژەی دەم و لێوتم، بۆ دەستبازی و بۆ نۆشەوێ؟
خەندەییێکم لێ هەڵبێنی، دەڵێم بەیان بۆ دنیایە
گەرم هەواڵم بپرسی، من دڵنیام،
ئەمساڵ سەرمای زستان نایە!
ئەگەر نوقڵێکم بدەیتێ...
زامەکانم دەبنە هەنگەژاڵی سروود
دەبنە میحرابی خوێندنەوەی دۆعا و درووود
ئەگەر باوەش بگریتەوە، بۆ خەونێکی لانەوازم
وا دەزانم بەزەرد و کاوی عەشقەوە
هەر خۆم هەڵۆم، هەر خۆم بازم!
خۆشەویستیت بۆ بوومی من نەرمەباری بەهارانە(١)
سوحبەتی کۆڕی یارانە...
پێداچوونەوەی جارانە

***

(١) بووم: زەوی، خاک



## ئەوین و ئاڵا

١٩٩٢/١١/٧

تۆ هەرچیت ویست من وەک فرمان
یەکسەر شانم دایە بەری
لەناو جەرگەی شاری چڕ و جەنجاڵیشا
بووم بەکووچە و بەگوزەری
گەرەکێک بووم، هەرچی دەرگای ماڵانم بوو
خستمە سەر پشت، چاوەڕێت بوون!
بووم بەشەقام هەموو بستێک لە پانیم و لەدرێژیم
بەردەبازێکی بەرپێت بوون
ئیتر بۆچی لێم لووتەلای، پێیشم ناڵێیت.
ئەرێ کابرا لە کوێوە دێیت، بۆ کوێ دەچیت؟
گرانییە و تۆ سێبەری هاتوچۆمی
ئادەی بڵێ چۆن چۆن دەژیت؟
هۆ ئاغاکەم، خۆ من زامی وا عەشقێکم
هەمیشە گڕ دەدرکێنم
ئەوە سوێندمە، ئەم ڕۆژووەم یائێجگاری دەمسووتێنێ
یا بەجامی ئەو لێوانەت، لەسێبەری ئاڵای کوردا
ئەم قەیرانە دەڕووخێنم!

***

## ئاگر

١٩٩٢/١١/٧

پێشی هەزار و هەندێک بوو دەمپەرستیت
هەر تۆ ڕەمزی ئەهرۆمزدای ئێمەی کورد بووی
ڕۆژانێک هات لەکوانوودا، لە تەنوورا، لە کوورەدا
بووی بەپشکۆی نیوە خامۆش
وەکوو ئەندێشە لای سەرخۆش.
ئێستە من تۆم وەکوو خوداوەندێ ناوێ

ئێستە من تۆم دەوێت وەکوو تین و تاوێ
ئەوا زستان، بەفر و شەختە، چزوی ژەهراویی ڕەشەبا
دەست لێ شتێ دەپێچنەوە هەردوو چاوم
ئەگەر دۆخمان، هەروا بڕوات، لە ئێستەوە من نەماوم
هۆ چاوانی ئەهرۆمزدا، ناوت ناخەمە سەر ناوم
کە بێیتەوە ئیتر دڵم دادەکەوێ
شەوێک لە ئامێزما نەبی، قەت چاوانم ناچنە خەوێ!

***

## هەور

١٩٩٢/١١/١٢

وەرە و وەرە، خەست بەرەوە، خەستتر، خەستتر
تادەبیتە دێوە کێوێکی هەڵواسراو
بگرمێنە، بنرکێنە، وەکوو زریانی هەڵکراو!
لەژێر توێیەک کۆنکریتی سارد و سڕا،
لەناو کفنی لێفە شڕێکی تەپیوا، خۆم خڕداوە
سەرم بە، تاڵی لەرزوبیم، بەلەشمەوە دابەسراوە
لفکەییێکی تەڕکراوی، توند گوشراوە
ساڵێکە و هەن، ئەمن هەر خۆم دەتەکێنم
وا تۆزیشم پێوە نەما
تۆ دەتەوێ لەگۆی بخەی زمانیشم لەناو دەما!
بەفر و باران خەست کەرەوە.
قەت وەڵامی نزاکانم مەدەرەوە
خۆ تۆ دەڕۆی خۆت و شەختەت،
ئەم نەورۆزە دەتوێنەوە
فاشستەکان، بەلەش و لار،
لەوێنەشدا نایێنەوە.

***



## ڕفین

١٩٩٢/١٢/٨

تۆ، دەتەوێت بدەی لە باڵ؟! وا من دەفڕم.
تۆ، ناتوانیت وەک من بفڕیت.
کە شاباڵی خۆم دەکوتم، وا ڕووناکی، دەپێچمەوە
لەوانەیە خۆر ڕاکێشم!
دەتۆ وەرە سەر باڵێکم، سەرت دەخەم
ئەم گەردوونەت لەبەردەکەم
وەکوو گوڵێکی پێ گرتوو، دەتدەم لەپرچی کاکێش و
چاوی گەشی کاروانکوژەت پێ دەڕێژم.
لەسێبەری نیگایەکتا، نەمامە شیعرێ دەنێژم،
هەرچی ئادەم و حەوایە ڕەدووی کەون
هەرچی هەناری هیران و نازەنینە، لەداخاندا
شەو نەخەون
کاتێ بەیان چاوی کەژاڵی هەڵدەکات...
لە قەفەسی ئارەزووما چاو لێک دەنێی
منیش گاڵتەم بەسروشت و بەجیهان و هەرچی هەیە.
لە کاتژمێرێ ناپرسم...
ئەمڕۆ کەیە و ئێستە کەیە!

***

## بیرت دەکەم!

١٩٩٢/١٢/١٥

بیرت دەکەم، چەند دەمێکە نەمبینیون؟
ئێوە گوڵی لالەزارن، منی گوڵچن نەمچنیون
بیرت دەکەم چەند دەمێکە چاوەڕوانم؟!
پەنجەی نەرم و موبارەکت، نەخراوەتە سەر چاوانم!
بیرت دەکەم، چەند دەمێکە تامەزرۆتم
بەشێکی تر مەدۆزەوە، خۆت دەزانیت بەشی خۆتم

بیرت دەکەم، چەند دەمێکە بەتاسەوەم؟
چەردەییێکی خەرمانی تۆم، من لەسەرووی پێناسەوەم
بیرت دەکەم، چەند دەمێکە نایێتە لام
بۆ، نازانیت عەشق چییە، هاکا زانی منیش سووتام
بیرت دەکەم، چەند دەمێکە دێم و دەچم؟
گیانی یاخی بوونم نییە، من دەروێشێکی مل کەچم
بیرت دەکەم، من باوەشم کردۆتەوە
گەر دەتەوێ من نەبینی، پیرۆزەمکە بەخۆتەوە!

***

## زێ

١٩٩٢/١٢/٩

کیژۆڵەکە! هەروەک نەوای شمشاڵێکی...
پەنجەی نەرمی هونەرمەندێ دەیلەرزێنێ
وەکوو شەرمی وەنەوشەیت و لەسێبەری درەختێکا
خۆت هەڵدەخەی
دەنکە نوقڵێکی دزراوی، وای لەدەستی منداڵێکا و
لە پڕ دایکی پێی دەزانێ
وەکوو کەرەی نۆژەنیت و دەکرێیت بەچاشتی میوانێ
هۆنراوەی ئەو مەحفوزاتەی...
قوتابییەک وەک ئاو و دۆ لەبەریەتی.
تۆ ئەو ئەرکەی کە حەل دەبی و قوتابییەک لەسەریەتی.
کیژۆڵەکە! چ بەیتێکت بۆ ببێژم،
چۆن چۆن خۆزگەت بۆ هەڵڕێژم؟
من بەپەیژەی شەستەبارانی بەهارا، سەردەکەوم...
گووپی هەورە خرپنەکان هەڵدەمژم،
ڕووندکی چاوی ئەستێرە دەخوێنمەوە
تۆ بۆ ماچێکم نادەیتێ؟!...
من ختووکەی تیشکێ دەدەم لە ئاورنگا خۆی مات داوە
تۆ بۆ ڕێگەی پەنجەم نادەی گۆی مەمانت بێننە دەنگ؟...



لە سوخمەدا نەبنە پەپوولەی توێی کتێب.
دوێنێ گەیشتمە لای مەسیح، نوێژی خۆم کرد
بۆ نایەڵێت لە میحرابی هەموو لەشتا،
منیش وەکوو (کازیمیدۆ) بدەم لە زەنگ؟(١)
مەڵێ دەروێش و دێوانەی، تۆ ناشێوێی...
ئەگەر بەناو سەوزاییتا بێم و بچم وەک پەڕ و ڕەنگ.
کیژۆڵەکە... ئەوەندەی تۆ جوان و ڕێکی...
ئەوەندە من نەوسنترم
خۆم و نەوس و شیعرەکانم، لەسەرەوە بەگوژم دێین
کە دەگەینە ئاستی ترست، خەمت نەبێ...
خۆتی تێنێ، مەنگترین زێین.

***

## تۆزە بەهارە

١٩٩٢/١٢/٢٤

پەنجەکانم قیبلەنمای باشوورێکن...
قوڵپی دڵت لەو هەوارە هەڵیان داوە
زمانیشم ئاو پەرژێنی سایەی سینەی نەشکاوەتن
شیعرەکانم وەک زێوانی چراخانی نەکوژاوەتن
کێشەی ژیان بۆ بورکانی پەنجەم بکات بەکۆڵەوژ؟
باڵی زمانیشم بکات؟
بەچی ئیتر لەسەر لێوت بنیشمەوە و هەڵاڵەکانی هەڵگرم،
بیکەم بەهەنگوینە شیعر؟!
بەچی گیانم وەک قردێلە بدەم لەپەرچەم و قژت...
وەشتی چاوت بهەژێنێ؟
لەسەر زەویی ڕەق و بەیار، تۆزە بەهارە هەڵسێنێ
لەناخەوە شەختەی هەموو حەزەکانم هەڵتەکێنێ.

***

(١) کازیمیدۆ: قەمووری کەنیسەی نۆتردامە.

## نیزام شێواندن!

١٩٩٢/١٢/٢٤

که برسێتی لەدەرگای دام پشتێنەکەم دەجەرێنم
که زستان هات، بۆ تین و تاو چلوورەی خۆم دەوەرێنم
که ترسیش هات، لەسەنگەری باوەڕمدا جێگەم هەیە
که خەمیش دێت، من خۆم فەرهەنگی خەمانم
هەزار و هەن واتە و وتەی لێ دەزانم
گەر ئازادیم لێ بسێنن...
شیعرەکانم وا شێت دەبن، ڕیزی نیزام دەشێوێنن.

***

## شیلە

بۆ گۆرانی

١٩٩٢/١٢/٣٠

تۆ خۆت فەرمووت ئەوە لێوم...
منیش تێرم لێ خواردەوە
بەڵگەنامەی ماچم دایتێ، وەرت گرت و نەت ناردەوە!
کە سەرخۆش بووم بەشیلەی لێو
هەزار خولیام کەوتە سەرێ
داوای نهێنی باخم کرد، زۆر ئازابووی نەت شاردەوە!
دەستم وەکوو منالی هار
خۆی کرد بەناو باخەکەتا
لە گۆلگۆسای[١] سینەی خۆتا پەنجەکانم لە داردەوە
ئێستە بۆچی لێم لووتەلای...
وەکوو بەهاری بێ باران؟!
کردمان داوای ماچێکم کرد، خوێنم دەکەی بەئاردەوە!
من لەدەرگاتانم نەدا...
تۆ خۆت دەرگات بۆ کردمەوە
نوقلی زاری تۆ فەرمووە، مەلێ لاچۆ بەساردەوە.

***

١) گۆلگۆسا: ئەو بەرزاییە بوو کە خاچەکەی حەزرەتی مەسیحی لەسەر داکوترا.



## سووتماکی عەشق

١٩٩٣/١/١١

ئەگەر ڕۆژێ ڕۆژباشم کرد، لات کردەوە
زەردەخەنە لەناو گۆپکەی دەم و لێوتا بریسکاوە...
کەی عاشقم؟
ئەگەر ڕۆژێ لە دەرگام داو وتت کێیە و
هاتیت دەرگات لێ کردمەوە لە ڕێگاوە...
بەناز وەلامی ڕوانینی منت داوە...
کەی عاشقم؟
ئەگەر ڕۆژێ بەرێکەوتێ لەرێ و بانێ
وتم گیانە بێنە دەستت، وتت هانێ،
بەڵێنت دا بۆ جێ ژوانێ... کەی عاشقم؟
ئەگەر کرامە پەردەوە و لەشەلالێ حەزی تۆ دا و
لە گەرداوی هەڵپەی خۆما توامەوە
وەکوو بوخچەی سەر ئاوکەوتوو لەباوەشتا کرامەوە...
کەی عاشقم؟
هۆ خەڵکینە، ئەگەر ڕۆژێ منتان بینی
لە بەرۆچکەی لامالێکدا ڕاکشابووم
نەکەس هەبوو وەلامی سوالم باتەوە
نەکەس هەبوو دەرگایێکم لێ کاتەوە
نەکەس هەبوو بلێ ئەتۆ لە کوێوە دێی، بۆ کوێ دەچییت؟
نەکەس هەبوو بلێ ئەتۆ بەچی دەمری و بەچی دەژیت؟
بە، یار بلێن بێ و بمداتە بەر تیشکی چاو
دام بهێنێ وەک قژی خاو
تا بەسووتان دەردەکەوێ، کە من فەجرێکی صادقم!
ئەوسا لەسەر گشت قبیلەکان،
دەلێم ئێستە من عاشقم.!

***

## دژواری

١٩٩٣/١/٣١

لەنێوانی خۆم و خۆتا وا دژواریی دوور و نزیک
خەوێنراوە!
لەو ساتەوە خۆشم ویستی کات و ماوە دەست لەملن
کە ڕێگەت دام گەردی ڕێگەت بەبرژانگی خۆم بماڵم
خووا ئاسا سەروماڵی منت کڕی
وا، ئالاوم بە بالآتا، بەرزەخ نەما...
هەر هەموویم شەوێک بری
وا ڕەخساوی لەناخمدا، بۆنی ئەندێشەم
هی تۆیە
شیعرم بەڕەزمی لەنجەتە
خەمم جێگەی خۆی گرتووە، ترسی نەما، بێ خەفەتە
ئەگەر کەسێک بەدوای تۆدا عەوداڵ دەبێ
با شیعرێکم لەبەر بکا
با کلاوی سەخری جنێ لەسەر بکا
پێ بنێتە شاری دڵم
هەر گوڵێکی تێدا بینی، تۆ دەبینێ
هەر تۆی گوڵم!

***

## باوەڕەکەم

١٩٩٣/١/٣١

لە ناو دڵۆپە فرمێسکی هەژاراندا بۆنم کردی...
بووی بەچامەم
لە یادداشتی شەهیدانا تۆم خوێندەوە
بووی بەنامەم
وا، باوەڕم پێ هێناویت، حەللاج ئاسا لەت لەتم کەن
چونکە لەخۆما دەتبینم، چونکە لە خۆتا من گومم



هەر (أنا الحق) دەڵێمەوە
بشپوترکێم، وەکوو جاران بۆ کالآی تۆ دەشێمەوە!

***

## ئێوارانێکی سوور

*پەیام لە فەروخی فەروخ زادەوە*

١٩٩٣/٢/١٥

* زەردەپەڕی ئێوارانێک پەلی گرتم بۆ ناو باخێ
زۆر پەنا بوو
شەربە و شووشە و پەرداخێکی لێ دانابوو
دەوری گوڵ بوو، گوڵی سوور بوو
خۆری دەمکەل ئێجگار دوور بوو
دنیا سوور بوو
گوڵێکی سووری کردەوە و دای لەسەرم
دەستی هێنا بۆ کەمەرم
ئیتر هەموو شالآوی خۆی لەجەستەم و لەگوڵ بەردا
لەناو گوڵدا پرواندمی و هەموو جەستەمی تێوەردا
لەتەک خۆرا من ئاوا بووم، ئاوا بووم و هەڵهاتمەوە
کۆڵم سوور بوو،
خۆڵم سوور بوو، شەو هێشتاکە بەری دوور بوو
تانجەڕۆ شارەگی ناوی لەشی هەموو شارەزوور بوو.

* چۆلەکەکان بجریوێن، پەنجەرەکان بکرێنەوە
با شەماڵیش بۆنی کۆڵی کراوەی من وەبەر با خا
من دێمەوە ئەم پەنایە
ئەگەر ئەو بێ و لای ئێواران هەر گوڵێکی کەم بۆ ڕاخا

* چۆلەکەکان بجریوێن، قاز و قولنگ بقریوێن
من بەخەوی ساتێکی سوور بنی مانگم تێپەڕیوە
خۆ دووگیانم... من دووگیانم بەگوڵی سوور

بەخەونی دوور،
بەزەردە پەری ئێوارەی گوێ جۆگەییێکی شارەزوور!
دەبوو ئەم کۆڵەکراوەم وەکوو زۆڵێکی بێ باوک
لە پێش دەرگای مارە برا، زوو دانایە،
کۆڵێکی زۆر کەم بەهایە

* قەلەڕەشکە بقیرێنە، شێری نەریت بشیرێنە
ئەم کۆڵە کەی جێی بڕوایە؟!.

***

## دان پیانانی فروغی کورد زادە

١٩٩٣/٧/١٠

١- وتم جوانووم، جوانوویەکی تووڕە و بزێو
کەس ناتوانێ ڕام بهێنێ.
کە ئەو هات و دەستی هێنا بەلاملما
هەر نازانم چۆن خۆی هەڵدایە سەر پشتم
یەکەم گاردێ کە دام نابوو لەو ڕێگەدا
ئەو نەی ترسان، من خۆم کوشتم!

٢- وتم قەلآم، دەرگام پۆڵای سەوزەوارە
کە بەسواری ئەسپەشێکەی ڕووی تێکردم
قوللەکانم داڕووخان و
دەرگای پۆڵام کرایەوە
هەرچی گرەوم شک دەبرد بۆ پیاهەڵچوون
هەموویانی لێ بردمەوە
هەرچی تەلیسمم تیا هەبوو، هەموویانی بۆ کردمەوە!

٣- وتم ڕووبارێکی شێتم
هیچ کەس ناتوانێ لێم بدا
کە بەسواریی ئەسپە شێوە تاوی بۆ دام
نازانم چۆن خۆی گەیاندە نێرینەم و
بواری خۆی دۆزییەوە



چەندین پردی لەسەر بەستم!
لەو ڕۆژەوە، ئەگەر ئاسمان ڕەهێڵەش کات
من هەر مەنگم، من هەر مەستم!

٤- وتم شیشەی سەرمۆرم و
بۆ هیچ کەسێک ناکرێمەوە،
کە ئەو گرتمی بەدەستەوە، نازانم چۆن کرامەوە؟!
نازانم چۆن بەجورعەیە هەڵیدام و
منی داستان بڕامەوە؟!!.

***

## شووشە بۆن

١٩٩٣/٢/٢٨

بەچاوم وت: تۆ دەتەوێت لەژێر باڵی
چ شتێکا تێر تێر بنووی؟
چاوم وتی: ساڵ بەو عەیام خەونت بینی
من پلووسکی گوێ بانێ بووم
من هێلانەی نۆژانێ بووم
من شارێکی بێ شوورە بووم
ئاگرێکی بێ کوورە بووم
ویستت ژێرم بکەیتەوە...
خۆمم وەبیر بخەیتەوە
چەپکێ شیعری بەنەوشەییت دا بەسەرما
پێڵووم بوو بەشووشەی بۆن و خۆی نایەوە
تا لە جانتای قژ زەردێکی بەر دەرگادا کرایەوە!

***

## بۆ (......) خانی شاعیر و شێخ

١٩٩٣/٣/٣

ئەگەر ببم بەدەروێش و لە ئاستانەی ئەندێشەتا
حاڵم بێ بێ
چیم لێ دەڵێن؟

ئەگەر ببم بەدیوانەی بەر بەیاخی و
لەناو دەستوپێی وشەتا پێ شێل کرێم
چیم پێ دەڵێن؟
ئەگەر بێت و وەک کەمەندکێش لە کۆڕی زیکری
شیعرتا خۆم سەربرم
چیم پێ دەڵێن؟
لە پێش دەمتا چۆک دابدەم، تەریقەتت لێ وەرگرم
بتوێمەوە
چیم پێ دەڵێن؟
ئەگەر تۆ بازی ئەشهەب بی و منیش کەوی لانەوازی...
نێو نزاری فەیزی تۆ بم،
چیم پێ دەڵێن؟
باشە من بۆچی سڵ بکەم ئەم دنیایە ببێ بەچاو...
ڕەدووم کەوێ؟
لەو ڕۆژەوە حەللاج کراوە بەدارا، ئەوەی دەروێشە، دەروێشە.
بەبێ ئازار قەت ناسرەوێ!
هۆ شێخەکەم، هۆ (....) خان...
تۆ لەگێژاوی ئەمرۆما کەشتیوانێکی ڕابەرمی
شتێک نییە شایستەبێ... بلێم ئەوی
بەناچاری هاوار دەکەم تاجی سەرمی
بە تەوازوع بلێی یاشێخ تۆ مویتەدای
دەستە و نەزەر ڕادەوەستم، ناچمە نێو ڕستەشەوە
هەتا نەڵێن تۆ خەبەرمی!

***

## لە وەڵامی (وەڵامی ئەم چامەدا)

من بۆ جاری دەیەمین بوو
شیعرەکەتم دەخوێندەوە
بەڵێنم دا بەسوێندەوە...
ناوت نەبەم!
تا فرمێسکم وەک ڕەهێڵە هاتەخوارێ
شەستی کەیکەم ئێستە کەم بوو



سروودی ڕازی دەروێشی کۆڕی زیکری عەشق و خەم بوو
ڕۆحم بوو بەبرووسکەیێک، هێنامیتە بەرچاوانم...
ژێر لیزمەی شەستەبارانی بێ داڵدە و بێ باوانم
پیت بەپیتی شیعرەکەتم خستە سەر لێوی زامانم
کە من نەبم بەمویتەدا، لەحیکمەتی
خەبەری تۆ چ نازانم!
مەگەر شێوەت وەکوو مۆری
پێغەمبەری بچەسپێتە دەفەی شانم!

***

## گمە

١٩٩٣/٣/٤

کۆترە گاویلکەی شیعرێ بوو
لەسەر پەرژینی چاوانم بای باڵی دا،
زۆری گمان
چاوم باری خەوی خست و گلێنەشم کەوتە جمە
گوێیان ڕاگرت بۆ ئاوازی
قووڵ بوونەوە بۆ ناو ڕازی
تەز بەستەی شاعیرێک بوو کە دەستی برد بۆ گیرفانی
ئەوسا زانی...
شیعر برسێتی ناکوژێ و
برسێتیش واز لەو ناهێنێ!

***

## پێکی چاو

١٩٩٣/٣/٤

شیعرێک لەناخی دڵمەوە، سەرکەوت، سەرکەوت
هەتا لەناو بیلبیلەما بوو بەچرا
بەبرژانگما دەیان گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ
بەم بۆنەیەوە هەڵکرا
منی مەستیش وەکوو بلێی تازە پێکی خومارشکێنم هەڵدابێ

لەگەڵ هۆشما کراینەوە
کاتێ زانیم، خۆم و شیعرم لەپێکی چاوی ژنێکدا...
هێدی هێدی خوراینەوە

***

## ئەو... خۆشەویستمە

١٩٩٣/٣/١١

ئەو، کورە،
نیگاییێکی سوخمەدڕە
چەقۆیێکی نەریت بڕە
ئەو، کورە،
شەوان وەکوو چەخماخەیە لەناو جێما
بەرۆژ وەکوو پانتۆڵێکی بێ ئوتووە، وا لەپێما
بە بەهاران ماسی گرێکە بێ بەلەم، وا لە زێما
بەهاوینان شنەی شەماڵێکی شێتە
سینە و مەمکم دەشواتەوە
بەپایزان داربەڕوویێکی تینووە
عارەقەی من دەخواتەوە
بەزستانان کوانوویێکە پڕ لە سکڵ... کە تەنهابم
دەرگای تینی لەسەر دنیای ئەندێشی من دەکاتەوە
بەناو حەزدا دەمهێنێت و بەناو حەزدا دەمباتەوە.
ئەو، کورە... منیش کچم... نەخێر ژنم
لەژێر تاڤگەی چاوی ئەوا، هەموو جارێک
جلەکانی خۆم دەگۆڕم
ئەو سوارچاکە و منیش نۆماییێکی تۆڕم
ئەو، کورە... من نامەوێت تاپۆم بکات
وەکوو کاڵا لە شۆم بکات
ئەو، نایەوێت من وەکوو تەوق بچمە ملی
ببمە ماستی دەم و پلی!
ئەو، کورە... بەمن شیا
من کچم، بەئەو شیام



لەم چرکەدا زۆر دڵنیام
من کچم... نەخێر ژنم، چی بووە چی؟
هەتاکوو کەی هەر نۆما بم؟
وتمان نەریت قۆزاخەیە
هەتاکوو کەی هەر لە قۆزاخەی خۆما بم؟!!

***

## خامۆشی

١٩٩٣/٣/١٤

شانە هەنگوینی ڕوومەتت، بۆچی گەردی لێ نیشتووە؟
زەردەپەڕی دەم و لێوت...
بۆ پەپوولەی زەردەخەنەی تیا نوستووە؟
بۆن و بەرامەی باوەشت، بۆچی دوگمەی لێدراوە؟
کێ بوو شانەی تەلیسماوی دا لە قژت
لەسەر شانت دەڵێی خەرمانی بێ بایە؟
ئاسۆی چاوی شین و ڕوونت، بۆ پڕشنگی لێ هەڵنایە؟
ئەم بێ دەنگی و خامۆشییە، چ ڕازێکی جوانی تیایە؟
با، ڕاچڵەکێم... تێم گەیێنە...
لە ئاوێنەی کەمەی خۆتا ببمە هەزار و یەک وێنە
توخوا، تو خوا چاو هەڵهێنە...
ئەم شیعرەیشم بشێوێنە.

***

## توحفە

١٩٩٣/٤/٦

شۆخە ژنیت، تەنکە ژنیت یا کیژۆڵە
هەر کاتێک بێیت ماڵی دڵم بۆ تۆ چۆڵە
لەو ڕۆژەوە شیعر دەڵێم چاوەڕێتم
شەوم لێ دێ گوێ قۆڵاخی چرپەی پێتم
خۆم و تەنهایی و جامێک و هەناسەمە
لەناو خەڵوەی ئەم عەشقەدا پێناسەمە

خۆت دەربخە، ئەمشەو کەیلم، دەرگام وازە
دەنگم سۆزە، شیعرم ئەشکی بێ مرازە
کە من سووتام، ئەوە کێیە وەک من وایە
شێخی کۆرە و خامە و خەمی گۆڕی تیایە؟
ئەمشەو بێیتە ئاشیانەکەم، ئەی شۆخەژن...
من لە لێوت بخۆمەوە و عەشقیش لە من
بۆ سبەینێ شیعرێک دەڵێم، ئەم دنیایە
لەبەری کەن. بڵێن ئەمە توحفەی خوایە!

***

## بەش

١٩٩٣/٥/٥

نەبوو نەبوو
ڕۆژێک نەبوو
بڵێم ئەمڕۆم لەدەست نەچوو!
زەوی خولێک، تەنها خولێک خولی نەدا
بە گا بەردێکی سەر ڕێگەم تلی نەدا
لە پەیامی چاوێکی گەش
شیعرێکی من بەشی نەبوو
ئەو دێبەرەی ویستم بیکەم بەباخچەییێک
کەشی نەبوو...
ڕەنگە نەشبێ
ڕەنگە بەختم هەر وا ڕەش بێ!
ڕەنگە عەشقم هەرگیانێ بێ!
ئەندێشەی من هەر ژانێ بێ!
لەشی ماندووم هەرچاوەڕێی وچانێ بێ!
ڕەنگە نەشبێ
ڕەنگە بەختم هەر وا ڕەش بێ
لەشەرابی لێوی جوانان
ڕەنگە ڕۆحم هەر بێ بەش بێ



ئەم ڕێگەیەی من گرتوومە
هیچ دوور نییە نەگاتە شار
ئەو خولیایەی لەسەرمایە
هیچ دوور نییە ببێ بەبار!
دەستی دەمم قەت نەگاتە داوێنی داد،
داد و هاوار
ئەم یاسایە مرۆڤ بۆمی ڕەخساندووە
دەردی لەگیانما چاندووە.
نەکوو هەر خۆم، ڕێگەکەیشم هەر ماندووە!
بەختم نەبوو
ڕەنگە نەشبێ
ڕەنگە هیوام ناوەڕۆکێکی بێ لەش بێ
چاوی شیعری گل تێ بەربووم
با هەر چاوی لەباوەش بێ.

***

## قەوزە

١٩٩٣/٥/١٩

دڵت کردمەوە،
هەر چیت بینی بۆ خۆت بینی!
ڕێگەم بدە، منیش دڵت بکەمەوە
هەرچیم بینی دەیگێڕمەوە...
مەزرای ڕۆحی عاشقان بێ
جێ لەوەڕی چاوی نەوسی کوڕ و کاڵ بێ
یا مۆبەدی موغانێک بێ چاویان وەکوو
مەی بسووتێ،
مەکۆی شیعرە جەردەکان بێ،
بەیانیانیش لەسەر ڕێگای قوتابخانە
لەنجەی ڕەوت و نیگای چاوە دزەکانیان
ژمارد بێ،

هەزار ئۆف و هەزار خۆزگە و هەزار مژیان
بەشوێن پێپەکتا ، ناردبێ
ئەو وێنانەی کە دزیوتن
لەوێ وەک خەم هەڵواسراون
دەیانهێنم بۆ پیشانگەی بەر مەمانت
لەنوێ سوننەتیان دەکەم و
دەیانکەم بەداوی بسکا
ئەگەر دیوانی شاعیرێک لە تاقێکا دانرابوو
ئەگەر وەکوو کاری خودا هەر دەستیشی بۆ نەبرابوو
دەیهێنم و بۆ ئەم دنیای دەخوێنمەوە
بەخەی شیعرێکی کەساسی تیادەگرم و
دەڵێم لێرە تۆ دەبیتە ڕازی قەوزە
ئێر...؟
نە نەزرگەی ئیمامانە و نە مەرقەدی پیر و غەوزە
هەڵسە...
هەڵسە
شیعری قەوزە!
خۆڵە پەتانێی جێ چۆپی باڵغ بوونە
تیا مەگەوزێ
دەروێش قەوزێ!

***

## بەرکوڵ

١٩٩٣/٦/١

دەستم برد بۆ چاوەزاری دەرگەی باخی لەپەرداخا
ئاین، یاسا ، نەریت، کۆمەڵ
هەر هەموویم پیا هەڵشاخا
خەڵکە خۆ من هەژارێکم بێ ئا و نان
خەڵکە قوڕی سەرەتایشم، گیرایەوە بەخەم و ژان
خوایا بۆچی ئەم گشت خەمە؟



من دەمەوێت دوو قوم بدەم
لە هەردوو گۆی ئەو دوو مەمە
ئەی خوایە تۆ لەچیت کەمە؟
خەڵکی لێمی حەرام دەکەن ئەم بەرکوڵەی سووکە ژەمە؟!

***

## گڕ

١٩٩٣/٦/١٢

هەر کە خامەم گڕ دەسێنێ... هەموو پێش چاوم کاغەزە
خونچەییێکم تیا دەکێشێ لێوی تۆیە
گوڵێکی لێ دادەبەزێ، هەر بەتەواوی گۆناتە
بەشینایی ئاسمانی ئەم تابلۆیەوە، دوو ئەستێرەی
کاروانکوژەی تیا هەڵدێنێ... هەردوو چاوتە
تاڤگەی هەنگوینی پاڵفتەم بۆ دەڕێژێ...
هەردوو تاکە زوڵفی خاوتە
کە من سەرم هەنگەژاڵە ، ئیتر خامەم گڕدەسێنێ
لەم کەشەدا ، دەبێ ڕەقیب، چۆن چۆن شیعرم هەڵسەنگێنێ؟!.

***

## مامە خەمە

١٩٩٣

*(ئەم قەسیدەیە بەدەنگی بولبولی خۆشخوانی کورد، هونەرمەند بورهان مەجید کراوە بەگۆرانی)*

مامە خەمە! هاوار بۆ تۆ
خەممان زۆرە، خەممان بخۆ
من لەوی دی ڕازی نیم و
ئەویش لە من...
ژن لە پیاو و، پیاویش لە ژن!
هەر کوێ دەڕۆی هەر غەیبەتە
داوە و قەنارەیە و پەتە
ئەم بۆ ئەوی دیی هەڵئەخات

بە زمانی...
بە ڕێگاوە هەزار پەڵت تێدەگرن و
خۆت نازانی
هیچ کەس خەمێکی تۆی نییە
هیچ کەس باسێ لە خۆی نییە
ئاشنایەتی هەر  هیچ نەما
کێ دەربەستی ئەم وڵات و ئەم شارەیە
لەنێوانی دڵ و دەما!؟
مامە خەمە خەمان بخۆ
تەماشاکە وەرە و برۆ!
ڕەخنە زۆرە و بێ پایانە
بەڵام زۆری بێ شایانە
کەسانێک هەن، هەڵپەی ئەوان
هەر بۆ خوانە!
بەخوا گەر کارمان وا بڕوا
ئەنجامی ڕەش بۆ هەمووانە!
مامە خەمە... خەمان بخۆ
تەماشاکە... وەرە  و برۆ
***

## دڵی- نالی- کە ئەنیسی قەرادەخە، ئێستەش داخی (سەرچاوە) و (دێوانە)ی دار و دەوەنە

١٩٨٩/١٠/١٠

گەلێک سەیرە... لە دوا چۆری ئەم سەدەدا
ئەژدەهاکێ هێندە حەژیای لەسەر شان بێ
ئەژدەهاکی مامە کاوەیش لە تای ئەوا
گاجووتێکی ژێر مژان بێ!!...
خەوم بینی... لەسەر لووتکەی (خنجەرە) بووم
(زەردە) دەستی دابووە بەر ئەژنۆی خۆبی و
سەری نابووە سەر چۆکی



شەماڵ بەناو دۆڵەکاندا بەپێ دزکێ وەها دەهات
سرتەی نەبوو نەش دەکۆکی
(مەیان) وەکو بەرەی بەر پێیی ڕیشاڵ ڕیشاڵ
لەپێ تۆزی لێ نیشتبوو
ئاوی (قەپڵانتوو)ی خێر نەدیو
(مچە کوێر)ی جێهێشتبوو
(کلکەی کەڵوەش) لۆژ دامابوو چۆن بتکێتە چاوی چەمان
تاشەبەردە قورسەکانی ڕێی (تەقتەقان)
بوو بوون بەشایەتی نەمان
ئاوی (دووکان)ی بێ ئاسیا و تەبارەکانی دەڕووخان
(قووچکە) وا سەری سوورمابوو
گۆشە نیگای خۆی دەنووقان
مانگی چواردەی زەرد هەڵگەڕاو دوور تێپەڕی
بەسەر دەشتی (دزیایشا) وەک شەرمنێ
ئەستێرەکان فڕکان فڕکان خۆیان دەکرد
بەناو گەرووی قۆپییەکاندا
بە (سەگرمە) و (عەمارەت)ا، هەتا لووتکە هەڵدەگەڕان
پێیان دەخزا و هەڵدەدێران
بۆ (سەنگاو)ی چۆڵ و وێران
چەمی (دێوانە)ی بێ چرپە بنەوانەی تیا نەمابوو
بەبن کاچ و ژێر قەڕەما ئەشکی کارەساتی دەبرد
دەڕژایە ناو لرفەی (سیروان)
(نارامسین)ی (دەربەنگەور)یش لە شکارا نووچی دابوو
هەرچی حیکمەتی مێژوو بوو لە هەگبەیا
لێی ڕژابوو
تا چاو بڕکا تەماشام کرد، هێندەی تریش
تا ڕووانگەم لە چۆڵیدا نوقم کرد و گەڕامەوە
لە جێی خۆمدا بەلاکاندا خولامەوە
جێ گوندەکان: گەدەی سووتاو و هەڵدڕاو
بەردێ لێرە و بەردێ لەوێ

وەکو بلێیی چۆڵی نەبێ هەتا هەتا هیچیان نەوێ
* شەو دەوارە و ئاسۆ چیخە، تروسکەیەک بەدی ناکەم
بیم گرتوومی، منی داماو بۆ کوێ بچم بۆ کوێ ڕاکەم
هاوارم کرد... هۆ نارامسین، ئیمام (هورمز)
زەردە! دێوان! داربەڕوو!
(دارمازەڵە)ی بەرۆک سووتاو، خەم هەڵگرتوو
چی ڕووی داوە؟!
ساجی ئاسمان بەسەر ئەم شاخ و دۆڵەدا
لە کەیەوە داڕماوە؟!...
ڕێشی گولیی عەجەم هێنای پێچراو بەقیل و قالەوە
تراژیدیای ئەم چۆڵییەش، لە سوورەتی ئەنفالەوە
* ئەم ناو دۆڵە... ئەمە ئەمبەرەوبەر لە سەرەتای ژیانەوە
جێی ژیانە...
بۆچی... کتێب جێگە چینەی خامەکەی کۆڵی ناشییانە؟!
زەردە... دەشێ تۆ دانەوی و چۆک دابدەی
وەک ئافرەتی پێوە پێچراو بەژانەوە خۆت بابدەی؟!
هۆ نارامسین ئەزەنەق بدە و لە چۆکەوە هەڵسە سەر پێ
زەردە، ئەی کێوی ئەفسانە...
کە منالّ بووم باسی خوایان بۆ دەکردم، چەندە گەورەیە
وام دەزانی تۆ خووایت و مێژەریشت ئەو هەورەیە
کە، گەورەش بووم... کاتێک لەسەر تەوێڵی تۆ
زەردەی بەیان دەگەشاوە نوێژی بەیانیانم دەچوو
ئێوارانیش کە زەردەپەڕ لە چاوانتا دەکوژاوە
ڕۆژوو دەشکا و شەو بەردەبوو
هەتا مانگت لە سێبەری برۆکانتا قووت نەدایە
جێ ژوانی شەوان چۆڵ بوو
کاروان کوژەی چاو هەڵتەکێن هێدی هێدی
لە (سپێیین) کۆڵ بەکۆڵ بوو
سەرهەڵبڕە... کێ پێت دەڵێ (لم یلد)ە و داری زڕە
لە شوێن کوانووی، لە کوورەکەی مامە کاوە





چراوگێکی هەڵکراو بگێرەوە
ئاگر بنێ بەم شەوەوە
لەسەرەتای ڕێی خەوەوە
با، کۆڵی تۆ توێشەبەرەی ڕێگەی نوێ بێ
(شاهۆ) و (قەندیل) بەسەرکەوە
زرێ شمشێر نەگەزەکەی نارامسینیش لەبەرکەوە
ڕۆژگار لە بەختی ئێمەدا لە کارەسات بێ خەوەرە
سبەی دنیا پێدەزانێ... کورد کەو نییە، کورد کەوەرە
***

## بایی بوون

١٩٩٣/٧/٧

بەستم، سنوورم، حەسارم
شیعر و ئەندێشە و شکارم
قیبلە و مۆبەد و میحرابم
جامی دەستی پڕ شەرابم
وەکوو تۆفان بۆ ڕامالّە
چێژی هەموویان لام تالّە
دامگرەوە شەبەیحوونێ
وەک برووسکە، وەک هەڵچوونێ
بمخە بەردەستی ڕەشەبا
گوێی مەدەرێ بۆ کوێم دەبا
چونکە من بێ چاووڕوو بووم
داوایەکی ئێجگار زوو بووم
خەونم بەلێوی تۆوە دی!
تەمای وەهام بەخۆوە دی!
بۆ هاوار و نزاو تکام،
دەست و دۆعای بەرەو خودام...
نەکەی دڵت بکەیتەوە
مۆڵەتێکی دیم بەیتەوە

هەر ئەو شێتەم کە ئێستە هەم
لەسایەتا خۆم هەڵدەخەم
ئەمجارە وازم لێ بێنی
خەندەییێکم لێ هەڵبێنی
بێ شک لەخۆم بایی دەبم
بۆ ئەو پەری ئاوات دەچم
پەنا بۆ خەو دەبەمەوە
دەرگەی باخت بکەمەوە

***

## بۆ ئەوەی حەقیقەت نەمان کوژێت پێویستمان بەهونەرە

*(جان جۆی)*

١٩٩٣/٧/١٩

*پێشکەشە بە شێرکۆی شاعیر*

شیعری ڕەها...
باسم مەکە.
هێشتا سەروعوزر شۆرنیت،
با من خامەی هەرزەکاریت تێ بەرنەدەم!
شەرابی تازە گیراوەی،
با من کەوچکی هەڵپەمت تێوەر نەدەم!
بەسەر کێلگەی تازە تۆوتا...
ڕهێلەییێکم دابکا
گەرد و گوڵت بە با دەدا.
تۆش، ئەی پیری...
وەکوو گەماڵی نهێنگر، سەری ڕێگەم لێ مەبەستە
خۆ من هێشتا بەردی هیوام نەخستووە!
با، باخەکان گوێیان لێ بێ:
ئەرێ ئەمە ڕەوای حەقە.
نۆرەم دارەدارەیەتی و لەدارێکیان، جۆلانەم هەڵنەبەستووە!
لەکوێرە ڕێی سەفەرمدا...
چراوگی گوڵێکیشیان بۆم هەڵنەکرد،



بچمە سەر لقی توێشوویێک
لێوم بگاتە هێشوویێک!
هۆ ڕەشبینی...
وام لێ مەکە ئاگری شیعرت تێ بەردەم،
وەکوو گوندی ئەنفال کراو نوغرۆ ببیت.
جەنابت پێم ناڵێی تۆ چیت؟
وەکوو هەناسەییێکی سوار
وا توند یەخەمت گرتووە
لەسەر باڵەکۆنی حەزم وەک شمڵی شەڕ
بەیاخی شێخ و پیرمت هەڵکردووە؟!

***

## ئەنتەر ناسیۆناڵی برسییەکان

١٩٩٣/٨/٩

هۆ برسێتی ئازار بەسە
ئەگەر تۆ پێی لێ هەڵبڕی
ڕەنگە (هاری) بکەم بە نان
ڕەنگە (شۆڕش) بکەم بە ژان
کام عەمارەی لەدەستکردی سەخری جینە، دەیشکێنم
کام خوێنەی زۆر سوور و چەورە، دەیپژێنم
کام تەلارەی زۆر باڵایە
تاپۆی وەکوو ظل الله
هێندە سەری پێ شۆڕ دەکەم تا فیت دەبێ بەهەر دوو پێم!
گۆڕی بابی کام قارچاخچی زۆر پیرۆزە
ڕەنگە ماکەری تیا بـ(...)م
کام کورسیەی پێچکە قەڵەو و تۆکمەیە، هەڵیەدێرم
ئەو یاسایەی برسێتیمی لا ڕەوایە
ئەی کەم بەئەڵقە بۆ (...)م.
کە برسێتی لای لێ بریم...
شتێک نییە بلێم نایکەم، شتێک نییە پێی نەوێرم.

***

## سێ تاوان

١٩٩٣/٨/١٣

١- لەبەر دەرگای مزگەوتێکا خێریان دەکرد
سەڵەواتم دا لە نانێ
کە وەرم گرت لە پەناییێکی تاریکا، دام بە (...)ێ
هەر خوا خوام بوو، خوا بەولاوە هیچ کەسی تر پێی نەزانێ.

٢- لەبەر دەرگای کەنیسێکا...
کتێبێکیان دابەش دەکرد
وەرم گرت و زوو فرۆشتم
چارەکێ مەییم پێ کڕی
کە دوا چۆڕیم دا بەتاسەم
پەردەی کچێنیی خەونێکی دوێنێ شەوی خۆم پێ دڕی
بەگونمەوە هەرچییان وت
بە(...)مەوە هەر کەس تڕی.

٣- لەبەردەمی بارەگایێکی گەورەدا...
چەپڵە ڕێزان هاڕەی دەهات
پاڵەپەستۆ دەستی پێ کرد...
خۆتان لادەن ئەوا خۆی هات
لە گیرفانی یەکێکیاندا بەرنامەی کارم دەرهێنا
پێخوێیێک قوڕ بوو گیراوە
خۆم خەریتەی شەهیدانم لەبەرابوو...
هەتا تەوقی سەرم تێنا!.

***

## پێداچوونەوەیێک

١٩٩٣/٨/٢٤

١- وتم خونچە بکرێرەوە و ببە بەگوڵ
وتی: بۆنم دەدەی بە با؟
وتم: نەخێر؛ تۆ ئەو ساتە زۆر جوانتری



- بەڵام زووتر هەڵدەوەرێم-
- خۆ گوڵ هەر بۆ هەڵوەرینە
- خەونی عاشق نەجێی دەوێ، نەپێویستی بەسەرینە.

٢- هاوین دێت و دەمسووتێنێ
پایز دێت و کفنی سەرمای لەدەستایە،
زستان دێت و تەرمی شەختەی لەسەر شانە
کە بەهار دێت دەبم بەبار...
ئەم ژیانەم لەلا ژانە
ماڵۆچکەی ئەم خەم و داخەش هەتا ئەمڕۆ بێ سەربانە!

٣- «شێرکۆ» ڕۆژباش -شیعرێک وتی-
لەدەربەنی پەپوولەوە سەداییێک هات
هەموو بەردە قارەمانان کەوتوونەتە نێو بازنەی
دەنگی تۆپی سیخ و گورگە!
گاردەکانیش دەستیان لەسەر دڵ هەڵگرت و
ئێستە دەستیان لەسەر ورگە!
-شیعر چۆنە؟-
ئەمە پرسیاری سوارێک بوو
لە دەربەندی پەپوولەدا جەنگاوەرە
لە چاخانەکەی شەعبەوە کترییەکی سارد بووەوە
هاواری کرد:
بەقەولی ئەحمەدی میرزا، مویتەدایە و بێ خەبەرە
شێرکۆ وتی: تۆ بێ دەنگ بە
خۆم وەڵامی وام لەبەرە...
منیش ئەرکی وام لەسەرە!

٤- ئەوە ئێوارەی هەینییە و سەرچنارە
ئۆتۆمبیلە چاو جوانەکان پێنج هەزارن
مەیخانە زۆر، کەبابخانەکان دوو سەدن
خانمەکان بەشیش کەبابی سەفەری لێو خڕ دەکەن

شەقامەکان بەم بەرامە خۆ مڕ دەکەن
خواپێداوی ڕێی ئەنفال و دوای ڕاپەڕین
گوێی لە بۆرسەی نیۆبۆرکە و سەلامیشی لەبەغدایە
ئەم ولآتە -تۆ پێم بڵێ- چ بەشێکی منی تیایە ؟
ئەی ئەگەر من جنێو نەدەم تۆ لێم زیز نابی خودایە ؟!!

***

## بازیبەن

١٩٩٣/٨/٢٤

هەردوو دەستی خۆم هەڵبڕی -وایانزانی-
نزاییێک بوو سەری هەڵگرت
نەیانزانی گرێیەک بوو بۆم نەکراوە
نەیانزانی تەنها قومێکی زۆر خەست بوو هەر نەمتوانی بیخۆمەوە
نەیانزانی هەڵبەستێک بوو
هەرچەندم کرد پیتەکانیم بۆ ڕێک نەخرا
کۆڵەوژێکی گەرم بوو.
سەد فووم لێ کرد نەبووە چرا!
چییان لێ بکەم. ئەی چۆن چۆنی وەکوو نوشتە
بیانخەمە بەرگێکەوە و وەک بازیبەن لە قۆڵی کەم
یا وەک خورجی خەمەکانم لەمرۆژەدا لە کۆڵی کەم؟!

***

## هاتم

١٩٩٣/٩/١٨

هاتم... دڵم کردۆتەوە
عەیامێک بوو دام خستبوو
بەناوچاخی خەم و داخا وەکوو شەقام ڕام خستبوو
کە دەستم برد بۆ قەڵەم و کاغەزێکم خستە پێشی
برووسکەییێک لەسەرمەوە گەیشتە چاو
وردوخاش بوو وەک ڕووبەری میناییێکی بەبەرد شکاو
بوو بەلێزمەی ڕووندکان و بەسەر ڕووما هاتە خوارێ



وەکوو ڕەهێڵەی بەهارێ
وەکوو تاڤگەی ڕامانێکی پێش نیگارێ
کە ڕوانیمە ئەو ئاوێنەی...
دەست ڕەنگینی شیعرەکانم بۆی هێناوم
مانگی ڕووی سووری خۆم بینی
وەکوو دەروێش کەوتمە، حاڵ
لە مژدەی ئەم خۆشییەدا هەرچی شیعر و پەیڤم هەیە
وەکوو مناڵ
ئاخاوتنیان بوو بەسروودی گڕوگاڵ!
وتم ڕەنگە خەو ببینم، ئەمە لە بەختی من دوورە
بەختم وەکوو توونی ئەنفال
هەر بەتەمای پۆپەشمینی شارەزوورە!
وتیان یا شێخ ئەم پاداشتە هەر بۆ تۆیە
ئەم یاداشتە هەر بۆ تۆیە
تۆ شاعیری شەهیدانی
گۆرانی بێژی ئاهەنگی کوردستانی ئاوەدانی!
چوویتە لای هەر تێکۆشەرێک
قەدری سوحبەتی دەزانی.
شیعرت بارگە و بنەی بووکە و
تەلمیت بەندانی باوانی.
تەشتی تۆ داواخوازی ئازادی و گەورەی پڕ لەنانی
بۆ نیشتمانی ئەو خەمەی، بوو بەبادی خۆشمرووری
مەلا خدر،
بوو بەخەونی خۆشی خانی!
بوو بەبلوێری لای لێوی مام هێمن و هاوڕێکانی!

***

## وا نەزانیت وشک دەبم

من ئەو تۆوەم: بەبارانی سەرپەڵەییێک دەڕوێمەوە
دەبم بەگوڵ دەکرێمەوە
دەبم بەمەی دەخورێمەوە

لەبازاڕی دڵداراندا، من ئەو قەرزەم دەدرێمەوە
هەر گوڵ زۆرە، بەیانییەک لەناو گۆڕێکەی یەکێکیاندا
وەکوو ئاورنگ هەڵبێمەوە.

***

## دەچم بۆ لای

دوێنێ وتم دەچم بۆ لای
دەبم بە سێبەری باڵای
دەنگێ لەودیو گەردوونەوە، وتی نەکەی
پەنا بۆ شیعری وا نەبەی
ئەو کەشتییەی کە خۆی دەخاتە زریانێ
دەبێ ڕێ و بانی بزانێ
ئەو! زریانی بێ ئامانە
ئەو! سیحری ڕێگەی چاوانە
ئەو! داستانی گەردەلوولی عەشقی تۆیە و
حیکایەتخوان لێی سەرسامە
تۆ میحرابی حەللاجێکی
ئەویش خاوەنی پەیامە.
دەچیت بۆ لای؟... بەڵێ دەچم!
ئەوا، وتمان شێتیش دەبم
چوونم بۆ لای نەک هەر شێتی گیانیش دێنێ
چوونم بۆ لای نەک هەر شیعر،
(أنا الحق)م تیا ئەچێنێ!
حەللاج ئەگەر سووتان نەبێ، دەپێم بڵێن چۆن دەمێنێ؟!!

***

## بۆ شەهیدەکانی قازانقایە

١٩٩٢/٩/٣

ڕۆژگار ڕەش بوو
شەوگار دێوی دەم کراوەی بیم و خەش بوو
دوژمن ئێجگار دڵنیا بوو
لە گۆڕیدا وای دەزانی کەس نەماوە



ولات ئاشی ئاو کەوتووە یا زاوایەکی ناکامە و بەفووی ئەوانگەل بەسراوە
ئەگەر شەوێ تروسکەیەکی بدیایە
ئەگەر ڕۆژێ کەف و کوڵێ ساز کرایە
ئەگەر لە سێبەری دالا پێچکە تفێ ڕۆ کرایە
خۆ عەرشی خوایش لە لێزمەی
ئاگرباران نەدەخەڵست
پڕ بەم دنیا پەتکە پواوی عروبە و سۆشیالیست و
ئیسلامەتی بۆمان دەڕست
هەر کوێ دەچووی هەر (وحدە) بوو
هەر کوێ دەچووی (رسالە) بوو
هەر کوێ دەچووی پاپە (صدام) وەکو کلاش و کالە بوو
هەر کوێ دەچووی ئەوەی دەتبیست هەر (قال)ە بوو
هەر کوێ دەچووی هەر (بعثی) بوو وەک عالەبوو
ڕۆژگار ڕەش بوو
شەوگار دێوی دەم کراوەی بیم و خەش بوو
کێشە کێشەی گیان و لەش بوو
لەلیان لە زاران بڕیبوو
لاقان لە کۆتان نرابوون
هەرچی ناوی کوردستانە بەزاراوەی (حكم الذاتي) قڕ کرابوو
دەمی کتێب و دیوانان داخرابوو
ملی قەڵەم بادرابوو
برا جاسوسی برا بوو
درۆ ناکەم ئەگەر بڵێم چاوی بەیان داخرابوو
دوژمن وەکو کۆڵی سوارێ دەهات دەچوو
دروشمێکی هەڵکردبوو:
(دە ساڵە هەر لە پێناوی کەرامەتا تێدەکۆشین) بەڵام نەبوو
(وحدە) و (حریە)ش دە ساڵ بوو لەسەر دەم بوو
بەڵام دەنگی ناو پانتۆڵی پڕ لە تەم بوو
ئەمە حاڵ بوو
بارودۆخ پیتی بێ خاڵ بوو

کوڕە کوردە جەربەزەکان
بێچووە شێرە نەبەزەکان
بەرماڵی شاریان هەڵتەکان
پشکۆ پشکۆ خڕبوونەوە و بوون بەگڕکان
شوانە، ئاشتی، سمکۆ، ڕێبوار
هزر و کردار
چوون بەیەکا شریخە بوو
کۆبوونەوە و برووسکە بوو!
نەزرگەکانی ئەیلوولیان داگیرسان و
باوەڕ و چەک جووتەیان گرت
شۆڕشیان بوو!
لەو ڕۆژەوە داڵی تەپۆ ئەو باوکەی مرد
لەو ڕۆژەوە ئیتر دوژمن بوو بەسۆزانی بەخروک
هانای بۆ داوێنی ئەبرد.
لەو ڕۆژەوە هاوارمان کرد، هاوارم کرد
دەخڵ دروێنە و خەرمان شەنیەوێ
سووری خەرمانیش شەخڵ و مەنیەوێ
ڕێگەی ئازادی و پێشڕەوی کارا
عاشق و بووکی بێ پەچە و تارا
ئاواتی کورد و دەستی سەر خەنجەر
شۆڕش و چەک و باوەڕ و سەنگەر!
برام کەمال، خوشکم حەپسە، کاک عوسمانی جگەرسووتاو
پوورم ئامین، دایکی ئاشتی، دادەم حەلاو
جگەر گۆشەتان دا بەکورد...
دڵم لە تەک دڵتانا بوو گڕی دەگرت.
هاوارم کرد ئەوە چیبیە... وا تەپەت دێ و هەڵدەپەڕیت؟
وەک چۆلەکەی سەربڕاوی
دوا ئەزنەقی خۆت دەهاوی
وتی ئەمشەو خەمەکانت هێندە زۆرن
جێی هەموویان نابێتەوە.



جمەیان دێ، وا خەریکە دەرگای خڕم دەکرێتەوە
نەکوو منیش لەناو قەفەزی سینەتا بتەقێم و لە گۆ کەوم
وا دەمەوێ خۆم هەڵبدەم، لە سینگتەوە بێمە دەرێ
بەڵکو شیعرێ ئەم دادەی من بۆ مەجلیسی یاران بەرێ.
بڵێی شیعر دادم بدا؟
ئەندێشەم هێند بەتوانا بێ؟
شیعرێکی وای لا سانا بێ؟
یاران دەبێ چیم بۆ بکەن، چیم پێ بڵێن؟!
بۆ خوا وای کرد هەر خەمی قورس بۆ شیعری من بێ بەهەوێن؟!
برام هەر باوکی شەهیدێ، خوشکم هەر دایکی شەهیدێ
گریانی من چڕیی گەرمە شیوەنتانە
باڵام کۆتەڵی خەمتانە
خامەم، زارم، بەیتم، پەیڤم پەیامی دڵ و دەمتانە
ئەوسا گریاین بۆ شەهیدان، ئێستەش دەگرین
برینی وا بێ پەترۆیە هەتا دەمرین
خوشک و برا ئەوسا خەمم وەک خەمتان بوو
ژەمم بەشێک لە ژەمتان بوو
قەڵەمەکەم پەیامبەری کڵپەی دڵ و هاواری زار و دەمتان بوو
کات ناسکە، بارودۆخمان لارە ڕێیە
گوێم لێ بگرن قسەم پێیە:
هاوارم کرد، هاوار بکەن...
هۆ سوارەکان... هێشتا سەری مەیدان دوورە،
هێشتا دوژمن چاوی سوورە
دامەبەزن تاو ئەو تاوە، هەل ئەمڕۆیە
ئەمڕۆ هەر ڕۆژی کورد کوردە، نە من منە و نە تۆ تۆیە
دەرس وەرگرن... دەرسێک و دوان
دوو دەرس و... سیان... سێ دەرس و چوار
دەرس وەرگرن، هەر نووچێک و هەزار خەسار
دەرس وەرگرن هەل ڕەخساوە
قیرائەتی سەبعەی ئەنفال...

هێشتا لەناو بڵند گۆدا خوێناوییە
هێشتا بن باخەڵی دوژمن یۆرانیۆم و کیمیاوییە
هێشتا هەڵەبجەی شەهیدمان...
بەدوای گۆڕی بێ گۆڕاندا هەر عەوداڵە
هێشتا سروودی سەپێنراو هەر بۆ پەرستنی داڵە
دابەزینیش، بەچاوانتان، لەم دۆخەدا بۆ پێچاڵە
دەرس وەرگرن... دەرسێک و دووان،
دوو دەرس و سیان، سێ دەرس و چوار
هاوار هاوار... هاوار هاوار!

*

خوشک و برا، ئێستەش خەمم وەکو ئێوە بارگرانە
ئێستەش ئەشکم کە دێتە خوار وەکو ئەشکی ئێوە گەرمە
ئێستەش هەزار شت دەبینم، ناوبردنیان لەلام شەرمە
وەرن لەگەڵ منی ڕەزمی خەم و خوێنا پەڕەی کێتبان بکێڵن
بەختی ڕەشمان لەناو دێڕی سەرەوژێرا بەردباران کەین
واعیظەکان بەپەندی گوند و شاران کەین
بۆ وشکە ساڵی ڕەوشتی نێو کۆمەڵگا نوێژە بارانەی جاران کەین
خوشک و برا خەمی ئێوە و خەمی منیش
خەم هەر خەمی ئازادییە
خەم هەر خەمی کوردستانە
دایکی خەمان... خەمی ئێمەی بێ بن بان و بێ سەربانە
دایکی شوانە، دز بارانە
دنیا دنیای بورجوازی ناوشارانە
دوژمنەکانی ئارام و ئاشتی و شوانە!
دوژمنی کورد یەکێک نییە و دوانە و سیانە

* بورجوازەکان...
لە کومونەی پاریسەوە شووڵی ئازارتان دەمکوتێ
ئۆکتۆبەریشتان ڕووخاندم
تۆوی هەزار چەشنە کرمی ناکۆکیتان تێدا چاندم



لەناخەوە سەدان جارتان هەژاندووم و
ئەمێستەش هەردووڕێیانە و منیش ماندووم
ڕێگەمتان وا شێواندووە
سەر هەر لە بیری خۆم دەسووم
لە قۆناغی تێکۆشاندا، چەند جار وتم
فەرموون ئێوە بۆ پێشەوە؟!
ئەو ساتانەش خۆم دەجەڕاند بەدەرد و زام و ئێشەوە
بۆ کوێم دەبەن، من برسیمە، من سەرمامە
جەستەم هەمووی جێگەی زامە
کرێکارم... کارم نییە
وا نەزانن هەر ئەمساڵم، ئیتر چاوی پارم نییە!
یا وڵاتم، شارم نییە!
بورجوازەکان بۆ کوێ دەڕۆن، بۆ پێدزکێمان لێ دەکەن
خۆ من و تۆ لەهەر کوێ بین هەر نەوەی ئاو و خاکێکین
هەردووک شارۆی بەرکۆشێکین، پڕ چاکێکین
من سروودی ئۆکتۆبەرم هەر لەبیرە
من کومۆنە، هەنگەژاڵی ئەم ڕێگەمە
نەتەوە هەر نەتەوەمە و واریش هەر وار و جێگەمە
پێویستە من شووڵت بکەم، لە جێی خۆتا ڕاتوەستێنم
جا ئازادی بۆ وڵات و ژیان بۆ گەل دەڕەخسێنم

* خوشک و برا... هاوارم کرد، هاوار بکەن
با ئێش نەگاتە ناو گەدە
با ڕۆژ نەگاتە ڕێی سەدە
با ئازادی نەبێ بەقوربانی نانێ
ژەمی بێ ژەم دەست نەنێتە بینی ژانێ
شاعیر شیعری خۆی نەخاتە بەردەست و پێی شەو لەبانی

* دایکی ڕێبوار، ڕێگە سەختە
هەزار ساڵە کورد بێ بەختە
هەزار ساڵە کەڵەشێرمان دەخوێنێت و هەر ناوەختە!

دەبێ خۆمان سەری بڕین هەتا سەری خۆمان نەخوا
لەشگرانین، نوێژمان دەچێ ئەگەر ڕێکەوت لەشمان نەشوا
ئای لەم بەختە، لەم ناوەختە
ڕێ دژوارە، دایکی ئاشتی... ڕێگە سەختە
هەش بەسەرم، هەزار ساڵە کورد بەتەمای تاج و تەختە
هاوار بکە لە سوارەکان... دانەبەزن
لە پەناوە با بن دەستی یەک نەگەزن!
تاو ئەم تاوە، هەر ئەمڕۆیە
ئەمڕۆ هەر ڕۆژی کورد کوردە، نە من منە و نە تۆ تۆیە.
هاوار بکە لە سوارەکان: کوردایەتی،
خوا کردوویە بەئایەتی!
لو قامت القيامة لن تنكس رايتي
تەباییبە و برایەتی
ئەمە بەڵێنی بەرە بوو
مێژوو خۆ تۆش هەر شایەتی!

* دایکی سمکۆ ئەگەر خەونت نەهاتە دی
خواوەند بۆ سەر ئەم کۆلیلە ڕابهێنە
گۆڕی بابی گێرە شێوێن لەناخەوە هەڵتەکێنە
فرمێسکی خۆت بهۆنەوە هەزار دانە
تەزبێحاتی لەعنەت بکە بۆ دیداری ئەو کەسانە...
خوێنی یادی شەهیدانیان لەلا وا سووک و هەرزانە!

* قایل نابم
کورد واتەنی... خوا بەو ڕۆژەی نەکا و نەکا
ئەگەر کلێپەی ڕاپەڕینمان کوژایەوە
ئەگەر خوێنی برادەرمان ڕژایەوە
هەنگاو هەنگاو بەرەو دواوە کشاینەوە
بەسەر شوێن پێی یەکتریدا بەقلێپە قلێپ ڕشاینەوە
ئەفەنییەکان دابنیشن هۆ و هۆکاری
نەگبەتیمان بۆ ڕیز بکەن



مەزرای یادی شەهیدانمان بۆ پیس بکەن
ئەفەنییەکان ئەوە دوێنێ، ئەمەش ئەمڕۆ
ئێستە وەرن چارەی دەردان دەستنیشان کەن
دایکی هیوا ژانی لێ سارد نەبێتەوە
لەنوێ داوای گەرمە ژان کەن
وەرن ئێستە هۆ و هۆکاری بەدبەختیمان لە بۆ ڕیز کەن
وەرن لەناو بارودۆخی ئەمڕۆماندا پاک و پیس کەن
پاک پاکترکەن ئەوی پیسە سەرکۆزەرە
ئەوسا نۆکەر، بۆیەش کرێ بەخوا ئەمڕۆش هەر نۆکەرە.

* دایک و بابی هەر شەهیدێ! خوشک و برای هەر شەهیدێ!
خەمم هاوکێشی خەمتانە
وەلیم دیوانەی شەمتانە
زینم ئەڤینی مەمتانە
سیامەندم بۆ خەجێتان هەناوی خۆی کرد بەدارا!
دەروێش ئەولام بۆ گۆرانتان
شمشاڵی نا بەلێوەوە لەناو شارا
شیعرم بۆ ئێوە کرد بەنان لە کۆڕەوی بێ ئاقارا.!

* هاوارم کرد لە شەهیدان، هاوار بکەن لە شەهیدان
پێیان بڵێن سەربەنەوە،
با حیزبەکان گوێیان لێ بێ مشیر وا بەدەربەنەوە
چش لە ئێمە برسیمانە دەربەندەکان نەکەنەوە
مشیر هەموو گوێ قولاخن. جوابی وەڵام بدەنەوە
ئەمجارەیان بەردەقارەمان شەرمن بێ مردن چاکە
گوێتان لێ بێ، هاوڕێ، هەڤاڵ، مامە، کاکە!

***

## گوڵ باران

١٩٩١/١٠/٢٣

*لەسەر ڕەوتی سوارچاکانی شیعری کوردی*

حۆزگە دەمزانی ئەم دڵە شێتەم بۆچی ناسرەوێ
هەروەکوو ساوا وڕکی گرتووە و تۆی لەمن دەوێ
خەونێکی خۆشە، ئەگەر بێتە دی شاباشی عیشقە
منیش دەپرسم تۆ بڵێی هەلی وای بۆ هەڵکەوێ؟!
دەسا ئەو ساتە دیوانێ دەڵێم بۆ خەونامەکەی
چونکە لەم خەونە خۆشتر نابینێ، ئیتر ناخەوێ
دەبم بەپەیکی پەیامێکی وا گیان بهەژێنێ
جا ئیتر چەندم لەسەر دەکەوێ، دەبا بکەوێ
خۆ دەرگای دڵم هەر لەسەر پشتە بۆ پێشوازیتان
دە فەرموو قوربان، گوڵبارانت کەم وەکوو پێشڕەوێ
بامنیش شەوێک شایەتی حاڵ بم بۆ ئەم ژوانە
وەکوو ئازادی و ئازادیخوازان من تۆم خۆشەوێ

***

## بۆ هۆنەر «شێخ سەلامی» نەمر

١٩٧٠/٢/٢٥

له خامەی خۆم ڕەوام بینی، بەگیانی هەست و بێداری
کە چەپکێ گوڵ لە هۆنراوەم بهێنم بۆت بەساکاری
لە دامێنی گڵی سەوزەت لەگەڵ پیرۆزەکەی یادا
بەئەسپایی لەوێ داینێم. وەکو ئیکلیلی مرواری
وەکو حەق ڕوون و ساکاربووی ڕتووشی هەر نەبوو وێنەت
لەناو هۆنراوەتا، دیارە، لە ناحەق چەندە بێزاری
هونەرمەندێکی هۆنەر بووی دەست پاک و دڵت پاکژ
مەلی هۆنراوەتت هەڵدا لەناو گولزاری هاوکاری
لەگەڵ پیرەی دەسەوگۆچان لە ڕێگادا کە یەکتان گرت
بزیسکەی گەرمی بێزاریت، گڕی بەردایە ناچاری



لە دونیای شەو وەها توند بووی، توانجت گرتە لای ئاسمان
کە بۆچی شەو وەها زەنگە؟ کە بۆ قورسە وەها، باری
هەموو کاتێ دەس و خامەت لەگەڵ دڵتا وەکو یەک بوون
نە خامەت دڵتی ئێشان و نە دەستت خامەتی هاڕی
لەگەڵ (خەیامی) بیر و مەی، ئەوەندە ئاشنا و دۆست بووی
بەسەر باخی گوڵی تۆدا، پەیامی هۆشی ئەو، باری
لەگاپیرێ، کە ئیستیعمار، لە جووتی بەستبوو هەر دەم
بشێلێ خاک و تۆوی کا. مرۆری زۆر و بەدکاری
دەستت لێ دابووە دارێک سەر و گوێلاکی بشکێنی
نە خۆی ئیتر بمێنێت و نە گاجووت و نە هەوجاڕی
دەنگت دیارە لەناو کۆرسی سروودی هەوڵ و ئاواتا
ئەڵێی کوردە لەخەو هەستن بەیەکجاری، بەهۆشیاری
هەموو زامێک کە ئەکرایە لەشی کاروانی مەینەتمان
بە ئاهو ئەشکی خۆت ئەت شت نەبێتە زەخمەکەی ساری
بەهەر پێدەشت و شاخێکا کە کاروانمان شەوێ ڕەو کا
سەری ئەو ڕێچکەیە ئەگرێ، بەدەنگ و ڕەنگ لەوێ دیاری
کە دڕنی دا، شەوی تاریک لە ئاسۆی بەرزی کوردستان
بە ڕۆژی بیری ئازاد و پزیسکەی خاکی زاماری
لەگەڵ حاجی، لەگەڵ بێکەس، لەگەڵ گۆرانی هەرگیز ماو
دەس و خامەت لەوێ دیارە ئەکێشی نەخشی ڕزگاری
سەلام ئەی هۆنەری ئاشتی ژیانت خۆش ئەویست ژین بێ
کە لایەق بێ بەئینسان و بەگوێرەی بەرهەم و کاری
دروودی من دیاری بێ لەجامی ئاڵی نامەمدا
بەتۆی پێشکەش ئەکەم یاشێخ، بەئاوازی نەی و تارێ
هەتا دەنگم شەماڵ بیبا بەکوردستانی شیرینا
ئەبێ تۆماری کەم ناوت لەسەر بەردێ لە سەرداری

***

## من و شتەکان

١٩٩٣/١٢/١

من کە ئەستێرە دەبینم شەوانی هاوینێکی فێنک وا دەزانم:
ئاسمانی دز شەبەیخوونێک داویە بەسەر باڵی چاوتا
لە وەنەوزا خەون و پرشنگی دزیوە
کە سوورەتی (الرحمن)یش دەخوێنمەوە وا دەزانم
چامەیێکی دیوانی تۆ بەسەر بەهەشتا وەریوە
کە چاو دەبڕمە ئەو باڵات، وا دەزانم
هەرچی باڵا هەیە کوڵە
بۆم ناپێورێ، چونکە هەموو بستێکی ئەو
بسکی هەزار چەشنە گوڵە!
کە ڕوو دەکەمە ئاستانەت، وا تێدەگەم
زەوی هەمووی هەر پیرۆزە.
ڕەوایە بۆم لەهەر کوێدا ئەگەر نوێژی خۆم دابەستم، سوجدەبەرم
لەبەر دەرگای ماڵ و حاڵتا...
داینەوێنم فەرقی سەرم!
ڕەنگە دەستم وەکوو واشە دابێتەوە بۆ سەر سینەت
گاردی دوگمە پەنجەکانم بقرتێنێ
لەو باخەدا وەکوو هێشووی پوورەهەنگی
بەهارانێ جێ بمێنێ.

***

## ئاگردان

١٩٩٣/٤/١٨

پەنجەم بوو بەکۆڵەوژو
ئاگردانی خۆڵ لێ نیشتووی برینەکان تێک وەردەدەم
ژیلەمۆیە
برینی سەر برینەکان بێ پەترۆیە
کارێکی وا لەم دەربەنی پەپوولەدا



لەجێی خۆیە!
من نامەوێ کوترە گاویلکە و پەپوولەش دەربەنەکانم لێ بگرن
من نامەوی بارەکەوی شیعرەکانم لەژێر باڵی دایکانەدا
لەپێشوازی زستانێکا بێ دەنگ بمرن
من نامەوێ جوانووی وشە لەژێر دەست و پێ و
چەپۆکی باوکانەدا شەل و کوێر بێ
من نامەوێ پیتەکانی سروودی ڕێی خەم و ئازار
ئەبجەدێک بێ، هەر چاوەڕێی سەر و ژێر بێ
زمانیشم کۆڵەوژە و ئاگردانی خۆڵ لێ نیشتووی
پشکۆی نوستووی نێو کتێبان دەتەکێنێ
زمانی من کە شێت دەبێ (ساڵە شێتە) و
زاری، جنێو دەتەقێنێ
کێ لێم دەگرێ؟ ئەوە دایکی پشدەرمانە
هێشتا گیانی پڕ لە زامە
برین کێش و سەرەوایە و دەشتی برین شیعرە و چامە
شاعیر پەنجەی کۆڵەوژەو
شاعیر زمانی خۆی دەکا بەکۆڵەوژ
لەژێر باڵی هەوری خۆیدا پەترۆی زامانی شەن دەکا
زامیش نهێنی پەترۆ بێ، ڕۆژێک خۆیشی بەپەن دەکا
ئەوە دایکی پشدەرمانە، سەر و کڵاوی سووتاوە
ئەوە دایکی پشدەرمانە ئێستەش چاوەڕێی لانکەیە
بۆ ئەم سکەی پێی دووگیانە
ئەوە دایکی پشدەرمانە، چەند ساڵ دەبێ لەسەر ژانە؟
چەند ساڵ دەبێ لەناو کۆڕی سیاسەتدا
سەر تەیکەیێک قسەی پانە؟!
کێ لێم دەگرێ ئەگەر هاتمە قەڵادزێ
لەسەرەوە بەردبارانی هەر دوو زێ کەم؟
ئەو شاخەشمان زۆر بڵندە و جێگە ڕەبیەی تێدا ماوە!
ئەو زێیەمان زۆر پاراوە و
کە بەعسییان سەریان تێژەند، بۆ لە تینوا، نەخنکاوە؟!

ئەو گەورەمان پارووی چەورە و کوردێ دەبینێ هەژارە،
ئەو مەنسوولەی سواری سۆپەر و سوێ بەرەو،
ژنە کوردێکی لەچک ڕەش نانی لەسەر کۆڵەدارە...
یا پاشماوەی هەڵپەی گەڵی قاچاخچییەکی ناو شارە؟!
ئەم بەهارە، چەند بەهارە
شیعرم خۆڵی بن دیوارە؟
دیواری ئەو خانۆچکەیەی
ئازاری ئەم شارۆچکەیەی تیا تۆمارە
لە ڕۆژنامەی فیشاڵ ژنا، چەند ساڵ دەبێ سەر وتارە؟
هێشتا گیانی هەر برینە و هێشتا دڵی هەر زامارە
شیعریش لەتەک خەمی خۆیا
ئاگردانیشی سەربارە.

***

## فرمێسکێکی ئەوەڵ سەحەری بۆ عبداللە میدیای مەنگ

پەخشانە شیعر

١٩٩٦/٨/٥

درەختێکی مەنگ، چاوگەییێکی ڕوون
سەرێکی پڕ لە ئەندێشەی شاعیرانە
دەروونێکی پڕ
خولیایەکی سەیر
ڕاستگۆیەکی پیاو
خەمێکی قەڵەم بەدەست
دەفتەرێکی بەئاگا و هۆشیار
بێ پەروایەکی ئاشتیخواز... کە دەتبینی دێت و دەڕوا
وات دەزانی ئەو سەر زەوی لەچڵکی زۆرداران دەشوا
سالانێک بوو من دەمناسی
هەر ئەو پیاوە، هەر ئەو خەونە، هەر ئەو خولیا و هەر ئەو هزرە
دوور لە ئاپۆرای چەواشەی بەردە و بگرە
تابلۆیەک بو بەخۆڕسکی نەخشێنرابوو



ئایدیاڵ بوو ماتریاڵ بوو
دیوانە شیعرێکی ڕۆمانسی و زۆر سەرقاڵ بوو
دەیگوت جامی من ڕاستییە
دەیگوت ئاشتی خەونی منە
دەیگوت جەستەم وەک بستێکی ئەم خاکەیە
دەیگوت دڵم وەک کانزایە
دەیگوت خەونم بارانێکی هێندە خوڕە دوایی نایە
دەیگوت من لە هەژارانم
دەیگوت سندووقی سوحبەتی کۆڕ و مەجلیسی یارانم
ئەمە هەمووی میدیا بوو، مامۆستا عبداللەی خۆمان
ئەمە هەمووی عاشقێکی خاک و گەل بوو
ئەمە چیرۆک بوو بۆ منداڵ
ئەمە ڕۆمان بوو بۆ خەڵکان
ئەمە شانامەی کوردی بوو نەیانزانی بیخوێننەوە
ئەمە دڵێکی تۆراو بوو، پەریان نەچوون بیهێننەوە
ئەمە عبداللە میدیا بوو هاوڕێی عومرم
ئەمە عبداللە میدیا بوو هاوخەمی خەم
ئەمە دڵۆپە باران بوو قەتیسی نێو گڵێنەی تەم
ئەمە دارێکی گەورەبوو سێبەریان لێ خواردبووەوە
ئەمە خۆرێکی خەمبار بوو ئاسۆیان لێ شاردبووەوە
ئەمە عبداللە میدیا بوو خۆزگەم بەخۆی
هێشتا دەستت لەدەستییە بۆ کوێ دەڕۆی؟!!
تۆ بەس نەبوو ئەم ڕەشەبا نەیگرتیبیەوە
تۆ بەس نەبوو وەکوو خانی نەکرایتە پێکی ئەتاتورک
تۆ بەس نەبوو وەکوو حاجی، کۆیەت نەدابوو بە شانتا و
ڕێی باواجیت لێ گیرابێ
چنارۆک بووبێ بەمشیر
لەسەر مەزرای هەیبەسوڵتان سوخەن زەنێک
بانگت بکا: تکبیر، تکبیر!
تۆ بەس نەبوو وەکوو سێوە و طاهیر تۆفیق ڕانەچڵەکیت

تۆ بەس نەبوو وەک جەعفەر و ئایشەگوڵێ دۆش دانەمای
تۆ بەس نییە بەسەربەرزی میوانی ئازیزی خودای
تۆ بەس نییە ترسی جەولەی شەڕی سێهەم ناتپرووێنێ
تۆ بەس نەبوو ساتی مەرگیش هیوا هەبوو
چاوی بەبار و ماندووشت بۆ هەڵبێنێ!
ئەمە هەمووی میدیا بوو، عبدالله بوو، مامۆستا بوو
سالآنێکی ئێجگار فرە لەژێر ڕەشماڵی دڵمدا
وەکوو ستوون ڕاوەستابوو
دیوانێکی ئەم خەمانەی لەدەستابوو
دەیخوێندەوە، دەیپچڕاند و دەیهۆندەوە
سەرکۆزەری لێ دەگرت و دەیکرد بە با
دەیوت تەنها ئەم دەبەرە داد و بێداد بۆ خوا دەبا.
ئەمە هەمووی عبدالله بوو... دەیوت کێیە گوێ لە ئێمەمانان دەگرێ
دادی خەمان، لەسەر باڵی دەست لێشتن بۆ کوێ بەرین؟
چۆن وەنەوزێک، دێ و چاوانمان داگیر دەکا
وەهاش دەمرین// وەهاش بۆ خەم و بێ خەمی بەکوڵ دەگرین
ئەمە هەمووی میدیا بوو
ئەمەش هەموو شین و شەپۆڕ و گریان بوو
ئەمە هەمووی کەف و کۆڵی دوای زریان بوو
کە زریان هات -خۆزگەم بەخۆی- ئەو سەری خۆی نابووە سەر گۆشەی برین
ئەو هەر تصوری هەبوو، من وا لە خەمدا خوێناوم
قەسیدەییێکی بێ چاوم
بلّقی سۆزێکی هەناوم
شوێنەوارێکی بێ گارد و ون کراوم
کاک عبدالله... ئەمن دۆعایەکی دەکەم
دەنگ هەڵبڕە و بلّێ ئامین
ئەوەی خەونم لێ تێک دەدا
ئەوەی سالّم ناساڵ دەکا
ئەوەی ئێسکی گەلی برای خۆم و خەڵکم لا تاڵ دەکا
ئەوەی دەبێتە باعیزی دڵی من و جوانیی یارم
ئەوەی بەرەو قیبلەی ناحەق پێچی دەدا وشە و زارم



خێر لەماڵ و منداڵی خۆی قەت نەبینێ
لەسەر بەردی سەخرەتوڵڵا ڕۆژی حەشرێ
بەر لەعنەتی خودا کەوێ وەکوو شەیتانی لەعینێ
وەیلێ سەحەرە
شوکر دنیا بەخەبەرە...
کاک عبدالله:
پڕ بەتاسەی تینوویەکی ڕێی ئازادی ئەشکم بۆ تۆ
بەژمارەی زامی بەسوێی ئەم ولآتە گوڵم بۆ تۆ
دڵم بۆ تۆ
لەمەجلیسی جاویدانا جێگەت دیارە
لێرە ئاوات هێشتا خەونە، خەونێکی زۆر قەدەغەیە
لەوێ جێ سوحبەتی یارە
منیش دڵم هەر زامدارە!!

***

## بۆ نەوای(*) نۆبووک

دایکی ئەم خاکە چەند ساڵە لەژانایە؟
زۆری خایاند...
وتیان ژانی ئەم دایکەمان دوایی نایە!
دەستە و دۆعا، چوومە حوزووری خواوەند و
چۆکم دادا، وتم... خوایە
چاوی ڕەحمەتت بینایە
دەڵێن ئەگەر ژان قورس بێ چار دۆعایە
کە نیشتمان ژانی گەرمی کوژایەوە
بۆن و بەرامەی عەترینی بەهارێکمان لەو ساتەدا کرایەوە
لەژوور سەریا، دەستەونەزەر ڕاوەستابووم
موترفێکی ئێجگار نازار
وەک پەپوولە، چاوی جوانی لەخەوابوو
سەرم لادا، سبحان الله لەم جوانییە
بەری ئەم ژانە «نەوا» بوو

(*) نەوا: کچی صلاح ڕەشیدی هونەرمەندە

بەهرەوەرێک، (ئەمە) دەبێتە هاوسەری
تاجی بەختی لەسەرناوە
خوا خێوەتی بەختەوەریی
لەمێرغوزاری شیعریشدا، بۆ هەڵداوە
بەئاسمانی ژیانییەوە
ئەم پەرییە، چراخانێکی خوایییە و هەڵکراوە
لەچاو بەدوور... لەبەر چاوە
ئەم چرۆیە، هەر خۆی بووە بەخونچەگوڵ
شەماڵ دەمی بەخۆزگە بوو...
شنەی ئەویش لێی نەداوە
با ئەم شیعرەم ملوانکە بێ، بووکە نەوا
لە ملی کە وەکوو دۆعایەکی ڕەوا

***

## (..........)

ئازیزەکەم خۆمن ئێستەش
دەست لەملانی خەیاڵم
هەر چاوەڕێی پێکی خەستی
چاوەکانتم
وەکوو بولبول هەر دەناڵم
تۆ گۆمێکی ئێجگار مەنگی
منیش چەمی تیژ و خوڕم
تۆ کچێکی نۆ دەقیت و
منیش کوڕم
وەکوو شالاوی ئاگر دێم
هەر لە گۆمی مەنگی تۆدا دەکوژێمەوە
ئەو بارانەم ئەگەر ساڵیش وشکایی بێ
هەورە بروسکەم تەقیوە
بەسەر تۆدا دەڕژێمەوە
ئەگەر دەڵێن دەوارێکی داخراوم
بەخوا بەخوا



گەر تۆ ببیت بەمیوانم
بۆ پێشوازیت ئەکرێمەوە
عومرم دەبێ بەهەزار ساڵ
سەری مەرگیش دەنێمەوە
کوا قەولەکەت، چاوەڕوانم
دەبا ئیتر نەیلێمەوە!

***

## بۆ گۆرانی

گەر جوانیی نەبێ دنیا (هەبا)یە
جوانیش ئەوەیە لە ئافرەتایە
خودا! بەئاگای لەهەست و نەستم،
من لە ئافرەتا تۆ ئەپەرستم
هەموو فەلسەفە و زانیاری و هونەر
گوڵێکە و ئافرەت داویەتی لەسەر
ئەوی ڕۆیشت و ئەوەیش ئەمێنێ
مەتەڵ و ئافرەت هەڵی ئەهێنێ
جەهەندم (نەکەی) دەم ئافرەتانە
بەهەشت (بەڵێنی) یەک خان و مانە
ئەو زوڵفە پەخشە ئەو چاوە مەستە
لوتکەی ئیلهام و پەیام و هەستە

***

## بۆ کاک صلاح(*)

١٩٩٢/٧/٢٨

برام صلاح... ئەگەر دەنگی تۆم ببوایە
دڵی خۆمم پڕ کردایە.
ئاخۆ لەچەند لوتکەی شیعرا، ئاگری من هەڵگیرسایە
لەچەند خێڵی عاشقاندا، دەواری خۆم لێ هەڵدایە؟!

(*) کاک صلاح: هونەرمەند صلاح ڕەشیدە

برام صلاح... ئەگەر گەرووی تۆم هەبوایە
دەم خستە هێزی «بڕوایە» (*)
«لیمۆی» (**) خۆمم لەدەست دەگرت
هەردەم گوت و دەم گوتەوە. ئەگەر دنیاش بڕووخایە.

برام صلاح... ئەگەر سۆزی تۆم ببوایە
ئا، بەو خوایە
بەستەی خۆمم دەکرد بەمەی، دەم بەخشیوە
شوشەی دنیام لێ بشکایە

برام صلاح... چریکەی تۆ، هی من بوایە
جامی خۆمم پڕ کردایە
وەکو بولبول گوڵم دەکرد بەهێلانە و هیچ دوور نەبوو
لە تاریکستانی خەما، چرای نەوام(***) هەڵکردایە.

برام صلاح... ئەگەر منیش وەکو ئێوە دەنگم خوڕەی بهاتایە
دەبووم بەسەرچاوە و کانی
دەبووم بەمەولەوی و خانی
لەناو جامی مەقامێکا هەزار شیعرم بۆ دەهانی
شیعرم بووکێکی تۆراوە، گەرووی تۆ بوو بە باوانی

***

## بۆ پێشەوا دوکتۆر قاسملۆ

١٩٨٩/٧/٢٠

کە تۆیان کوشت –دەستیان شکێ– دەیانزانی چاوی کوردی؟
دەیانزانی، تۆ قەندیلی، پیرەمەگروونی، هەڵگوردی؟
لەم دنیادا چ نەفامێ وا تێدەگات تۆ مردوویت؟!
دوژمن، دوژمنی داخ لەدڵ. چاوی کوێر و ئەستۆی وردی

(*) بڕوا: کوڕی هونەرمەندە.
(**) لێمۆ: هاوسەری هونەرمەند.
(***) نەوا: کچی هونەرمەند.



نەکورد گەلێکە بێ چاوە، نەکێوانیش هەڵدەکەنرێن
ئەی ڕابەری تێکۆشەران، تۆ ئیلهامی دەستوبردی
ڕۆژێک کە ئاڵای ئازادی ئاسۆی هیوا دەنەخشێنێ
دنیا هەمووی پێ دەزانێ ئەی قاسملۆ تۆ نەمردی
هۆ گەلی کورد بابی خەم و ستەم دیدە و زۆر لێ کراو
تۆ سیروانی کەف و کوڵی بوار نادەیت و بێ پردی
هۆ پێشەوا، هۆ قاسملۆ هۆ ڕابەرێکی هەڵکەوتوو
چەمێ ئەشکی شاعیرێکی ئەم میللەتەم بۆ هاوردی

***

## لە شەهیدبوونی
## دوکتور شەرەفکەندی و هاوڕێکانیدا

١٩٩٢/٩/١٨

بەتەنیا جێم مەهێڵن... ئەمشەو زریان دەمکوژێ
ئەمشەو مێژوو دەمکوژێ
ئەمشەو خەفەت لەناخەوە دەمهێنێ
ئەمشەو گریان سەرلەنوێ، دەروونم هەڵتەکێنێ
ئەمشەو مانگمان ئاوابوو
ئەمشەو ماڵی ئەندێشەم وەکو کاروانسەرا بوو
ئەوی دەهات، دەڕۆیی
ئەوی لێرە جێم دێڵێ سبەینێ نایبینمەوە
ئەمشەو هەر خۆم دەزانم من چەندێ بارگرانم
ئەمشەو قورسایی قەندیل بووە بە باری شانم
ئازاری ماندوو بوونم بوو بەپۆرکی ئێسقانم
بەتەنیا جێم مەهێڵن خەڵکە من زۆر بێ هەستم
خەڵکە ئەژنۆم شکاوە، بۆ دەست نادەنە دەستم؟!
بەتەنیا جێم مەهێڵن ئەمشەو کۆستم گرانە
ئەمشەو خەم و خەفەتم بەقەد گشت کوردستانە
ئەمشەو بەهاری شیعرم وشک و باران بڕانە

بەتەنیا جێم مەهێڵن، ئەمشەو هەر برا ڕۆمە
ئەمشەو گڕی شیوەنم میوانی خودی خۆمە!
خۆ فرمێسکم بەش ناکا خەڵکە خوڕێ لە ئەشکێ
خەڵکە دەستی هیمەتێ با شووشەی هزرم نەشکێ
«شەرەفکەندی» دەکوژرێت، زامی «قاسملۆ» سوێیە
خەڵکە ئەمن لە کوێدام، ئەم ئازارە لە کوێیە؟!

**تیهەڵکێش: «بۆ پێشەوا دوکتور قاسملۆ»**

کە تۆیان کوشت –دەستیان شکێ– دەیانزانی چاوی کوردی
دەیانزانی تۆ قەندیلی، پیرەمەگروونی، هەڵگوردی؟
لەم دنیادا چ نەفامێ وا تێدەگات تۆ مردوویيت؟!
دوژمن، دوژمنی داخ لە دڵ، چاوی کوێر و ئەستۆی وردی
نە کورد گەلێکی بێ چاوە و نە کێوانیش هەڵدەکەنرێن
ئەی ڕابەری تێکۆشەران، تۆ ئیلهامی دەستوبردی
ڕۆژێک کە ئاڵای ئازادی ئاسۆی هیوا دەنەخشێنێ
دنیا هەمووی پێدەزانێ ئەی قاسملۆ تۆ نەمردی
هۆ گەلی کورد... بابی خەم و ستەمدیدە و زۆرلێکراو
تۆ سیروانی کەف و کوڵی بوار نادەیت و بێ پردی
هۆ پێشەوا، هۆ قاسملۆ، هۆ ڕابەرێکی هەڵکەوتوو
چەمی ئەشکی شاعیرێکی ئەم میللەتەم بۆ هاوردی
خەڵکە ئەمن شیوەنمە، خەڵکە ئەمن زاریمە
منم دەگریم وەک ژیان
منم دەگریم وەک ئینسان
خەڵکە براڕۆ دەکەم، خەڵکە هەزار بۆ دەکەم
تەشتە قوڕێ دەگرمەوە، دیکەم
بەسەری خۆم دا
بەمێژووی کۆن و نومدا، بە عەجەم و بە ڕۆم دا

**تێهەڵکێش:**

وەهایان وت... مێژووی ئێمە گەمڕەی ڕیخی هەژارییە



گەمڕەی ڕیخی بێ بارییە
گەمڕەی ڕیخی جاشکۆیەکی ناچارییە
براکوژی و خوێنخوارییە
گەمڕەی شوێن پێی گەمژە کویخا و وردە ئەفەندیی شارییە
دەبا بشلێین سامالی ئەم کوردستانە
خوێنی گەشی شەهیدانە
بەئەستێرەی شەرەفکەندی شین و بێگەرد، درەخشانە
خەڵکە ئەشکم بەش ناکا، کوا فرمێسکتان لە تەکما
کوانێ زێڕتان لە حەکما؟
خەڵکە دەڕۆمە دواوە، دەچمە بن دەستی خواوە
مێژووتان ڕاپێچ دەکەم بەدوای خۆما دەیهێنم
لەپێش دەمیا دەوەستم
بەژمارەی شەهیدان پرس و هەناسەم پێیە
هەر کە سەری هەڵبڕی و پرسی ئا ئەمە کێیە؟
دەبمە زریان و هەڵچوون
دەبمە نزیک و ئاموون
دەڵێم کوانێ سنوورمان؟
کوا خوێنی خوێنی سوورمان؟
خاکمان بۆ هەر لێوە بێ؟
بۆ دەرفەتی ژیانمان دەمی ئەو چەند دێوە بێ؟
وەک مۆتەکەی ئێسک قورس، وەک لا دیوار
بەسەرمان داتەپیون
بێ داب و بێ تیۆرن
لەناو قەپی درنجا، دانێکی دەرپەڕیون
مەیتەری سوار و ناسوار جێگەی خۆیان نازانن
تەنها لە بەختی ئێمە کوێخای سەرووی شارانن!
«شەرەفکەندی» دەکوژرێ و شیوەنی قاسملۆیە
شیوەن شیوەن دەهێنێ
واقیع تیۆر دەشکێنێ
دەستم ناگاتە دوژمن دەدەم بەناوچاوانما

ئاگری سوور بەردەدەم بەتوێی زار و زامانما
بەکۆڵیتی باوانما
بەناو هێڵی چاوانما، بەخەونی هەرزەکاریی کوڕ و کچ و لاوانما
بەخودکاری دوو ڕوودا
بەدەفتەری پشوودا
بەسێ پێیی ناڕەوای بەزمی دووبەرەکیدا
ڕەمزی براکوژیمان
یا هەڵچوون و هەڵەشەی پیاوی دە جار پەشیمان
بەئاپۆڕای قەدەردا، بەتارمایی خەبەردا
بۆ هەر مەولای من دەکوژرێ، ئەی بۆ، خۆ منیش خواناسم
لەڕۆژنامەی خەم و خوێنا، ئەمن مانشێتی سەرباسم
ئەگەر ناوێکی موبارەک لە ئاریزی خەمم نەنێن،
دەچمە سەر لووتکەی غەزەب و بانگی «أنا الحق»ێ دەدەم
لەبەردەمی زاتی خوادا کۆڵی ملکەچی خۆم دەخەم
دەبا ئەویش خۆی شایەتبێ کە منیش هەم، کە منیش هەم
خەڵکە گریانم گەرمە، خەڵکە بێ دەنگی شەرمە
ئەوەی «شەرەفکەندی» کوشت... خۆی، کتێبی، ڕابەری
خۆی و ئەندێشەو هزری، خۆی و بەیان و شامی
خۆی و ئەندێشەی و زامی
کلاشە و دەیکاتە پێی هەژارێکی سابلاخی،
جوتیارێکی گەلواخی.
کوردیش، فیزە مەینەتە، وەک من چرا کز ناکا
ئەمشەو ڕێگە گوم نابێ
باوەڕمان خۆرێک نییە...
سفیدەمان هەڵبێت و ئێوارەمان ئاوابێ!

***

## سروودی شەهیدان

ئێمە بۆ شەهید چی بڵێین چاکە؟
کێ وەکو شەهید بێ خەوش و پاکە؟!



کەسێک بتوانێت گیانی ببەخشێت
ڕەوایە مێژوو هەر بەو بنەخشێت
هۆ شەهیدەکان، سەروەرن ئێوە
لەڕێی خەباتا ڕابەرن ئێوە
هۆ شەهیدەکان خاکتان پیرۆزە
گوڵی مەزارتان مژدەی نەورۆزە
وەکو باوەڕمان ئێوەش مەبەستن
ئێوە پەیامی ئاخێز و هەستن
لە کۆڕی عەشقی گیانبازەکانا
لە سۆز و نۆتەی ئاوازەکانا...
ئێوەن شابەیتی نێوچامەی ژیان
مژدەی شەفەق و ئاسۆی بەربەیان
ئا لەو ڕۆژەوە ئێمە دیمانن
سۆزی سروودی ئەبەدیمانن

***

## بۆ یادی پەنجا ساڵەی
## حیزبی دیموکراتی کوردستان ـ ئێران

دەستەو نەزەر وەکوو دەروێش لەم ئاستانە ڕاوەستاوم
یادێکی زۆر پیرۆزیشم کردووە بەنووری پێش چاوم
پەنجا مۆمە لەچلچرای چوارچرادا هەڵکراوە
درەختێکە پەنجا گوڵی بەشکۆفەی لە خۆ داوە
ئەم درەختە لەناو زێدی ئێمە دایە و سەقامگیرە
ناوی لەسەر زاری کوردان هەر خۆی نییەت و تەکبیرە
لەم یادەدا وا باوەڕێک دەدا لە دەرگای دڵی من
بە گەردەلوولی ئەم دنیا، ئەم درەختە نایێت لەبن
پەنجا مۆمت داگیرساوە، پەنجا هەزار سڵاو لەتۆ
چیای بەرزی گەردن کەشی، داوێن سەوزی خاوەن شکۆ
من دەروێشم، دەروێشێکی ئەوینداری ئەم یادەتم

ئەمن مەستم، مەستێکی وا، هەواداری ئەم بادەتم
ئەتۆ قاڵ بووی ئەو بۆتەیەی مێژووکردی بەپێوەرت
باڵات گوڵاو پەرژێن کرا، بەبۆی شەهیدی ڕابەرت
ئەو بوراقە بەپڕتاوەی تۆ وای لەسەر پشتی بەرزی
لە -سدرة المنتهی-وە پەیامی دا کە تۆ فەرزی
ئەسپەشێکەت لە تاو دایە، تەوێڵ مارۆ گەردن شاخە
مێژوو! لە ڕێی ئەم تاوەدا، وەرە بەرماڵی خۆت ڕاخە
ئەو سوارانەی ئەم مەیدانە دەهێنن و دەبەنەوە
ئەو بەختەمان کە خەوتبوو ئەمان چاوی دەکەنەوە.
* پێش پەنجا ساڵ، ڕۆژگارێک بوو، ئێمەی کوردی هێنایە کوڵ
خەم و ئەندێشە و ئاواتمان پێچابووە نێو ناخی دڵ
بەحەرفەکانی پێشەوا، تەقینەوە و سەرپەڵە بوو
لە کوردستانی کێڵگەدا بەرهەم حیزبێکی کەڵە بوو
بەیداخ ئێرانی ئازاد و خۆموختاریی کوردستان بوو
ئاهەنگ زەنگی نوێی مێژوو بوو، داستانێکی سەر داستان بوو
لەگوێماندا دەزرینگێتەوە سروودی ئەی ڕەقیبی کورد
بانگی هیوا و ئامانجی ڕوون، هەڵسانێکی بەدەستوبرد
ئەی حیزبەکەی قاضی نەمر، نیشتمانی گیان بەختەکان
داڵدەی هەموو خەونەکانی وەرزی زریانە سەختەکان
تۆ سارییەی یەکەم ئاڵای دەستەڵاتی ئەم گەلە بووی
کە دروێنەی نوخشەمان کرد خەرمانانی ئەو حەلە بووی

* پەنجا ساڵە زریان دێت و تۆفانێکی لەگەڵدایە
پەنجا ساڵە دوژمنانت هەر تۆڵەیان لە دڵدایە
چۆن دەبێ کورد قوتابخانەی تێکۆشانێ بنیاد بنێ؟
چلۆن خۆزگە و ئاواتی کورد بەداری خۆرا هەڵزنێ؟
کورد و حیزب و پێشەوای بێ! ئەمە کەی باسی ڕەوایە؟
کورد کەی مرۆڤە، کەی خاکە، ئەرێ کەی بەندەی خودایە؟!
پەنجا ساڵە تۆ ئەم شەختە دەدەیتە بەر تینی هەتاو
دوژمنانیش ئەم باڵۆرە دەکەن بە بەستەی دوای شەراو!



پەنجا ساڵە، تۆ هەر مەزرای خوێنی شەهیدانی سووریت
نامەی ڕەوات لە دەستایە و خۆت بادەکەی خۆش مرووریت
پەنجا ساڵە حەبیبەی تۆ کوردستانی خۆموختارە
تۆ هەر هەتوان دەگریتەوە و جەستەی مێژوویش بریندارە!
زیندانەکانی ئێرانی سایە قورس و ئێسک گران
چەندین سواری شێ سواری تۆ لە نێویاندا لەدار دران؟
تۆ تۆرەمەی کەسانێکی ئاشتیخواز و هەواداری
دوژمن هەر ژیلە و شەختەبوو تۆش هەر هەمیشە بەهاری
پەنجا هەزار جار فیدات بم کە سەنگەرت مەردانەیە
نەواری گشت نامەکانت توێی ئەو هەموو هەردانەیە
تۆ ئاشتی بووی دوژمن ئاگر، تۆ قەڵا بووی دوژمن بەڵا
تۆ ئارام و خۆڕاگر بووی دوژمن باوکەڕۆی دوای سەڵا

* پەنجا ساڵە لە سەنگەرای تۆوی ترست نەچاندووە
نەبەردەکانیش شایەتن، کە تۆ مەرگت بەزاندووە
پەنجا ساڵە دەنگ دلێری و سەنگەر، لەدوند و دۆڵایە
پشتێنت لێ نەکردەوە و خەمی کوردت لە کۆڵایە
پەنجا ساڵە تۆ هەر دێیت و دوژمن دەگۆڕێت و دەڕوا
وەکوو سەگی زام تێکراو گەدە و گیپاڵی خۆی دەخوا!
لە زەلکاوی کورسی و مێزا ڕیشی بابیشی تێناوە
تۆش ئایندەی سەرفرازیی گەلی کوردت لەپێش چاوە

* ئاخوون... لە لەوحەی مەحفوزا چتان لە ئێمە خوێندەوە؟
ئێوە لە کەربەلای خوێنا چتان بۆ ئێمە چێندەوە؟!
بۆ نایەڵن ئێمەش بۆ خوا، نوێژی خۆمانە دابەستین؟
بۆ نایەڵن لە مزگەوتی ئازادانا ڕیز ڕاوەستین؟
ڕێگەمان دەن پەرچەمی خەم بکەین بەپەرچەمی شادی
سروودی خۆ بڵێینەوە بەئاوازی نوێی ئازادی
ئەوسا دنیا بەشایەت بێ ئاگر دەنێینە ئەولاوە
پێشمەرگەمان لەسەنگەرا گوڵی سپی لەخۆ داوە
خەڵکە خۆ کوردیش مرۆڤە، زێد و ئاوی ئاشکرایە

تاکەی لەبن ڕیشی دەنێن شوعلەی ئەم مافە ڕەوایە؟
من دەروێشی ئاستانەکەی پێشەواتم، ڕابەرمانی
ڕۆژێک تەخت و بەختێکمان بوو، شاگوڵی تاجی سەرمانی
لە نەزەرگەی -قاسملۆ-دا جامی عەشقت دەخۆمەوە
بەبۆی عەتری شەرەفکەندی گڕەی ناخم دەشۆمەوە
من و تۆ وەک ئاوی ڕوون و بادەی دەستی عاشقانین
لەیەکدیدا تواینەوە و ئێمەش بەشێکین لەوانین
ئەی سەرچاوە دڵ گەرمەکەی، ئاو فێنک و سایە بڵاو
لە باژێڕی ئومێدماندا تۆ نرخیت و شیعریش دراو
* ئەی چامەکەم، کەی شایستەی بەزمی ئەم یادە پیرۆزەی؟
کەی تۆ مەشخەڵی لایەقی ئەم نۆ بەهار و نەورۆزەی؟
تۆ وەکوو پەیک سۆزی دڵم تا چوار چرا بخە سەر باڵ
بەپیرۆزیی ئەم یادەوە لەنوێ بێمەوە گڕوگاڵ

***

## ئاغام ئاخوون

ئاغام ئاخوون ئەی زێوانی شەرع و ئایین
کێ پێی وتی ئێمەی کوردگەل چەندێ قورسین و چەند بایین؟
ئا... ڕاوەستە، کام یاسایە، کام ئاینە ڕێی پێ داوی.
لە کاروباری گەلان دا، ڕیشی خۆتی، تێ بهاوی؟
کورد مرۆڤە، کورد ئیسلامە، کورد خاوەنی خاک و ئاوە
ئاغام ئاخوون! ئێسکت قورسە، ئادەی بچۆرە ئەو لاوە
ئاغام ئاخوون!... شاری کۆیە نە نەجەفە و نە کەربەلا
بۆچی ملت پێوە ناوە، وەک حوشتری بۆ حەلوەلا
ڕاستە ملهوڕیی و گومڕاییت ئەوا لە سنوور دەرچووە
تەماعی چاوی چاوبرسیت لە گیانی ئێمە بەربووە
ئاگات لێیە تۆ مەنفور و قێزەونی، تۆ دوژمنی
ئاپۆرایەکی شێواو و دیاردەی بێ سەروبنی
سوێندمان، بەقازی و قاسملۆ، شەرەفکەندی و شەهیدانە
سوێندمان بەخاکی گوڵگوونی سەرانسەری کوردستانە



ئێوە دەبێ هەر ڕسوابن، ئێمەش دەگەینە ئاواتێ
دەستی داگیرکەری زۆردار بەهیچ جۆرێکی نەیگاتێ
بەرەو دواوە، بەرەو دواوە، بەرەو دواوە بۆ هەڵدێرتان
بۆ کوڵخەکەی بێ دەلاقە و بۆ توونەکەی دیدە کوێرتان
ئەی دوژمنانی ئەم گەلە، لە شۆڕشەکەی کاوەوە
لەعنەت لە پێشوازیتانە لەم ناوەوە و لەو لاوەوە
ئاوی «حەمامۆک» زەققوومە گەرووتان دادەڕزێنێ
لە سیفری خوێناویتانا کرمی نەفرەتیش هەڵدێنێ
سنە و سەقز و مەهاباد، دەبن بەدۆزەخی گیانت
وەکوو ئاگری قودرەتیش بەردەبنە ڕیشی پانت
مێژوو، ئەمڕۆ شاهیدێکە خەجاڵەت بوون تۆمار دەکا
ناوی هەموو زۆردارەکان، لە گۆڕیشا بێزار دەکا
بەر لەعنەتی خودا کەون، بەر نەفرەتی دنیا کەون
کە باسی ئەژدەهاک کرا، ئێوە هەون، ئێوە هەون

***

## شیعر

١٩٩٤/٢/٢٤

شیعرت دەوێ لەمن، شیعرێک کە شایانی جوانیی تۆ بێ
دەنگ و ڕەنگی ئەم عەشقەبێ، نەک شیوەن و باوکەڕۆ بێ
جا شیعری وا لەکوێ بێنم، کوێ بگەڕێم بەدوای ئەوا
مەگەر خودا پێم ببەخشێ، کاتێ دەنووم شەو لەخەوا
کە ناتوانم شیعرێک بڵێم، پێشکەشتی کەم بەمیوانی
ئەی چی بڵێم، ئەگەر نەڵێم: وەی باوکەڕۆ کە تۆ جوانی
ئەی بەرخۆڵە خرپنەکە، ئەی جوانترین شیعری خووا
عەشق گوڵە وەنەوشە بوو لەناو سۆزی دڵما ڕووا
خۆ ناتوانم تێر تەماشای گەلاوێژی چاوت بکەم
ئیتر چۆن لەسایەی تۆدا کۆڵ و باری شیعرم بخەم؟
یاخوا خامەم خەجاڵەت بێ، با خەیاڵم سەر هەڵگرێ
شەیتانی شیعر و ئەندێشەم لە کۆڵانا بەر پەڵ درێ

ئەوســـا داوی بسکی خـــاوت توند بئـــاڵێ لەگـــەردنم
نەیکەیتـــەوە دەخـــیلت بم، تا شـــادم دەبم بەمـــردنم

***

## شنە

١٩٩٥/١٠/١٠

شنەی تۆبە هەڵم دەگرێ و
بەرەو لوتکەی کەلان دەکشێم
دەبمە ماکیاجی ڕووی ئاسمان
ئیتر وەکوو گەواڵەهەور شێوە دەگرم
دەبم بەکێو
دەبم بەدێو
دەبم بەدار، دەبم بەباخ
دەبمە ئاسۆی پەمەیی ڕەنگ،
دەبم بەشاخ
کاتێ خڕم دەکەیتەوە،
وا دەزانم لێم بێزاری...
دەبمە باران،
بۆ ئاوڕشێنی ئازار و خەمی شاران!

***

## لۆ(١)

١٩٩٥/١٠/١٠

هەریەکە بۆ خۆی لۆیەک بوو
ئەمێستە داومان یەک لۆیە
کاتێک چاویان دەبڕنە تۆ
گیانی منە دەی کرۆژن،
کە دێن شیعرم دەخوێننەوە
قەپیان لەسەر لێوی تۆیە!
لەم گێژاوە بێ پەیەدا
وشەی (من) ڕوخساری (تۆ)یە!

***

(١) لۆ: تاڵ، داو



## بۆ هاوڕێی سەرکردە «تۆما تۆماس»ی نەمر

١٩٩٦/١٠/١٦

هاوڕێی گەورەم، تۆما تۆماس
ئەی ئەو چرای ساڵەهایە
لەگێژاودا لەبەر لوورەی باوبۆراندا
تۆ دەسووتێیت
نیشتمانت لێ بوو بەخەو
دەرووی هەموو ڕێگەکانت پڕ بوو لەشەو
چەندی وەک تۆ ئەو ئاواتەی بردە نێو گڵ
دەست لەملی ئازادی کا
شەوێک چاوی لەسەر دڵی زێدی بابی
بێ خەم بنوێت
لەناو خەندەی لێوی خەونی منداڵێکدا
وەکوو نەمام ساتێ بڕوێت
هاوڕێی گەورەم، هەزار نەفرەت لەم ڕۆژگارە
بۆ هەر ئێوە بوون بەڕازی شەوانی خەم؟
بۆ هەر ئێوە لە دەروونی زۆرداراندا بوون بەخەنجەر؟
بۆ هەر ئێوە لەمەینەتی حەقیقەتدا بوون بەخەبەر؟
بۆ هەر ئێوە دوورەوڵات و بێ لانەن؟
بۆ هەر ئێوە یاد و مێژوون؟
بۆ هەر ئێوە لەگەڵ هەموو کارەساتێ هەر ڕووبەڕوون؟
بۆچی ڕۆژگار هەر شکستی ئێوەی وەها لا تۆمارە؟
بۆچی ساڵی خەمی ئێوە پەنجا ساڵە بێ بەهارە؟
هاوڕێم کۆچت وەکو تیرێ، دڵ و دەروونمی پێکاوە
چاوم چلۆسکی فرمێسکی سوور و سوێری تیا شکاوە
هاوڕێم ئاخۆ کەی بێ منیش
جامی ئەم سوێیە هەڵبدەم
دەست لەیەخەی خەونی خۆشی شیعر و باوەڕم بەربدەم؟
ئاخۆ تاکەی

نیشتمانم هەروا کێڵگەی
فرمێسک و خوێن و ئێسقان بێ؟
ڕۆژی لێڵ و شەوی دەیجوور
یاکێلی گۆڕی وەلی بێ
یاخود گڵکۆی شەمی بێ نازی شارەزوور!

***

## ئاخۆ؟

ئاخۆ لەنێو مەمکانتا چەند چاوی شێت باڵ شکاون؟
لەشەپۆلی قژی خاوتا چەند هەناسەی
سارد و گەرم وەکوو خۆزگەی من تاساون؟
ئاخۆ بەتاڤگەی ڕۆشنتا ڕێچکەی خەونە تامەزرۆکان
تا کوێ دەڕوا؟
گوڵستانی بەرگەردنت هەنگی کامە هەنگەژاڵە
شیلەی دەخوا؟
ئاخۆ لەعارەقەی هەنیەت کێ پێکی خۆی قومە قومە لێوان دەکات؟
لە میحرابی برۆکانتا، کە شەو داهات، لەو مەستانە
کامیان نوێژی شێوان دەکات؟
کە ئاوێستای ڕووت کردەوە تەفسیرکاران خڕبوونەوە
کێ ئایەتی ڕوومەتی تۆ
لە ئەلفەوە هەتاکوو یێ لەبەردەکا؟
کاتێ نهێنی جوانیی تۆ وەکوو سیحرێکی داخراو
دەبێ بەخەمی شاعیران
کام (گۆران)ە بەختەوەرە و
تاجی، وەها شانازییەک لەسەر دەکا؟
پێم داوەتە دەستی ڕێیەک، ڕەنگە بۆ لێژگەم ڕاکێشێ و
دەرفەت نەبێ و نەیێمەوە
هەر هیچ نەبێ لەناو گۆپکەی ئاڵی لێوتا با ئەستێرەی ماچێکی خۆم جێبهێڵم
ئەمە خوایە بەڵکوو سبەی، شەو ڕەویەوە، لەنوێ لەوێ هەڵبێمەوە
یا ڕێگەم دە، با نەوسی خۆم بەمووشەکی دوورهاوێژی





حەز و ئاوات بەرەو ئامێزت هەڵبدەم
من لەوێوە وەکوو ڕەجمی شەیتان بکەم
نەوس کوژەکان بەرپەڵ بدەم.

***

## کۆشک

١٩٩٦/٧/١٢

تۆ لە دڵما سەقامگیری
ویستم بەقاڵبی دڵم شیعرێک بڵێم،
بیکەم بەکۆشکێ بۆ ئێوە
هەر وێنەیەک کە، شکم برد...
هەرچی پەیڤێک کە دەمناسی
هەر هەموویم، بەئەشک و خەندە گرتەوە
کۆشکی چامەم بەرز کردەوە
کەچی ئەفسوس بەباڵای تۆ کورتی هێنا
شایانی تەختی تۆ نەبوو
خەریک بوون بم شکێننەوە!
بۆیە هاوارم کرد: تەوبە! هەر لە دڵما بمێننەوە!

***

## چاوبزان

١٩٩٦/٧/١٢

لە نیوەڕۆی چاوبزاندا هەر خۆم بەکۆڵ و بارمەوە
وەکوو سایەی دارە گەورە گۆپکەی سینەت دەشارمەوە
کە تۆفانی حەزی خەڵکی ڕووباری شێتی بۆت هەڵبەست
منیش وەک چنگی سوخمەکەت هەردوو مەمەت دەگرمە دەست
هۆ شێتۆکە من دەزانم چاونەترسی و لە خۆت بایی
بۆچی وەکوو نەرمەباران ڕووت کردە شاری وشکایی
پێم بڵێ چۆن من نەیێڵم (نەیار) لێوی خۆی تەڕ بکا
روحم ببێ بەگەردەلوول بڵێی بتوانێ شەڕ بکا؟

مـەمـتــرسـێنە ئەگـەر ببـیت بەرەهێـڵــەش خـۆم ڕادەخـەم
لافـــــاوەکـــــانـی ئـەم هەڵـەت بـەرەو دەریای نـاخم دەبـەم
کـە خـۆشت کـرد و خـۆر دەرکـەوت دەبێ بەسـایەقـەی سـامـاڵ
منیش ئـاسکە زێڕینەکـــەت لـە مل دەکـــەم وەکـــوو لاپاڵ

***

## کۆپلەکانی دەم و چاو

١٩٩٤/٢/٨

١- خونچەییێکی پشکووتووم دی...
دەمم بۆ برد. تمەز لێوە
دەڵێی ئاسۆی بەنەوشەیی بەیانی باخی
سفیدەی شەکرە سێوە
یاخود ڕەفتەی ئاڵ و والای تەنک و تەڕی
سەر جرووکەی مەلی وشەی زۆر بزێوە.

٢- لە گۆمێکی شین و قوولا، خۆم بەخنکاوی دیبیەوە
کەوتمە سەر ئاو
بووم بەقوربانی نیگاییێک...
هاوێشتبووی بەتیلەی چاو!

٣- چەپکێ بەڕەزام کردەوە...
هەڵم مژی، هەڵم مژی هەتا ناخم پڕ بوو لە بۆن
لێوان لێو بووم تامردنم
تمەز ئەمە زوڵفی خاوە و دەیکەم بەپەتی گەردنم

٤- نوێژێکی زۆر قووڵم دابەست
دڵی خۆمم دا بەخودا و چوومە سوجدە
هێشتا مەست بووم بانگیان کردم:
وتیان وا کاتی ئەم فەرزە تەواو دەبێ
نوێژێکی تر، دابەستەوە
کە ڕاچڵەکیم تەنها چاو و برۆم بینی، منیش خۆم دا بەدەستەوە

***



## بۆ کوردیی کۆچ کردوو مەلا محمد

حەپەساوم...
دەست و پەنجەم لە گۆ چوون و هیچ ناگرن
ئەو کەسانەی وەکوو منن، سەیرە لەلام چۆن نامرن؟!
من نازانم بەرەو کام لا چاوم خولدەم...
کێ ببینم
چاوگەی فرمێسک! وشکاییتە! یا من هەروا بێ نگینم؟!
چلەیەک و دوان و سیانە...
ئەم سالانە هەمووی چلەی یارانم بوو
ساڵی کولانەوەی زەخم و زامەکانی جارانم بوو
لە دامێنی یادی تۆدا مامە کوردی...
منالێکم،
لەم ڕۆژگارە زۆر بڤەدا خەریکی گڕوگاڵێکم!
بەو جێیەی تۆی پێ سپێررا، خەم و ئازار...
هێندە زۆرە،
جۆرێ نەما کە لەو نەبێ، مەگەر بڵێم هەزار جۆرە!
تۆ ڕۆیشتیت، سەفەرەکەت زۆر پیرۆز بوو
ئاوێتەی وەرزی نەورۆز بوو
سروشت دیمەنی ژاکاو بوو
بنجی گەنم خۆی لە زەوی مت کردبوو
دێوی مەرگیش ڕووی لە کەپووی ئەهریمەنی زل کردبوو!
حەپەساو بووین،
دەستەپاچە و کۆڵەوار بووین
شەپۆلێکی زۆر بەسامی دەریای خەم و
کۆڵ و بار بووین
تۆ مردیت و پەیڤی کوردی بانگی هەڵدا
تەشتی قوڕیشمان گرتەوە
ئەمجارەشیان وەکوو دەیان جاری تریش
سەرتاپامان تێ خستەوە.

تۆ مردیت و منیش بۆ تۆ مامەڕۆمە
ئەم شیوەنەی بۆ تۆی دەکەم
پشکی خۆمە، بەشی خۆمە.

***

## بۆ شێخ حەسەنی برا و خزم

١٩٨٦/٩/١٠

١- خەون:
من لەسایەی دارێکدا بووم گڕی گرت و
تلیاساوە و دای بەسەرما
توامەوە لەناو تینی گڕی گەرما

٢- خوێندنەوە:
ئەم لاپەڕە هەمووی باسی
ئەفسانەی مەرگ و مردنە،
چ هێزێکی ڕەش و تاڵە؟!
چ داڵێکی چنگ خوێناوی و تەپۆ و قورس و
بەدفەساڵە؟!

٣- بای باڵ دان:
چەند ڕۆژ دەبێ
کە من لەسەر گازی پشتم ڕاکشاوم
وەکوو لیتەی خۆ نەگرتوو
بەسەر جێیەکدا ڕژاوم
با چەند هەنگاوێ بنێم و هەستم جێگە بەجێ بێڵم
لەم ڕێگەمدا با سێبەری ئەم جەستەیەی خۆم بکێڵم

٤- خەبەری ناوەخت:
تاریک داهات ئێوارەیە
خۆ شەو مەرگی مجافاتی ئەم شارەیە
لەبەر دەرگا فرمێسکی چاوی ئایشەخان
بروسکە بوو بۆ خەبەرێ



دەسا وەرن ڕای گەیێنن ئیتر مرۆڤ چۆن دەربەرێ!
شێخ حەسەنی دارە گەورەی خەونی دوێنێت
شەپۆلی مەرگ پێچایەوە
ڕازی خۆشی شۆڕەسوارێک بەفیشەکێ بڕایەوە
لە خەرمانی خەمی ئێمەی جەرگ سووتاودا
ئاگرێکی نوێی نایەوە
ئای... خەبەری مەرگی ناوەخت
تۆ چەند داخت نا بەدڵما؟
ئەمە چەند جار بمسووتێنی
ئەی هاوارە... بۆچی من چیم؟
کە من عومرم کۆچە ڕێگەی خێڵی خەم بێ
دەپێم بڵێن بۆچی بژیم؟
ئای شێخ حەسەن، ئای حەسەنی هاوڕێ و خزم
ئەی برای باش، ئەی جوامێر
هەستە وەرە ئەوە دڵم بیکە، بەسەنگەر و سپێر
توخوا نیشان وا بگرەوە
دڵی مەرگم بۆ بپێکێ لە ناخەوە
کوڕە ئازاکەی قەرەداخ با تۆ نەڕۆی بەم داخەوە
من هەر دەڵێم، دانابەزیت تۆ هەر سواری
تۆ هەر زەنگی ئەو سروودەی کە من گوێم بۆ شل ئەکردی
تۆ هەر ئەو سایە و سێبەرەی
کە من پەنام بۆ ئەبردی
تۆ ئەو برا ئازیزەمی لە دیوان و دەروونمدا جێگەت هەیە
لەناو خێڵی خەمی مندا تۆ کۆتەڵ و ڕێگەت هەیە.

***

## بۆ ١ی ئایار

١٩٩٣/٤/٢٨

جا، با، بمرین لە برسانا
با، نەخەوین لە ترسانا

جا ، با ، دزی مشەخۆری ئەم وڵاتە
گیرفان پڕ کات بەبێ وەڵام
جا ، با ، هەر کەس دێتە ئێرە. بێتە ئێرە بەبێ پرس و بەبێ سەلام
جا ، با ، مێژوو سەرەوژێر بێ
جا ، با ، دنیا لە ئاستی ئەم ئاوەژووە چاوی کوێر بێ
جا ، با ، یەڵسن ریفراندۆمی لاپەسەند بێ
جا ، با سەددام سەرۆکێکی ئیسلامی بێ
شێخی کوڕی لەگامی بێ!
ئێمە ناومان کرێکارە
خەمی گەلمان لەشان بارە
ئێمە لەخەما کولاوین
دنیا هەمووی هەر توێکڵە و ئێمە ناوین
ئێمە خەلق و داهێنانین
ئێمە پێچین، ئێمە ژانین
ئێمە دێری مانەفێستین
ئێمە خودانی هەڵوێستین
ئێمە نەوەین، کوردایەتین، تەنها ئێمە نەبەزیوین
ئێمە گەوهەری کێشەین و ، تەنها گەوهەر ژەنگ لێی نادا
ئێمە خاکین
گۆڕەپانێکی زۆر پاکین،
کۆڕی خەبات، بەبێ ئێمە شڵەژاو و بێ دووربینە.
ئێمە بنەمای ئەم گەلەین، بەردیش لەجێی خۆی سەنگینە!
نەخاک دەشێ بێ کرێکار ، نەکارگەریش بەبێ خاکە
هەر ئەم دوانە پیرۆزەن و ئەمیان بۆ ئەوی دی چاکە
* شاعیرێکمان هێنایە دەنگ...
لەسەرچاوەی هزری ئێمە دەخواتەوە
کۆڵی خەمی لە سێبەری ڕێی ئێمەدا دەکاتەوە
هەر سلاوی سەنگی ئێمە دەداتەوە
سوجدە بۆ ئەو خوایە دەبات
بانگی عەشق و هیوامانی کرد بەپەیام



سەدان مۆبەد و خەڵوەیشی هەژاندووە،
سەدان ئەفسانەی نارەوای زۆردارانی ڕووخاندووە
ئەو ئێمەیە و ئێمەش ئەوین،
بەیەکەوە کۆچەرین و هەرگیز لەیەکتر ناکەوین
لە نەبەردی زۆرداراندا سەردادەنێین دانانەوین
کێشەی ئێمە قەت ناگاتە ڕێی دژواری
دوو عاشقین وەکو باران و بەهاری
شرەخۆر نین، شۆڕشگێڕین
پەیڤ و ڕستەی هەموو دێڕین
ئێمە چین و ڤیەتنام و ئۆکتۆبەرین
ئێمە پێشەنگ و ڕابەرین
ئێمە تەوەری ئەو کێشەین، لەگەڵ مرۆڤا خوڵقاوە
ئێمە ئەو دارە گەورەیەین، هەزار جاریان داهێناوە و هێشتا ماوە.
لە کوردستانی ئازادا ئێمە خۆرین
مێژوو کەمە و ئێمە زۆرین
لە دەستماندا چەکوش ڕۆژە
مژدەی بەیان، لە لێویایە
ئێمە سندوقی ئەو ڕازەین، بەختی گەلانی ڕووی زەوی لەنێویایە
ئێمە دەست لەملی داسین
ئێمە و جوتیار یەک دەناسین
* یەکی ئایار جەژنی مەیە. وەرزی نازی ئەم چینەیە
کالای هۆشی بێ پینەیە
ملهوڕەکانی بۆرجوا، با هەر دەهۆڵی خۆکوتن
ئەو گەوجانە وا دەزانن ئێمە بەندە و ئەوان بتن!
هەر بەو پیکەی بتی ئەوانمان پێ تاشی
نەک هەر خۆیان، پێگەی مەینەت لەبن دێنین
لە نوێ چەمکی (کۆمۆنە)ی نوێ، ئەزبەر دەکەین
تاجە گوڵی (ماکرۆمیک)یش لەسەر دەکەین
ئێمە هێزی ئەهرۆمزداین، کە ئازادی لەدەستایە
ئاسۆ، ئەگەر ئێمە نەبین، چاوی بەخۆرێ هەڵنایە!

هۆ بۆرجوا، هۆ کلاشی پێی مێژوومان
تۆ دڕاوی
پێمان بڵێ، هەتا ئەمڕۆ چەند جار تۆ پینە کراوی؟!
ئەو سیستمەی ناوت ناوە سیستمی نوێ
پینەیێکی پوترکاوە
پینەت بەپینە کردووە و ناوێکی کەیشت لێناوە.
ئاوریشم نیت، تۆ خۆت زەرووی
لەو ڕۆژەوە لەدایک بووی، مەرگی خۆتت لە کۆڵناوە،
ئێمە خەڵقین، ئێمە بڕواین
ئێمە شایانی سەروەرین
خۆت بکوژی، خۆت ببڕی
ئەمە ڕێگەی کۆمونیزمە و ئێمەش پێشڕەو و ڕابەرین.
ئەگەر ڕۆژێک پەیژە بووبین
دوایی دەبێ هەر سەرکەوین
کە تۆ ئەمەندە نامەرد بیت
دەبێ ئێمە چۆن هەڵکەوین؟
دەبێ ئێمە چۆن بخەوین؟
ئێمە کار و تۆ سەرمایە
کێشەی نێوان ئێمە و ئێوە
بۆخۆی ڕەوڕەوەی دنیایە
بەبوونی تۆ هاتمە گۆڕێ،
تۆوی مەرگیشتم لەلایە.
***

## لە هێلانەی هەڵۆوە بۆ فەجری خەندە

١٩٩٤/١١/٢١

لە هێلانەی هەڵۆکانتا
پۆلێ شیعری باڵ شکاوم هەڵنیشتووە
بەرخە نێری گیانی زیندووم لەبەرپێتا بەئەمری خوا
بەقوربانی بەژنت بووە



لە پشت پەرژینی باختەوە جێ دەستەکانی جارانم
هەڵدەپەڕن
جارجار قۆڵی تەزووی گەرمت دەیان گرن
گوایا دزێکی شەو گەڕن!
چونکە ماندووم، لەسایەتا
سەرم ناوەتە سەربەردی قسەی ڕەقت
چەند خۆشە لام
بەسەر لەشمدا دەبارێ. بۆچوونی حەق یا ناحەقت!
چامەکانم سەری ڕێگەیان گرتووە
بەرەو ماڵتان خۆ دەکوتن
بەسەر دار و دیوارتاندا، وەکوو کۆترە هاقووی ماڵیی
سات و ناسات دێتە گوتن!
بەقەدتەوە ئەمن چەکی ئەو سوارچاکەم
کە پێی شەرمە لەخەویشا بیکاتەوە
ڕێگری من ساڵ بەوعەیام خۆشەویستیتی بردووە
دەبێ کێ باوەڕی وابێ... ڕۆژێ هەبێ بیداتەوە!
کولێو قەندێکی زاری تۆ بخرێتە سەر ژەهری ماران
وەکو شەربەت دەخورێتەوە
شنەی نەرمی هەناسەیشت بدا لە تەیری مردوویش
هەردوو باڵی دەکرێتەوە
ئووچی زمانم لەو ساوەی لە دەواتی لێوی ئاڵت خۆی وەرداوە
بووە بەبووکی نۆ بووک و
گوڵی شیعری لەسەرداوە!
بۆچی لە دووی من دەگەڕێن،
یاران ئەرێ چی قەوماوە؟!
ئێجگار سادەن، بۆ نازانن...
تاری دڵم بەپەنجەی تۆ لێدراوە
تەماشاکەن فەجری عەشقم،
لە خەندەتا هەڵکراوە!
***

## نوێژێکی نەبڕاوە

١٩٩٦/٦/٢٤

که وەکوو مەی دەتکەمە نێو ئاوی ڕۆحم
دەبیە نزا و دەتوێیتەوە،
بۆ وەی ببم بەقوربانت، لەدەوری سەرت دەگەڕێم
وەکوو خونچەی تازە بەهار لەهەستمدا دەشنێیتەوە
که فەجری عەشق لە ئاسۆوە... ئاسۆی چاوت
لێوی ئاسمانی هۆشی من دەکات بەچەتری مەشخەڵان
دەچمە سوجدە
که ڕشێنەی زەردەخەنەت دەدات لە لێوی بارگرتووم
دێمە زمان
دەبیت بەوێرد، دەتلێمەوە. لە خەڵوە مای شەو تا بەیان
که پلووسکی ڕەحمەتی خوا لە کەعبەی جێ ژوانتەوە دێتە خوارێ
وەکوو دەروێشی دوورە عەشق جەستەم لەژێریا ڕادەگرم
گەر بمهێڵن من لەم نوێژەم نابمەوە
هەتا دەمرم!
هەر یاسایەک ڕێگە لە خۆری هەڵهاتوو بشێوێنێ
ڕسوا دەبێ و شەو وەک زریان لوولی دەدا.
لەهەر کوێیەک شکی بکەم
لە قۆچەقانێی چاوی خۆم بەرد بارانی سەری دەکەم
لە کتابی ئەندێشەمدا وەکوو ئایەتی (غەرانیق...)
لەعنەتاوی دەری دەکەم!
بەشەو ئاسمان و ئەستێرەی چاوبڕکێتە هەتا بەیان
بە ڕۆژ ئاسمان و بەهاریت
تۆ منارەی سەر بەندەری نیشتمانێکی ئازاد و
گەلێکی زۆر بەختیاریت.
ئەی جامەکەم، شیعر و بەستەی من بگرەوە... کۆکتێلێ بێ
یارانی خەم، که کۆڕیان بەست، خۆت پێشکەش که
بمانخەرە هەوای حەیران





لەعنەتی خوا لە ئەگەر و لە ئەنجام و لەهۆ و قەیران
تۆ خۆت خۆشی. ئەم دنیایە بۆچی بەتۆ خۆشنوود نەبێ و
ئێمەش ئازاد؟
جا دەم بنێم بەماچتەوە لە دوای شکاندنی عەداد!

***

## سوجدەی شوکر

لەم عـومـرەشـدا وەکـو سـاوا چاوەڕوانـی بەر مـەمـەی تۆم
بەو چاوە جـوانانەت قەسـەم من شایانی ئەو دەمەی تۆم
لەسـەر تەختـی سـینە و مـەمت بۆ یەک دەقـیـقـە پاشـابم
هەزار شــوکــرانە بۆ خــۆت بێ لەو ئاســۆیەدا ئاوابم
توخوا مژێـک لەو لێـوەت و قـومێک لەشـیلەی ئەو دەمە
ئەم بەخـشــشـە کـەی گـرانە ئازیزەکـەم کـەی سـتـەمـە؟
من بـەم ژەمــە دەبمە هـومـا، سـێــبـەر بۆ یارانم دەکــەم
تۆ ئەم ئاواتەم بێنە دی... سـوجـدەی شـوکـر بۆ خـوا ئەبەم

***

## چەند کۆپلە شیعرێکی گوڵی

١٩٩١/٥/٢٠

گوڵێک وتی من ناسکم
پەلم گرت و لە پێش دەمی (....) کەمێ ڕام گرت
پەڕە پەڕە کرایەوە
شەرم گرتی و لەبەرپێیدا وەکوو بەفر توایەوە.

گوڵێک وتی بۆنم خۆشە
بۆنێک نییە بگا بەمن
که بۆنی باخی تۆم هێنا، ئەویش سەری بەسەراگرت
وردە وردە کشایەوە
ئەو شەرمەی که دای بەخۆیدا
ماچیش هەڵی نەدایەوە.

گوڵێک وتی من زۆر جوانم
جوانێک نییە وەکوو من بێ
کە هێنامە نێو خەرمانەی بەژن و باڵات
چاوی گێلی خۆی دەگێڕا
ڕستەییێکی بۆ خڕنەبوو لەناو سەدان وشە و دێڕا.

گوڵێک وتی من ڕەنگینم
سوورم، زەردم، مۆرم، شینم
ئاسکە زێڕینە ڕەفتەیە، من بەسروشتم بەخشیوە
شۆکە و گەزۆ تۆز و گەردە و لەدامێنم داوەریوە
کە هێنامە بەر پلوسکی ڕەشی چاوت...
ڕەنگی ڕژا، بۆنی ڕژا
بوو بەقومێک گوڵاو و بۆن
بە بەر هەنگاوتا هەڵپژا

***

## بەڵێن

١٩٩٦/٣/١٠

لە زەرد و کاوی عەشقەوە، مامز ئاسا
کە بازت دا... وتم ها ئێستا دەکەوی
وتیان یاشێخ ئەوە چاوت گێل و وێلە
تاقتاقکەرەی! شەو ناخەوی؟!
تۆ بازت دا و من هەر دەوری ئەم دیمەنەم
دەکردەوە بۆ خۆم و خۆم
وتم شەرتە ئەم گوزەرە جێ نەهێڵم،
پێم داکوتا ، بەڵێنم دا هەرگیز نەڕۆم
من بووم بەپاوانێکی سەوز، قەف و باڵام
کەوتە کەروێشکە و هاتوچۆ
کە تۆم لە ئامێزمدا دی... سبحان الله
ئیتر بووم بەکارمامزی چاو و برۆ
شنەی هەڵبەز و دابەزت، بەهارێکی



تیا خستمەوە، ئاوەنیا بوو
لەگەڵ شیعر و بەستە و ئاواز دنیایەکم
هێنایە جۆش، کوێر بێ ڕەقیبم تەنیا بوو
خۆ ناتەوێ بم خەوێنی و ئەم جەختەشم
لە کیس بچێ و سەرم دانێم!
مەلە جوانە سووکەڵەکەی شوان خەڵەتێن!
هەتاکوو کەی بەدواتا بێم؟
من مرۆڤم، هیچ دوور نییە ماندوو ببم
مەرج و هەلم لەدەست بچێ
لەناو لەرزی پاساویشتا
پرسیاری ئەم مافە ڕەوام...
قەت نامرێت و ناش ڕچێ!

***

## تۆ چیت دەوێ

١٩٩٤/٥/٥

تۆ چیت دەوێ لەوە زیاتر
وەکوو سێبەری باڵاتم،
بۆ باوەشێنی عارەقەت
سروە و سەهەن و ساباتم!
تۆ چیت دەوێ لەوە زیاتر
بووم بەسروودی چاوی تۆ
لەسەر زاری یار و نەیار
ناوم بوو بەهاوناوی تۆ!
ئەی چیت دەوێ لەوە زیاتر
تۆ شابەیتی هۆنراوەمی
تۆ شابالی دووره فڕی
بازی ئەم جووتە چاوەمی
تۆ چیت دەوێ لەوە زیاتر
لە ڕکێفتام دەستە و نەزەر

وەکوو پرپشکی گڕی مەی
هەر هەوەڵ قوم دەگەیتە سەر
لەوە زیاتر تۆ چیت دەوێ
ڕازیم بەکەمت بەزۆرت
شیعرم بوو بەباخەوانی
شووشە بۆنەکەی سەرمۆرت
ئیتر تۆ چیت دەوێ لەمن
ئەی شێتۆکە جوانکیلەکە
ئەی خونچەی نێو دڕک و گەڵا
ئەی هێشووە بەرسیلەکە؟!

***

پێشەکییەکی پێویست:

*که ئەمەک نەما، کە ئەدەب نەما، کە هەموو شتێک بوو بەقاچاخە ڕێی بۆنە و تەما، کە ڕاستی ئاوەژووکرا، کە شاعیرێک هەر شاعیرێک هەموو عومری کرد بەقوربانی هەڵوێستی، پێگەی شەرەف و شکۆمەندی لە دنیای ئەندێشە و خەما و کەسانێک بێن بەدەم و لەوسێکی نامۆوە بیانەوێ ئاسەواری، شوێن پێی لە پاشاڕێگەی ئەدەبی کورددا بسڕنەوە، ڕۆڵی گوم کەن و ناوی پشت گوێ خەن وزاریان ببێ بەشەریکە تاوانی چاویان، ئەمیان نەیبینێ و ئەویان بچێتە کلیلە. ئەڵبەتە لەهەستی ئاوا شاعیرێکا کە هیشتا لە گۆڕەپاندایە و نووچی نەداوە، هەر بۆ ئەوەی ئێجگاری نەیکوژن، ئاوا چامەیێک لەدایک دەبێت!*

*شتێکی تر هەیە دەبێ بیڵێیم: ئەم چامەیە ئاڕاستەی کەسێکی تەنها نییە، دەمڕووتەکە یەک دەمڕووت نییە، بەڵکو ئەنجامی خوێندنەوەی (إستقرا)ی گەلێک ڕووداو و دیاردە و هەڵوێست و لووت بەرزییە کە لەم ڕۆژانەی ژیانماندا سەریان هەڵداوە، «من»ی شاعیریش هەر حەسیب قەرەداخی نییە بەڵکو دەیان حەسیبن وەپشت گوێ دەخرێن بەناڕەوا و بەدەستی قەسدی. «ألا تبّت یداهم» دەبا دەستیان وشک بێ و دەمیان بچێتە کلیلە.*

١٩٩٣/٥/١٥

## کەڕنەڤاڵی تاوان

* کێ دەمکێڵێ... بێ بمکێڵێ...
تەنها مەرجم هەر ئەوەیە جێم نەهێڵێ
بێ، بمکێڵە... هەر زەوییەک بەبێ کێڵان هیچ ناهێنێ



درەختێکی فرمێسکینم ڕواندووە... بیهێنە بەر
سوورە گوڵێک کە دەیگرێ بیکەرەوە و بیدە لەسەر
* بێ، بمکێڵە، ئەم زەوییەم بەیار نەبوو، با نەچێتە کێشی بەیار
دوێنێ، بەپرچی شیعرێکدا شۆڕبوومەوە، تا گەیشتمە هەناوی شار
من بۆ شەتڵی نوێ دەگەڕام...
دارەکانی شارم بینی، لە لیتەدا تاسێنرابوون،
وەکوو خۆڵی نێو ماڵانی کاولە شار، لێرە و لەوێ هەڵڕێژرابوون
ئەگەر شیعر لە هەگبەدا چووە خەڵوە، بێ بگەڕێ...
شەتڵێکی نوێ بدۆزەوە...
لە بەراوی دەفتەرێکا بیڕوێنە، فرمێسک دەگرێ
دڵۆپ دڵۆپ دێتە خوارێ و دەبێ بەمۆم
بەچەخماخەی هەناسەیێک دایگیرسێنە
کچێنی ڕووی تاریکایی، پێ بدڕێنە
شەختەیێکی پێڵوو خەوێن بتوێنەوە
شەتڵە مۆمێ لەناو هەگبەی شیعرەکانما بڕوێنەوە
* بێ، بمکێڵە، کێڵان چەمکی فەلسەفییە
دەتۆ بەرکۆشێ تۆو بێنە، بەزەویما دای وەشێنە!
- داوەشاندن بۆ تەور و پیکیش بەکاردێ
تەور وەشاندن، تۆو وەشاندن، هەردووکیان هەن
بەتەور، با، پەلی ئەو دارە دابێنین چلێکی بوو بەکلکی تەور
دە ئەو تۆوەش بکەن بەتۆز هەر بۆ ئەوەی نەیوەشێنن
دەچێتە سەر خەرمانی هەور!
گەر نەکێڵرێم، خۆم گوم دەکەم، من وا سەرهۆوم شێواوە
ئەوە مۆمە هەڵکراوە؟، یا...
چاوی سووری نامروەتیی پەندوباوە؟!
* بێ، بمکێڵە، شیعرەکانم بکە بەتۆو...
لەسەراوان، لەبانی شاخ، چاوی دوندی پێ بڕێژە
دەڵێن زەوی لەکەشدایە،
وەنەوز پێڵووی ڕماندووم و ئێستە چاوم بۆ هەڵناية
چاو هەڵهێنان بەدوای شەوا دەبێ بەخۆر

خۆریش هەر چاوی دادەگرێ، لە ئاسۆی کەم، لە ئاسۆی زۆر
– زۆر، ستەمە. زۆر، فرەیە...
فرە و ستەم لەیەک وشەی سێ پیتیدا دێن و دەڕۆن...
وتیان: لە فرە بێ بەش بن، لە زۆر بەکۆڵ ستەم بخۆن!–
* بێ، بمکێڵە... (عەین.حی.بێ)م و «بەدری»یەکم لەناخایە(١)
بیدۆزەوە و، دەری بێنە
مەتەڵیش بێ، هەڵیبێنە
بیکە بەتۆو هەزار بەدری سەر دەربێنێ
هەر بەدرییەک مەرگەوەڕێک دەڕووخێنێ
هەر بەدرییەک تاوە شیعرێک، دەبارێنێ
هەر بەدرییەک کۆنە زامێک، دەکاتەوە
هەر بەدرییەک دەست لەملی عەینێ دەکا،
حێیەک دەکا، بێیەک دەکا...
هە بەدرییەک لە جەنگەڵی کۆڕەوێکا، ڕێیەک دەکا!
هەر بەدرییەک بەسەر برینی عەشقمدا خوێیەک دەکا.
– برینی عەشق پەترۆی ناوێت،
برینی عەشق وەکوو عەینەک لە چاو دەکرێ،
برینی عەشق... دەستی ئامانی (حەللاج)ە و بۆ خوا دەبرێ–
* بێ، بمکێڵە، کێڵان چەشنێک پشکنینە.
– ئەمڕۆ قژی ڕشکن نییە،
ئەمڕۆ زمانی ڕشکاوی لەسەر زمان پەپکەی داوە
ئەمڕۆ (یارۆ) کە دەستی برد بۆ سمێڵی، شیرپیان کێشا
بۆ، نازانێ زۆر دەمێکە، لەژێر پێی (کابرا)ی داناوە؟!
* بێ، بمکێڵە... لە ناخمدا «سارتەر» یەخەی «مارکس» دەگرێ
«فرۆید» دەرگای ماخوورێکی کردۆتەوە
مارکس «مانەفێست»ی پێیە
سارتەر، دەڵێ چۆنت دەوێ وەها بژی
گوێی بدەیتێ و گوێی نەدەیتێ، ئەم دنیایە بێ بەهایە.

(١) ع.ح.ب: شاعیری ناسراومانە کە ناوی محەمەد حوسێن بەرزنجییە.



شەڕی «أنا» و تڕی «نحن» و دوایی نایە.(٢)
شەڕ زۆر گەرمە، خوێن ڕژاوە
لەو شەڕگەدا وا دەزانن دڵی منیش پارچە گۆشتێکی برژاوە!
* بێ، بمکێڵە... گۆڕەپانم،
«فۆکۆ» شەن و کەوی پێیە و شیعرەکانم بە با دەکا(٣)
وا دەزانێ من شەوگەڕێکی «پۆڵۆنیا»م(٤)
لە «شانزلیزێ»دا دەنووم
بورجی «ئیڤڵ» منارەمە(٥)
خۆ من خەڵکی ئەم شارەمە
وام لە تونێلی (ئەنفال)ی داڕووخاوا
پێم لە خانووە قوڕەکانە و سەرم وا لە قەرەجاوا
ئەو ئازادی و ئەم خەباتی کرد بەداوا.
* بێ، بمکێڵە، دەیانەوێت نەهەنگێ بم، هەزار ماسی تر هەڵلووشم
من هەر دەتوانم ماسی بم، چونکە «تانجەڕۆ» تەنکاوە
چونکە تانجەڕۆ، نە«سین»ەو نە«تایمز»ەو نە«دانووب»ە(٦)
منیش تانجەڕۆ و «سیروان»ە، ک نایەڵن ببم بەحووت
کە «مۆنالیزا»شم بینی(٧)
خامەم خەوت و خاوم بزووت!
* بێ، بمکێڵە و جێم مەهێڵە...
«دەروێش عەبدوڵڵا» فوویەکی جێ نەهێشت و(٨)
«ئەحەی ناسر» بەستەییێکی بۆ دانەنام(٩)

(٢) (أنا. نحن) لەبارتر بوو لە(من و ئێمە) بۆ ئەم مەبەستە.
(٣) فۆکۆ: یەکێکە لە خاوەن هزرەکانی ڕێبازی (بنیوی).
(٤) پۆڵۆنیا: مەبەست لە دارستانی پۆڵۆنیایە لە شاری (پاریس)دا.
(٥) شانزلیزی: شەقامێکە لە پاریسدا و (بورجی ئیڤڵ)یش هەر لەوێیە.
(٦) سین و تایمز و دانووب؛ یەکەم ڕووبارێکە لە ئینگلستان و دووەم ڕووبارێکە لە فەرەنسا و سێیەم ڕووبارێکە گەلێ وڵاتی ئەوروپا دەبڕێ.
(٧) (مۆنالیزا) ئاسەوارێکی هونەریی زۆر شۆخە وێنەی ئافرەتێکی هونەرمەند (داڤنژی) کێشاویەتی.
(٨) دەروێش عەبدوڵڵا: ئەو شمشاڵژەنەیە کە (گۆران)ی شاعیر شیعری بۆ نووسیوە.
(٩) ئەحەی ناسر: گۆرانی بێژێک بووە لەشاری سلێمانیدا، وڵاتی بەجێهێشتووە. ئاسەواریشی نییە، هەر دەماودەم باسی دەکرێت.

لەدەفتەرێکی «گۆران»دا ئەوم ناسی و
ئەمیان «مەلا سمایل»ێ گێڕایەوە[10]
کە، خوا پەیکی بەختی هەنارد، هەر من دەرگام نەکرایەوە
لە هەندەران مەجلیس گیرا، هەر عەلەیکی سەلامی من نەدرایەوە!
* بێ، بمکێڵە... شیعر ڕۆیە،
لەژێر کۆشی ڕۆژنامەیێکی ڕوو سوورا...
مەلۆتکەیێکی نیوەگیان ئیهی ئیهی دەکرووزاوە،
وتی: بەخوا من شیعر نیم دایکم ئەم ناوەی پێداوم
هەروا، بۆ سەیر، منیش بردم بۆ لای چاوم:
– هەر سەیری هەور دەکەم و دەکەم
هەور، هەور، هەور[11]
هەر سەیری ڕووبار دەکەم و دەکەم
ڕووبار، ڕووبار، ڕووبار،
هەر سەیری ئەسکەملی دەکەم و دەکەم
ئەسکەملی، ئەسکەملی، ئەسکەملی
هەر سەیری مەکینەی دروومان دەکەم و دەکەم
مەکینەی دروومان، مەکینەی دروومان، مەکینەی دروومان
هەر سەیری هەویر دەکەم و دەکەم
هەویر، هەویر، هەویر
هەر سەیری پیواز دەکەم و دەکەم
پیواز پیواز، پیواز،
هەر سەیری چاو ناکەم و ناکەم
ناکەم، ناکەم، ناکەم.
تۆ شیعر نیت، تۆ دەنگی نێوی ئەشکەوتێکی ئێجگار چۆڵی
تۆ دەنگی ئەودیو حەمامی
گڕوگاڵیت، کەی تۆ کەرەسەیێکی خامی؟!
«قانیع» وەرە ئاش وەگەڕ نێ

(١) مەلا سمایل: حیکایەتخوانی شار بووە لە ڕۆژانی پێش دەرکەوتنی ڕادیۆ.
(١١) دەقی ئەم بەناو شیعرەم لە ڕۆژنامەی (هەرێم) ژمارە(١٣) ڕۆژ ١٩٩١/٤/٢٥وەرگرتووە.



شیعرەکانی «نالی» و «مەحوی» پێدا بکە
چۆک دابدە!
لەبەردەمی دیکتاتۆرا، لەسەر تەریقەتی «فۆکۆ»
شیعر دەبێ بڵێ هەڵلاو ئیتر نابێ بڵێ هۆ، هۆ.!
* بێ، بمکێڵە... گاسن تونکدە لەبن پەترۆی ئەو زامانەی
لەگیانمدا خەمین دەبن
بەمژینی درۆی تووتن تەسکین دەبن
پەترۆ دەموکتی زامانە
پەترۆ ئەنفالی ڕووخاوە بەسەر زاما
ئەنفال خوێنێکی ترشاو بوو لە کەلاما
بۆیەکەمجار کەفیچقەی کرد پێشی هەزار و هەنێ بوو
لەو کاتەوە بۆگەنێ بوو
لە دومەڵا خۆی شاردەوە
لە وڵاتی خەم و خۆڵا تەقییەوە کرا، بەئاو و ئاردەوە،
کرا، بەسەر خوێنی پاکی پاکیزەدا،
بەناو گەڵی ئەم وڵاتە ئازیزەدا،
لەژێر لێفەی بیست و پێنجی سەفتەپڕا[12]
ئیتیحادولنیسایەکەیشمان پێ بڕا
کوڕ پێگەیی و کچ هەڵگڕا
تڕحێو جەنابی حاکمی دادگای مردوو
تڕحێو خەڵکی خۆ کەڕکردوو
* بێ، بمکێڵە... هەموو ڕۆژێ کە خۆر پەڵەی گزنگ دەدا
دەڵێم ئادەی، پەنجەرەی من بێ پەردەیە
ژوورەکەیشم هەر ئەو هەناسە سەردەیە،
پیرەژنێک لە پاینما دەیکا بەشێو
لەسەر دڵم دەبێ بەکێو
بۆنی «کەژە» و «بەهار»ێکە[13]

(١٢) بیست و پێنجی: واتە ئەسکەنازی بیست و پێنج دیناری.
(٣) کەوەژ و بەهار: دوو جگەرگۆشە جوانە مەرگەکانی خۆمن.

خودای کوێری برسییەکان، ئا ئەم کارە چ کارێکە؟
بێ، بمکوژە... شیعر دەڵێم، دەڵێن لاوک و حەیرانە
شیعر دەڵێم، دەڵێن سەرمۆر و گریانە
شیعر دەڵێم، دەڵێن تەپڵی کوردستانە
شیعر دەڵێم، دەڵێن لاسایی فلانە
شیعر دەڵێم، دەڵێن قەڵای پیاوماقووڵە
شیعر دەڵێم، دەڵێن یاشێخ تەیکەچنێکی بێ شووڵە
کە شیعرێکی تەڕیش دەڵێم... دەڵێن لەسەر پەڕەی دەفتەر، مەزەی گانە
ئەرێ خووا هەزاران ئاخ لەدەست ئەم خوایەی هەمانە
لەدەست ئەم بایەی هەمانە
لەدەست ئەم کایەی هەمانە!
* بێ، بمکێڵە... ئەم زەوییەم هەڵگێڕەوە
باسێکی من بگێڕەوە
دوێنێ دەمڕووتێکیان هێنا... پێش بەسراو و پاش کراوە
دەم و پلی خۆی هەڵداوە...
بایێکی دا، خولێکی دا
لەبەر پێما تلێکی دا
دەستی هێنا بەرگی شیعرم لێ کاتەوە
وای دەزانی پەچەم هەیە، ویستی پەچەم هەڵباتەوە
بورکانی تف لەمنەوە وەها دەرچوو...
دەمی بوو بەشیلاوگێ، پڕ بوو لە گوو.
* بێ، بمکێڵە، بێن بمکێڵن، جووت دابەسن
هۆ، ئەوانەی هەوری ڕەشن، بەری بارانتان گرتووە
بێن دابەزن
توو شەرەفتان ئەگەر ئێستە جاکێ بوایەم جۆنێ بوایەم...
هەروەک ئێستە دەتان ناسیم؟
ئەگەر ئێستە من و ئێوە هاولەگەنی نێو بارەگای حیزبێ بواین...
ئاخۆ لەچی دەتان تاشیم؟
ئێستە منیش ئەستێرەییێکی کە، نەبووم؟!
ئێستە منیش ڕاوێژکاری دیکتاتۆری کەرنەڤاڵی تاوان نەبووم؟



ئێستە منیش برا گەورەی گوێ ئاگری باوان نەبووم؟
لەناو دەریای تەریقەتی هەرکەسێکدا...
لە، وانەکان، دوو وان نەبووم؟
توو شەرەفتان، تووشەرەفتان
هەر کامێکتانن چۆپی کێش
دەبێ تاوانی من چی بێ، کە تەشتێکی پڕ نان نەبووم؟!!!

***

## پێنجەم وەرزی دوای چلە

وا پێنج وەرزی دوای چلەمە، دنیام شەوێکی درێژە،
وشەکانم نەمان ئەگرن
بەیانییە کۆرپەکانم، هەر زوو ئەمرن
لە گۆڕەپانی ئازارا پەیکی مەرگم بۆ نابەزێت
ئەو حەرفانەی لێم دزراون، زمانی خۆم ئەبرژێنن
لەسەر منارەی شانمەوە قۆڵی شارم لێ هان ئەدەن
پەیتا پەیتا سەر و دڵم لە مەنگەنەی زمان ئەدەن

*

وا پێنج وەرزی دوای چلەمە
هەر، تابلۆیەک هەڵخرابێ
ڕەنگەکانمی تێدا دیارە
هەرچی بەستە و سروود هەیە
شیعرەکانمی تێدا سوارە
ڕێگەم هەر ڕێی نەهاتییە
زەویم هەر ئەو بەیارەیە
هەر کاروانێ ڕچاو ئەکەم، کە بار ئەخەن
هەوارێکم بۆ دائەنێن... تاپۆی ڕەشی سێدارەیە.

*

وا پێنج وەرزی دوای چلەمە
لەسەر خوێنم ململانە...
کێ چاکترم سەر ئەبڕێ؟

لە گێژاوێکی چڵکنا خوێنم ئەدات بەڕووی شارا
کەس نەوێرێت تەماشام کات
سەیری کاتی گیانەڵام کات

*

هۆ وێرانەی وەرزی خەم و ناکامیی من
خەڵکەکانت بۆچی لە دوای ئەمڕۆی خۆیان
دوێنێم ئەخەنە پشت گوێیان؟!
بۆ هەر لە سەر کوورەی دڵم
گەرمی ئەکەن شایی و ئاهەنگ
بۆ هەر لەناو کاسەی سەرما
بەکارەسات ئەدەن لەزەنگ؟
دۆزەخیش بێت
من بەولاوە کەسێکیکەت تێدا نییە
هەر کەسێکیش ئەگرم بەیار، هەوەڵ ژووان دەرئەکەوێت
نەیارێکی سۆزانییە!

*

وەڵام...
وەڵام لەناو کام هۆرەدا تاسێنراوە؟
وەڵام لەناو چاوی (شەم)ی کام (وەلی)دا بووە بەخوێ...
دڵۆپێ ئەشکم ناداتێ بۆ سەرداخی پرسەکانم
دوعایەکیش جێ ناهێڵێ
بۆ منالّی ترسەکانم!!

***

## پێکی ڕەش

بەغداد- ١٩٦٨/٢/٢٠

ئای سەرخۆشین!
ئای بێهۆشین!
بۆ پێکی تاڵ؟
وا تاڵ و ژاڵ!



هەر نۆش ئەکەین!
خۆمان وەها سەرخۆش ئەکەین!؟

*

لە سێبەری هەور و تەما...
خۆمان مات و بووسە داوە،
وەکو ماسی بن گۆمی لێڵ
چاو و دەممان
کونی گوێمان
پڕ لە زووخاو و قوڕاوە
هەتاو هەرگیز بەدی ناکەین
لەشمان سڕە
بەسەر یەکدا تێک ترشاوین
بیرمان وەکو پێخوێی قوڕە
کەچی هەر پێکی تاڵ و ژاڵ
خەست وەک لیتە...
ڕەش وەک خوماو
ئەی خۆینەوە گەورە و منالّ
بەدەم، بەگوێ، بەلووت، بەچاو!

*

هەڵئەچۆقین لەسەرمانا
پشت ئەبەستین لەبرسانا
ڕائەچلەکین لە ترسانا
کەچی هەر لەو پێکە خەستە
کۆمەڵ ئەکەین
دەستە دەستە!
لەتر ئەبەین لە ڕۆیینا
بۆ دواوە دێین
تەکان ئەدەین
پێ بەسەری یەکا ئەنێین
تەپ و نمی شەوگاری ڕەش
ڕێگای لێ کردووین بەهەش

*

دەرگایماڵمان لەسەر پشتە
دەرگای باخمان
دەرگای دڵمان
داومانەتە دەستی بتێ
هەڵماتی بێ بەروپشتە!

*

ئەخۆینەوە
ئەڕشێینەوە
لەڕێی مەلی هیوامانا
تەپکە و تەڵە ئەنێینەوە
ئەخۆینەوە
پەڕەی کتێب ئەشۆینەوە
لەسەر دەنگی دەهۆڵی شڕ
هەڵئەپەڕین
بەیەکا دێین
سەرکاس و وڕ
لاشمان وایە
کە تاریکی ئەم دونیایە
بۆ پێشوازیمان ڕووناکە
هەرچی ئەکەین
هەر خۆی چاکە.

*

گوڵمان هەر وا لەبەرپێدا
گیانمان هەر وا لەناو جێدا
کفنی بەرمان پوترکاوە
تاریکی و تەم
بە برژانگی چاومانەوە
پوورەی داوە
ئەخۆینەوە
ئەڕشێینەوە





چۆن ڕۆیشتین
وا دێینەوە

*

ئەی بارانی بەهاری خوڕ
کەی لیتە و قوڕ
ئەشۆیتەوە
تەمی مەینەت ئەخۆیتەوە!؟
شەتڵی هیوا ئەخەیتە سەر
باخی هیوا...
دێنیتە بەر
پێکی تاڵمان
مزر ئەکەی!؟
ڕێگاوبانمان
کزر ئەکەی!؟

***

## بۆ هەژاری شاعیری هەژاران

کێ پێی وتی من ئەتوانم سوێیەکی وام بچێتە دڵ:
کە تۆ بڕۆیت، خۆت و دەنگ و خەونەکانت بخەنە گڵ؟!
ئەی شاعیری شارەزووری هەژارانم کاکە هەژار
بۆ خەونێکت نەهاتە دی، هەزار تفو لە ڕووی ڕۆژگار
بێ تۆ بەهاری شارەزوور بێ بارانە زەرد هەڵگەڕاو
بێ خورپەیە ئاوی چاوگەی داڕووخاو هەرەس دراو
چۆن دەنگی تۆ پێچرایەوە، کە خۆی نرکەی جووتیاران بوو
ئەجەل بۆ ئیستێکت نەکرد هەژار گوڵی ناو یاران بوو؟!
– کە وەرز وەرزی نەهاتی بوو هەڵپڕووکا باخ و بەرە
دنیای شاعیر خامۆشییە، هەر ئازارە، هەر کەسەرە!
لە یادمایە ڕۆژێک وتت ئێمە هەر بەگاڵۆکی شوان
جێ هەڵپەڕکێ ڕەنگ ئەڕێژین، کەپریش ئەکەین بۆ جێ ژوان
ئێمە لووتکەی شاخەکانمان دڵی ئەهریمەن لەت ئەکات
توولە ڕێگەی بنارەکان ملی دوژمنان پەت ئەکات

تۆ ڕۆیشتی و خەونەکانت سروودی ئەو شاخانەیە
تۆ ڕۆیشتی و شیعرەکانت درەختی ئەو باخانەیە
هەژارێکم لەم یادەتا سۆزی هەژاریت بۆ ئەڵێم
بوێژێکم وەکوو عاشق بەستەی دییاریت بۆ ئەڵێم
ئاوازێکی زۆر زوڵاڵی گەرووی کورد بوویت هەر ئەمێنی
لەدڵمانا هەموو وەرزی خوێن جمانێ گوڵ ئەچێنی
تا بمێنم من هەر دەوری خەونەکانت ئەکەمەوە
بەڕووی سوور و وشەی پاکت وەڵامی خەم ئەدەمەوە

***

(........)

کە ئاگرێکمان نایەوە
با هەر دڕک بسووتێنێ...
کە بووین بەگەرداو و شەپۆڵ
هەر کەند و کۆسپ، ڕابماڵێن...
خۆشەویستیی، چراوکی ڕێگەمان بێ
نوشست نییە، ئێمە زاڵین.
وا هاتووە... چاریش نییە
خۆزگە توێشووی ڕێی ئازادی
خەم نەبوایە.
خۆزگە ئاڵای ئاواتی خەڵک
هەر بەوەرزی گوڵ و بەهار هەڵکرایە.
وا هاتووە... هیچ چار نییە
زستان نەبێ بەهار نییە
بەهار ئەنجامی زستانە...
لە ئاستی تۆف و سەرمادا
مرۆڤی مەرد، کەی بێزار و دەستەوسانە؟
خۆشەویستیی لەڕێی سەختی تێکۆشانا
باخ و سەراو و سەهەنە
کە دەم و چاو سوور هەڵگەڕا...
خەش هاتە کوڵ
بیرت نەچێ تۆ مرۆڤی...



داری سۆزت لە بێخەوە هەڵمەکەنە!

***

(........)

ڕەزا نیم هاتبم، فەضلی، نیگای جوێنم بەرەو تۆ بێ
شەرابی نابی ئەم عیشقەم هەتا کەی وا لەلات کۆ بێ؟
حەریفی تۆم مەدەد شاعیر، نەکوو ئەم تانە بێ پۆ بێ.
لە دووریت تابەکەی عاشق خەریکی زار و ڕۆڕۆ بێ
لە کونجی میحنەتی غەمدا هەتاکەی دەستەئەژنۆ بێ
ئەوا وتمان ئەمن شێتم بەڵێ شێتێکی بێ مانا
لە ڕێگاتا وەکوو مەنسوور دڵ و گیان و سەرم دانا
تەماشام کە کفر نابێ کە دەمبینیت لەڕێ و بانا
بەماچێ بێ، بکە دەرمانی زامی کوشتەکەت جانا
هەتاکەی دڵ بریندراری خەدەنگی فیرقەتی تۆ بێ؟
بەڵێ ڕاستی و لە ڕاستیدای بەڵام سەیرێکی ڕێی من کە
چرا بەو تیشکی پڕتە و بێ بەسیش ڕێگا لە من ون کە
سەرم سوڕماوە تێ ناگا، سەری من بێ سەروبن کە
سەراسەر عالەمت خستۆتە حیرەت ئەی پەری چونکە
کەسێ نەی دی بەری عەرعەر ترنج و سێو و لیمۆ بێ
لەبەر خاتر کە داواکەم ئەبێتە مەینەتی خاتر
وەڵامی عەرزی ئەحواڵم وەکوو ئەشکەنجەیە و زیاتر
کە من دەروێشی کوردی بم ئەتۆیش ئەی پیرەکەم قادر
هیلاکم من بەدەستی فیرقەتت لوتفێ بکە ئاخر
هەتاکەی جان و دڵ نەشئەی شەرابی وەسڵەتی تۆ بێ
لەخەم بەولاوە ئەی یاران ئەبێ چی بێ بەراتی من
کە ئەو چاوی وەها بازە ئەبێ چ بکا شکاتی من؟!
بەشی عاشق خەم و زارە لەسەر خاکی وڵاتی من
بە(مقراض)ی غەمی، کۆتا بووە ڕوشتەی حەیاتی من
جەوابی ئەو نییە (هەمی)، هەتا کەی های و یاهۆ بێ؟!

*

ئەی دراوسێ جوانەکەم فەڕ و خێرت هێناوە
وا نەزانی کەفتەم و خودای شیعرم نەماوە
هەرچەند کە دێیت و دەرۆیی گوڵاو ڕشینم دەکەی
بۆ پشکنینی جوانیت هەر چاوێکم سەد چاوە
بەخ بەخ لە گەردن و مل بەخ بەخ لەباخی سینەت
لە کۆساری هۆشمدا هەزار لقت ڕوواوە
چ خانمێکی شۆخی چ خانمێکی مەستیت
زمانی شیعری لاڵم بەناوی تۆ کراوە
خەوی خۆشی عەشقم دی ئاگر و سوێ و ئێشم دی
توونی داخم تێک چووە خورەی ئەشکم براوە
ئێستە نۆرەی ئەوەمە بەدیمەنی جوانەکان
لەناو دڵی تاریکما تیشکێ هەڵکەم لەلاوە
ئەگەر ببیت بەو تیشکە کەعبە کەچ نابێ بەخوا
خێر هەر بۆ من ڕەوایە ئێستە دڵم شکاوە
کراوە بی وەکوو گوڵ دڵڕفێن بی وەک بەهار
تەوقێ بخە گەردنم بەو زوڵفە تێک ڕژاوە
با من دیلی زوڵفت بم لە ناو باخی سینەتا
هەزار شیعرت بۆ ئەڵێم چەشنێ قەت نەوتراوە

***

## ئاگرەکان

**ئاگری یەکەم؛**

ماوەی چەند ساڵێک لەمەوبەر...
کە ئێستگەکان، باسیان ئەکرد:
«وا ئەسووتێ، وا، ڕۆئەچێ...
وا، شاخەکان، لیتەی ئاگر ئەگرنە سەر...
وا، دەریاکان، بڵقی ئاگر ئەهاونە دەر!»
خەمم ئەخوارد،
دەستم بەئەژنۆدا ئەدا
دوایی ئەم وت... ئەی چار چییە؟!



ئەمە هەر بەختی «چیلی»یە!

**ئاگری دووەم؛**

چێشتەنگاوێ، کاتی گەرمەی هەوڵ و خەبات...
خەڵکی هەموو چاوەڕێ بوون،
شۆڕەسواری (چیلی)مەیدان... تا، کوێ ئەبات؟!
لەپڕ ڕووی دا...
خەشی ڕەشی دڵڕەشەکان تەقییەوە
شاخەکانی دا بەیەکا
ڕێی لە چەم و سەرچاوەکان بڕییەوە
سەر شاری مەیدانی تاوی لەشۆڕەسوار، تەنییەوە
سەر ئاسنی ئاگر بەشان
بەرەو ماڵی شۆڕەسواری کاول کراو، بەقەپ کشان!
جانەوەرە چاو سوورەکان
داخیان تەنها ئەو داخە بوو
کاتێ کە چوونە لای سەری
دەستی لەسەر چەخماخە بوو!
چاویان، مەرگ بوو
دەستیان، مەرگ بوو
ناویان، مەرگ بوو
دەم و دڵ و خوێنیان، مەرگ بوو
لە پرسەی بێ پرسەی شارا
دڵی (نیرۆدا)یان وەستان
لەسەر چنگ و ئەژنۆ هەستان
دەستیان هێنا بەسەر دڵا
پێیان خشان بەسەر گوڵا
هەزار چاوی ڕوو، لە خۆریان
کرد بەنووکی خەشی دڵا

**دەنگوباسێک**

دەنگ واباوە

هێشتا دنیا هەر گەرداوە.
خوێن زۆر ماوە، نەڕێژراوە!
خەش زۆر ماوە نەڕێژراوە.
ئێش زۆر ماوە، نەچێژراوە!
ماڵ زۆر ماوە، هێشتا پرسەی بۆ نەبراوە.
ڕێ زۆر ماوە، هێشتا تەواو ون نەکراوە!

**پرسیارێک**

بەسەر پێچاڵی مەرگەوە
(چیلی) دیارە پەل ئەهاوێ،
لەمیانی ئەو و مەرگا هێشتا ماویە...
کوڕە خەڵکە وا بزانم، سەیری ناوێ!

**ئاگری سێیەم**

من ئاگرێ چۆتە دڵم، ئەم سووتێنێ لەناخەوە
ئەم دا بەدەم وەیشوومەوە
کە هەڵئەکات لە داخەوە...
داخی هەلی سەربڕاوی ئەم چەند ساڵە،
داخ، هەزار داخ...
چاوی تاقی هەر مناڵە!

***

**صعالکە**

دەوڵەمەندی شارەکەمان
هەروا سەفتەی پارە دەخەن
هەموو گیانیان هەر گیرفانە و
هەتاکو دێت قوولی دەکەن
هەر شایستەی شیر و شەقن
ئێوە لە کوێن صعالکە؟
لاتثریب علیکمو ولاغروَ في ذلك
ئەم سامانە لەکوێ وەهات؟
چی پێ دەکات، بۆ کوێی دەبات؟



پێش چەند ساڵێ وەک ئێمە بوو
چۆن پێگەیی و چی هەڵ دەخات؟
چەپاویان کەن چییان هەیە
ئادەی کۆڕی صعالکە
لاتثریب علیکمو ولاغرو في ذلك
کەریش نییە پێی بگەڕێین
پێڵاویشمان هەر پاتەیە
مارسیدس و سۆپەری نوێ
هەر لایقی ئەو ذاتەیە؟
دەسا سواری سەریان بن
گەلی برا صمالکە
لاتثریب علیکمو ولاغرو في ذلك
ژێرراخەرمان هەر کۆمبارە
ئەو ڕادەخات فەرشی عەجەم
ئێمە و مەیخانەی شەوەزەنگ
یانەی ئەویش باخی ئیرەم
سەرخۆشییان لێ تێک بدەن
دەسا هەڵسن صعالکە
لاتثریب علیکمو، لاعجب في ذلك
شەو باوەشیان خانمێکە
هەموو گیانی هەر لەزەتە
ئێمەش دەبێ بیکوتینەوە
دۆڵی ڕەشی عاسە و عەتە
نۆرەپەڕینی ئێوەیە
دەراپەڕن صعالکە
لاتثریب علیکم ولاعیب في ذلك
ئەو هەر دەخوات گۆشت و پلاو
میوە.. کامی زۆر نایابە
ئێمەش نانێ بەهەزار حاڵ
سەرمان کزە بۆ ئەم دابە

ناز و نیعمەتیان لێ سێنن
زۆر درەنگە صعالکە
لاتثریب علیکمو، لاجناح في ذلك
تۆ دەپۆشیت بازە و لەنگە
لەندەنییە پۆشاکی ئەو
دەرپێ و پێکێنیی ئاوریشم
بۆ خانمی (...) پاکی ئەو
دەسا دەرپێیان داکەنن
نۆرەتانە صعالکە
لاتثریب علیکمو لاحرج في ذلك
لەگۆشت دەخوا و لە گۆشت دەدا
بانکەنۆتیش دێتە سەری
ئەگەر کاری بەکەسێک بوو
پاشی دەخاتە بەر بەری
کوا کوتەک و دار و بارتان
دەس داگرن صعالکە
لاتثریب علیکمو، لاندم في ذلك
دوێنێ لاتی ناو بازاڕ بوون
ئەمڕۆ چۆن بوون بەپارەدار؟
دوێنێ ڕووتەی کۆڵانان بوون
چۆن بوون بەپیاوماقوڵی شار؟
(...)تان بگرن بەدەستەوە
شێخ ڕەزا بن صعالکە
لاتثرب علیکمو ولاعیب في ذلك
ئێمە بۆچی برسیمان بێ؟!
ئەوان وەها تێروتەسەل
خۆ گیانیشمان دەپروێنن
گەر خواش نەیدا دەردی ئەجەل
چیتان هەیە لەکیستان چێ؟
دەی ڕاپەڕن صعالکە
لاتثریب علیکمو فالشرف في ذلك

***



# عیشقی خودایی

من ئەوا هاتم بەکۆڵێ دەرد و ئێش و زامەوە
مەینەتم زۆر بوو لەمەوبەر، وا سەری لێ دامەوە
نەفسی ئەممارەم لە ڕێما داوی بۆ دانامەوە
کێ پەنامە کێ تکامە بێجگە میهری ذاتی خوا
تۆفی عصیان، مؤمنم من، تۆ شکای نەشکامەوە
ئەو کەسەی خاوەن دەروونە، تێدەگا دەردی دڵان
ئەو کەسەی خاوەندی هەستە، بۆن ئەکات: عەتری گوڵان
ئەو کەسەی گەرما کوڵاندی چاوی وا لەسەر چلان
کێ گرەی ئەم ناخە گەرمەم بۆ ئەخاتە بەر شەماڵ
بێجگە میهری ذاتی خواوەند، کەس وەڵامی دامەوە؟!
من کە بەندەی ئەو خودایەم ڕوو لە دەرگای ئەو دەنێم
بەندەیی بۆ ذاتی خواوەند، گەر نەکەم، بۆچی دەشێم!؟
شایەتی ئەم حیکمەتەیشە چی ئەنووسم چیش ئەڵێم.
هەر خودا خۆی من دەناسێ و چاوی وا لەم کارەیە
وا بەشەستی ڕەحمەتی ئەو جارێ تر، بووژامەوە!
ئەی خودای گەورە و بەمیهر و خاوەنی دەریای کەرەم
گەر سەرم شەیدا نەبێ بۆت، بیشکێنە ئەم سەرەم
هەر بەرەی دینە دەهێنێ، بانگ بدەم من لەو بەرەم
ئەی خوداوەند ڕێنمایی دەوروبەر وا تێکچووە
هەر چەنێک کەوتم لەڕێدا، وا لە نوێ هەڵسامەوە
عەشقی تۆ پێش ترس و بیمە، عاشقی ذاتی ئەتۆم
ڕووم لە جوانیی بوونی تۆیە، هەر بەرەو لای ئەو ئەڕۆم
داوی ئەم سۆزە پەسەندەم، کرد بەتاڵی تان و پۆم
عاشقم خوایە بەخواییت ئەم گرەم مەکوژێنەوە
چونکە نووری بۆ دەروونە، ئێستاکە و ئەوسامەوە!
ئەی فرستادەی خوداوەند، ئەی (محەمەد) الأمان
ئەشکی حەسرەت وا لە چاوم هات وەکوو چاوگەی چەمان
وا لەسەر ڕێی عومری کورتا بووم بەئاشیانەی خەمان

دەستی یاریدەت، زەلیلم باری مەینەت چل مەنە
قایلم بەو داخ و دەردە، قەرزێ بوو، من دامەوە.
بانگی حەق هات و دەروونم کردەوە بێ لام و جیم
دەست بەدۆعام ئەی خودای خۆم تاکو هەر ساتێک دەژیم
بافتی لۆمە و نەفرەتیشە چەرخی ڕۆژگارێ کە دیم
أشهد أن لا إله غیرک یا ربنا
خۆ (محمد) خۆی ڕەسوولە وا منیش پاڕامەوە

***

## نزایەک

*پێشکەشە بە بولبولی خۆش خوان مامۆستا مەلا سامان*

خوایە داکەیت شەستی ڕەحمەت مەزرەعەی دڵ تەژنەیە
ڕەحمەتی تۆ بێ شومارە و چاوم هەر لەو خەزنەیە
ئێمە بەندە و دەستە دۆعاین، تۆ غەفووریت تۆ کەریم
بۆمی ڕابێنە لەسەر خێر، نەفسی ئەممارە و سەقیم
عاشقی قورئانی تۆم و طالبی عەفوو و کەرەم
خوایە تۆ زۆر میهرەبانی مەمخە گێژاوی نەدەم
ئێمە چی بکەین خۆ سەفەرمان حەتمیە، ئەمڕۆ و سبەی
خوایە لوطفێ، ئێمە بەندەین، بەندە بێ توێشوو نەکەی
هۆ برای هاودین و ئایین، ڕوو لە خوابین چاترە
ئەو شتەی تۆ وا دەزانیت سیڕڕە، لای ئەو ظاهرە
ئەم گەلی کوردە هەژارە، وێڵ و مەظلوومە برام
با هەموومان پشتی ئەو بین، تا دەگاتە جێ و مەرام
خوایە ئێمە ڕوو لە تۆین و داد و هاوارمان هەیە
بەحری عصیان و هەوامان هێندە قووڵە بێ پەیە
حەبلی سۆزت دەستی ئێمەی کەی دەگاتێ بۆ نەجات؟!
ئێمە کوێرین، بێجگە ذاتت، کێ بەرەو خۆتمان دەبات؟!
خوایە! کوردیش وەک گەلانی سەرزەمینن، شایەتی...
دینی تۆیان، لا پەسەندە، دێر بەدێر و ئایەتی
خوایە ئاواتی بەدی بێت، خوایە ئاشتی و سەروەری
بەرژەوەندیی خاک و خەڵکی خۆی بکاتە ڕابەری



دینی ئیسلامە عەقیدەم، بەندەیێکی چاوەڕێم
ذاتی پێغەمبەر سروودمە، سەر لەڕێیا دادەنێم
باوەڕم وایە بەلوتفت ئەم صەلاتەم بەی بە ئەو
سەد صەلاتی بۆ دەنێرم وەک دیاریی ڕۆژ و شەو

***

## لەسەر گلکۆی
## حفصە کریم غفور خوشکی هاوسەرەکەم

١٩٩٥/٥/٣١

هۆ شاژنەکەی ماڵە باوانت
گوڵ بەدەستەکەی ڕێی ئاوەدانت
خۆ دەبوو مردن وا شەرمەزار بێ
ڕوو ڕەشی دەرگای وەرزی بەهار بێ
چۆن دەستی چووە باخی گیانی تۆ
بەرەو گۆڕی برد ڕێی ژیانی تۆ
هەر تۆ ئەو دایکە میهرەبانە بووی
خەزێنەی خەمی ئەم باوانە بووی
هەر خوشک نەبووی تۆ وەک برابووی
هەر خوشک نەبووی تۆ وەک برا بووی
لە تاریکیدا نوور و چرا بووی
حفصەخان بەهەشت ئارامگای تۆیە
بەشی من ئەمڕۆ هەر خوشکە ڕۆیە
تۆ لە دڵماندا نامری و ماویت
وەک جاری جاران هەر لەسەر چاویت

***

## سروودی ڕاپەڕین

١٩٩٢

*هونەرمەندان: عوسمان عەلی و ئەڤین عوسمان کردوویانە بەسروود*

وا ڕاپەڕین و نەورۆز هاتەوە
مژدەی شۆڕشی نوێ ئەداتەوە

ڕۆڵەی خوێنگەرمی ئەم خاک و گەلە
چۆن پشتگوێ ئەخات ئەم مەرج و هەلە
شیرخەی گوللە و بانگی ئازادی
وڵات تەی ئەکەن، وادی بەوادی
خوێنی شەهیدە، مژدەی بەیانی
ئەدا بەکورد و بەکوردستانی
هۆ... شەهیدەکان! ئێوەن ئاڵامان
ئێوەن پێناسەی، بەقەد باڵامان
گیانی ئێوەیە پەرچەمی نازمان
شانازی و هیوا و سروود و ڕازمان
وا ڕاپەڕین و نەورۆز هاتەوە
پشکۆی شۆڕشی نوێ ئەخاتەوە

***

## برای مانگرم

(سروودێکە بۆ مانگرە قارەمانەکانی مانگی ١٢ی ١٩٩١)

*هونەرمەند عوسمان عەلی ئاوازی بۆ داناوە و چڕیوێتی*

هۆ هۆ برای مانگرم
بەتەنها جێت ناهێڵم
بۆ گوڵێ بۆنی بکەی
ناخ و دڵم دەکێڵم

*

ئەی پێشمەرگەی بێ چەکم
دەستم چەکە لە دەستا
وا لە دەورت دەگەڕێم
وەکوو مێوێ لە ڕەزتا

*

شۆڕشگێڕی قارەمان
بێ دەنگ مەبە، برامی...



دنیا لێڵ و تاریکە
ئەمڕۆکە، تۆ چرامی

*

خۆت ڕاگرە پاڵەوان
وا سەرکەوتن لە ئاسۆ
وەکوو خۆری بەهاران
هەڵ دەکشێ، بۆ لای تۆ

*

بەتەنها جێت ناهێڵم
گیانت بووە بەگیانم
دەنگم بووە بەنانت
باست بووە بەنانم

*

تینووتە هانێ ئەشکم
برسیتە هانێ جەرگم
سەرماتە ها باوەشم
بۆ تۆ پەڵاس و بەرگم

*

بەتەنها جێت ناهێڵم
باری لەشت سووک ئەکەم
ئا لەم نوێژە گەرمەدا
هەر ڕوو لە کەرکووک ئەکەم.

***

## ئەڵڵاوەیسی

١٩٨٩/١٢/٥

من دەروێشەکەی دنیای ئەڤینم
هەموو شت، وەچاو دڵم ئەوینم
لە بۆتەی عیشقام، پێش توانەوەم
گەلی عاشقان بێنە سەرینم

ئەمڕۆ جەژنی عیشق و خەمە
وەلی شێخی کاکە مەمە
دەروێشەکان بێن ببەستن
کۆڕی زیکری ئەوینداری
پاییز وەرزی خەزانێ بوو،
لەگەڵ فرمێسکا داباری!

دەروێش ئەڵڵاوەیس پڕ قەبرت نووربێ
قەبرت لە ئاگر جەهەننەم دووربێ
گۆڕەکەت مەزرای سۆزی عاشقان
پڕ لە گوڵاڵە و شەوبۆ و چنووربێ

ئەمڕۆ ڕۆژی جام و مەیە
مەزەم سێو و نوقڵ و بەیە
لەمەیخانەی کووچەی ئێمە
هەرچی تیایە هەر عاشقە و
لەفەیزی گیانی جوانانە
هەرچی هەبێ و هەرچیش هەیە.

کە بورکانی دڵ، دەتەقێتەوە
بەرەو کەشکەڵان هەڵدەستێتەوە
باسێک نامێنێ لەناو مەجلیسا
هەر باسی عیشقە، نابڕێتەوە

چاو جوانەکەم، کەی دێتە کۆڕ؟
دڵی دەروێشان خۆش بکا
لە کووپەی ئەم عیشق و خەمە
قومێک لە جامێ نۆش بکا؟

دەروێش ئەڵڵاوەیس پیرۆزە یادت
سۆزی ئێزەدیی دەروونی شادت
لە توێشووی خەمی دەروێش مەشرەبێ
هانێ کەویژێ بۆ تامی زادت

کوورەی ناخم تاو دەسێنێ
ئەندێشەی نوێم بۆ دەهێنێ



لەم گەردوونە بێ پەیەدا
ئەنجام عیشقە و هەر دەمێنێ

وێنەی یاری خۆم وەدڵ گرتووە
پەنام بۆ سیحری کوردی بردووە
بەستەم لە سۆزی دەروێش ئەولایە
ئاڵای مەنسوورم بۆ هەڵکردووە!

خڕ بنەوە هاودەردەکان
ئازار کۆڵی گرانمانە
ئەوین چرای ڕێگە و بانە،
مەسیح کاتێ پێغەمبەرە
کە خاچی خۆی لەسەر شانە!

هۆ دڵدارەکەی ئەم وەرز و دەمە
پەیامت زینە و قیبلەیشت شەمە
بچۆ لە خەڵوەی بادەنۆشانا
با بیکەن بەوێرد، سۆزی ئەم خەمە.

خڕ ببنەوە و کۆڕ ببەستن
دەست لە گەردنی یاری جوان.
مەی دێرەکان! بۆ دەنگ نییە؟
چۆپی گران! لە کوێن و کوان؟
ساقی بەسینی و جامەوە
شاعیر بەشیعر و زامەوە!
سروشت بەسوبح و شامەوە
حیکایەتخوان، لە بەرزایی،
بەدەفتەر و کەلامەوە...
چاو جوانەکان! دەردەکەمە!
دەسا وەرن بەلامەوە
قومێک لەجام، مژێک لە لێو
دڵی دڵدار باخەڵێکە
زێڕی عیشقی دەنێتە نێو!

دەروێش ئەڵڵاوەیس پیری گەرمەسێر!
بۆ ناخی خەمم، دەبی بەئاودێر

له کـــوێســـتـــانەوە جـــۆگـــەلەی ئەوین
هەڵکە بۆ باخی عـــیـــشـــقـــەکـــەی نوێن
کـــوێســـتـــان! ئەوە گـــەرمـــیـــانـــی دڵ!
شـــەقـــار شـــەقـــارە دەشت و دەر
بۆ عـــیـــشـــقـــی من داری زڕ بێ؟!
کـــوا قـــەتارێک با بێـــتـــە بەر.

***

## تۆ و من

١٩٩٠/١١/١٠

وەک چۆن شەهێن لە چیاوە بۆ نێچیرێ خۆ دەهاوێ
هاتیە خوارێ
هەتا شەستی چاوەکانت بەسەر منا وەکو لێزمە دابباری
وەک چۆن دەریا شەپۆڵ دەدا، لە ناکاوا
شەپۆڵت هات
هەتاکوو من ڕابکێشێ و بەرەو سیحری چاوتم ببات
وەک چۆن لۆکەی شیکراوە، قەدەرم بووی،
کە بادرای
تۆ قۆزاخەی ئاوریشم بووی، لەسەر گلۆڵەم
هەڵکرای
وەک چۆن ئەندێشە عاشقێک هەڵدەگرێ
هەڵت گرتم
لەسەر باڵی چاوەکانت، بە(سدرة المنتهى)دا
تا -قاب قوسین-ت بردم
وەک چۆن شیعرێ لە دەروونی شاعیرێکا خۆی ناگرێ
تۆ دات لە باڵ
وەکوو -تجلّي- و کێوی -طور- من بووم بەکل
بۆ چاوی کاڵ
وەک چۆن ئەهلی وەحدەی وجوود لایان وایە
ڕەنگێ لە خوان
لە دامێنی نیگایەکتا، بووم بە بەڵگە، منت ڕوان
خولیای خۆمم دەشاردەوە، لە هەشتەرخانی دڵمدا



وەکو گرەو دەتبردەوە
هەرچی دەرگای داخراوی ڕازم هەبوو، بەئەنگوشتی
(شق القمر) دەتکردەوە
بووم بەجێگە چینەی مەلی پەیامی عیشق و دڵداری
بۆن و بەرامەی جوانیتم وەکوو ڕشێنە لێ باری
ئازادیخواز چۆن شەیدایە بەدوای ئاوات و بڕوایا
دایک خۆی چۆن دادەهێڵێ بەسەر نۆ بێشکەی ساوایا
منیش وەها شەیدای تۆم و منیش وەها قوربانتم
تۆ خۆت جوانی، بەڵام بەخوا، من سروودی چاوانتم

***

## هەوراز

١٩٩٣/١٠/١٧

خەونەکانم برینێکن خوا خۆی خوێیان دەکاتە سەر
شیعرەکانم وەکوو پێکی لاربووەوە، دەڕژێن بەسەر دەست و پێما
دەبن بەمار لەناو جێما
گوڵەبەڕۆژەی ناولوولەی چامەکانم لەسەر زمان برژێنراون
پەیڤەکانم، دەنکە تەزبیحی بچڕاوەن، لە پرۆژەی شیعری خەما
لێم ون دەبن
کە دەگەڕێم بەدوایاندا، بەلووتمەوە دەبنە خەزێم
بە، ڕوومەوە دەبن بەرێش
بەچاومەوە دەبنە وەنەوز
باری پێڵووم قورس دەکەن وەک خەم و مەی
وەک لق و بەی
تەمەن هەروا سەر دەکەوێ و لەهەورازا بێ وچانە
ترسم هەیە خۆی نەگرێت و دابهێزرێ
تا دەبێزرێ
هۆ حەرفینە وەرن وەرن
هۆ پەیڤەکان گری گری
هۆ شیعرەکان کۆ ببنەوە،
هەر ئێستاکە... هەر هەمووتان دەبێ بەرەو خۆ ببنەوە
ئێوە بەچی هەنگەژاڵی عومری تاڵن

دە وەرنەوە ئەم میحرابە –کاتی نوێژە– باش بماڵن!
من دەستنوێژێکم گرتووە نە خەو، نە با، نە دەستی ژن
نە باخەڵی، نایشکێنن
کە شاعیر بووی دەستنوێژی تۆ گرانیش بێ هەر ناشکێ!
کە بووی بەداری واوەیلا دڵۆپێکت لێ ناتکێ!
نامەردینە: من لەسایەی ئێوەوە، داری واوەیلام و هەی هوو
کەس نازانێ هەناسەی من لە کوێوەچوو بەکوێدا چوو
لە کوێدا بوو بەرِازەکەی هەبوو نەبوو
ئێوە بوون بەگڵمتکە بەردی سەرەرێم
منیش گۆرِە جوولەکەم و نەریت وایە گڵمتکانم بخەنە سەر
کەس نەتوانێ رۆژێ لە رۆژانی قەڵەم، مرازی بۆ بگرێتەوە
بێت و هەڵمبداتەوە
بێت و دۆرنجی برژانگ و تەم و فرمێسک
لە چاوانم بکاتەوە
هەناسەییێکی سارد و تاڵ لە لێوانم دوورخاتەوە
چادری سەردەمی نەوسی داتەپیوم هەڵداتەوە
ویستم بڵێم دنیا هیچە
ویستم بڵێم گۆشتی رِانی خۆم دەخۆم و مننەتی شا بە(...)م بێ
ژنم ناوێ، ئەگەر شەیتان شەوانە بێ و لەبنم بێ
ژوور و هەیوانێکم بەسە، لەجێی کۆشکی مەزنم بێ!
ئەم ویستەشم لێ حەرام بوو
هێڵەکی پێستی ئاردبێژم کەوی سەر خەرمانی زام بوو
نامەردینە... حەرف و پەیڤ و شیعر و وتار
ئێوەی شەیتان چۆن خۆتانتان لێم کرد بەکەل...
بێمە سەرتان، بۆ کەس نەیێمە خوارەوە
بۆ کەس ناچمە ژێر بارەوە!
ئێستە خۆم داری واوەیلام لە ئاپۆرای وڵاتێکی بێ سێبەرا
بنەمێوێکی جێماوم لە گوندێکی بێ دێبەرا
رووبکەمە کوێ؟... تێرمان چەوریی خستوویەتی
رووتەش باهۆزی کەش و فش گەستوویەتی
وا دەزانێت ئاوەرِۆگەی بێ دەرفەتە، کەچی سەرما بەستوویەتی!



بۆ کوێم دەبات ئەم هەورازە؟ تا کوێی دەگەم ئەم هەورازە؟
خەمم گەورە و دەروونیشم ئاوەدان و رێی گوزەرم زۆر لاوازە
نامەردینە، کە دارِووخامە خوارەوە
بەچانی خەم و خارەوە
چیم بۆ دەکەن؟
سەد بالۆرە نانێ ناکا
سەد شیعری جوان (...)ێ ناکا
ئەم هەورازە نانی نەهێشت لە توێشووما
(...)ی نەهێشت لە هێشووما
کاروانکوژەی کوژاندەوە لە ئاسمانی سەر و رووما.
نامەردینە... حەرف و پەیڤ و شیعر و وتار
کە، داهێزرام رەنگە بکرێن بەدار تەرمم
رەنگە بکرێن بەپەلاسێکی بێ بایەخ بۆ سەر شەرمم
رەنگە ساردی بکەنەوە جواناوی لالێوی گەرمم
رەنگە بمکەن بەنەفخی هەر خوداوەندێک
بمکەنە زاری مریەمێ
لە کام ئاسۆی دەربەندمۆندا وەکوو خۆرێکی باڵ شکاو سەربکەوم
هەر بۆ ئەوەی لەژێر هەرەسی مێژوودا
هەتا هەتا بۆی نەخەوم
داری واوەیلای ئاپۆرای خەم و خوێنم
زۆر دەمێکە –سالەشێت–ی نێو بازارِی پەڵ و جوێنم(١)
بێن تەماشای دەورم بکەن، دەپێم بڵێن کێ بدوێنم؟
ئەشکم بەسەر کام هەناسەی ساردی خۆما هەڵوەرێنم؟!

***

١٩٩٦/٧/٢٨

## بەڵێنێکی سەیر

من برسیمە، پارووی پرِی رووومەتی تۆ بۆ دەم نابەم
من تینوومە، خەندەی لێوی پاراوی تۆ وشک ناکەم

(١) سالەشێت: شێتێکی بەناوبانگی شاری سلێمانی بوو پەڵ هاوێشتن و جوێن دان چەکی دەستی بوو.

من تاسقم، دەست ناهێنم باڵای بەرزت شۆڕکەمەوە
بەئاواتم، قەت ناهێڵم چاوم چاوت بپروێنێ
من هیلاکی وەنەوزێکم، قەت ناهێڵم بەخەیاڵیش
تاوێک سەرنێمە سەر ڕانت
من عاشقم، تیری خەدەنگ ناگرمەوە، دڵم نەبڕێت
من حەللاجم لەت لەتم کەن، هەر أنت الحق دەڵێمەوە
من لاسارم، سەد هەزار جار دەرم بکەیت
هەر بۆ ئاستانەت دێمەوە
لە بازنەتا دەخولێمەوە
من لاولاوم، حەیفە لەلام بەباڵای تۆدا هەڵکشێم
گەڵام ڕەنگت دابپۆشێ
سیاچەمانەم، حەیرانم، بەیتت وەها ناخوێنمەوە
نەیارانم لێت تێ بگەن
من شارەزای تۆپۆگرافییای باڵاتم
چاوگەی جوانیت نادرکێنم
من خەونامە دەگرمەوە، بەڵام خەونت
بۆ هیچ کەسێ ناکەمەوە
من عەزرەتیم، ژەمەن بوردەم، کەف کەوتووەتە
لای لێوم
ئەندازیارێکی پەنگ خواردووم، هەر جیهانی تۆ دەپێوم
من فەرهادم، مەمم وەلیم سیامەند و کاکە لاسم
مەڕنەمووکەش(١) بەسەر سەرمدا ببارێن
لە تۆ بەولاوە ئازیزم هیچ کەسێکی کە ناناسم!
بۆ کوێ دەڕۆیت، لەکوێ لادەی
بۆ هەر بەستەییێک خۆت بادەی
بەدواتەوەم
وەکوو چێژێکی ئەبەدی بەنانتەوەم بەئاوتەوەم
نەبە نەوسم دەتسووتێنم

(١) مەڕنەمووکە: (من ربک)ەیە و لە دوای مردن لێت دەپرسن: کێ خوداتە؟



نەبە خۆزگەش دەترچێنم
تۆ پاداشتی تاوانمی
گەر شیعریشم بخنکێنن، جێت ناهێڵم
چونکە تۆ کوردستانمی
چونکە تۆ چەمکی شیاوی خەم و پێچەن و ژانمی.

***

## بەبێ ڕتووش

١٩٩٥/٢/١٤

### ١- خەیاڵ

کە دەتبینم دەتوێمەوە
ئیتر چۆن چۆنی دەتوانم وێنەت بگرم
کە ڕێکەوتیش یەکمان دەخات
تۆ دەژیت و منیش دەمرم!
ئەو ساتانەی تۆ بەئاگای
وەنەوز دەخرێنە سەرچاوم
کە تۆ گەزگەز باڵادەکەی
منیش پێکێکی ڕژاوم!
کە دەست دەدەمە دیوانێ
شیعر دەبێ بەپەپوولە!
تۆ گۆڕەپان جێدەهێڵی و
دەرسات ئەویش گەردەلوولە!
ئەوەی هەیە سەر سووڕمانە،
ئاوابوونە، ئەندێشەیە!
بۆیە عەشقیش کەشتییەکە و لەسەر شەپۆلی کێشەیە!

### ٢- خەون:

با، بولبولی لێوی ئاڵت لەنگەر بگرێ
لەسەر هێلانەی لێوی من
با، ئارەزووت ئەزنەق بدا و
پێی بخزێتە ناو دەروونی پەشێوی من

مەمەکانی سەربزێوت...
لەناو چنگما دزەی بۆ بکەن وەک سمۆرە
پەنجەکانم لەژێر چەتری قژی خاوتا
لەدار بدرێن نۆرە نۆرە!
لەبەر بای وەشتی هەڵپەما
خەرمانی کوتراوی لەشت، شەن و کەو کەم
کە خۆر ویستی چاو هەڵهێنێ
دەستم بگرم بەڕوویەوە و هەردوو چاوی پڕ لە خەوکەم!
یا ، بەرامەی عارەقەی تۆ
گیانم بکات بەشەلاڵێ
ڕووت بمخاتە بەر سایەقە و
ڕتووشم لێ دامالێ!
ئەو عەزرەتەی بەسینەتا
دەگاتە چاڵی ناوکت
هەمووی بنێم بەسەرەوە!
کە ، گرتمت، سوێندت دەدەم هەتا دەمرم
دەرگام لەسەر مەکەرەوە
هەموو دنیات لێ بێتە دەنگ... کوا چی لێهات؟
وەڵامی کەس مەدەرەوە!

**٣- کە خەونم دێتە دی:**

لەمێرغوزاری داوێنی چیمەن پڕتا
وەکوو جوانوو دەلەوەڕێم
وەکوو تاڤگەی کەف چەرێنم
کاتێ بوخچەت دەکەیتەوە
یەکجاری خۆ دەرەتێنم
بۆ، نازانیت سەگی نەوسم لەدەرماڵتا هەڵتووتاوە؟
کە دەتبینم، هێند بەپەلەم.
دەڵێی نانم بەتەنوورەوە سووتاوە!

***



## دیاری

١٩٩٦/١٠/٢٧

من دەمەوێت دیارییەکت پێشکەش کەم
تۆ خۆت بڵێ چت بۆ بێنم؟
لەگەوهەری دەریای شیعرم بۆ ملوانکەت
کامیانت بۆ هەڵبژێرم؟
ئەوەندەی تۆ لەپێش چاوما جوانکیلانەی
بووکێک نییە بەو بەهایە
نەقشی وەهاو بەم هونەرە دارێژرابێ
هەر شایانی دەستی خوایە
کچە کوردە بێ یانەکەی بێ نانەکە
بۆ بەپەلەی لێم ڕادەکەی؟
ڕۆژی مەینەتی ئەم ڕۆحەم لە هەگبەتا
هەتاکو کوێ و بۆ کوێی دەبەی؟
دوێنێ سۆزانیی سیاسەت وەکوو تەتار
هات چەپاوی توانامی کرد
ئەژنۆم نییە کە دوات کەوم، ئازیزەکەم
پەنام بۆ ئەم سۆزانە برد
لا کەرەوە و گۆشەنیگای چاوەکانت
بەرەو ناخم بنێرەوە
ئەم قەفەسەم تاریک مەکە و باسی عەشقم
بۆ هیچ کەسێ مەگێڕەوە
توێشووی ڕۆحم تەنها ماچێکە لەو لێوەت
پێت نەبەخشیم
چۆن دڵت دێ جێم بهێڵی کە نازانم
هەتا سبەی چلۆن بژیم؟
کە گەوهەری شیعرت نەویست، دانە دانە
ئەشکم دەکەم بەتاڵەوە
تاڵە تاڵە هەڵیان واسە وەکوو مەسیح

بەدار ئەستێرەی خاڵەوە
ئاواتم بوو (وەلی)ی عەشقم هەر بۆ شەوێک
لەگەڵ شەمتا ببێت بەجووت
نەتهێشت بەڵام تەنها ماچێک
لەو گۆناتە دەبێ بەقووتی لایەمووت.!!

***

## خەونێکی خۆش!

### لەسەر رەوتی سوارچاکانی شیعری کورد

١٩٩٤/٦/٢٣

گەرد و گوڵی بەیان بوو، جامم هەر لێوانەبوو
سەد مژم دا لە لێوت، دڵم هەر دێوانە بوو
ئەستێرە گەشەی بەیان چاوی بڕیبە چاوم
ئەو بێ ئەقڵە وای زانی منیش بێ چاوەڕاوم
لەو تاریک و ڕوونەدا ئەستێرەکانی سەرکەل
لە ئێمەیان دەڕوانی و ئاوا دەبوون پەلەپەل
من شاعیر و بوێژ بووم، تۆ بووی بەبەستەی زارم
ڕووبارێکی زۆر شێت بووم، بووی بەدەریای قەرارم
قۆڵێکم سەرینت بوو پەنجەم دوگمەی کردەوە
چپەیشم لە گوارەی گوێت، گرەوی خۆی بردەوە
بە باڵاتا وا ئاڵام، چێشتەنگاو نەمکاتەوە
باخی ئاو لێ براوم چووزەرە هەڵبەاتەوە
دەمم لە دەمتا خەواند، دڵم نا بەدڵتەوە
وێڕای سوحبەتی مەمان، بۆنم نا بەگوڵتەوە
تاقگەی حەزی تۆ واهات، هەموو لەشمی گرتەوە
کۆتایی زستانم بوو، زەویم پشکۆی خستەوە
مەست بووم وەلێ چ مەستێ، بووم بەفریشتە و نەمام
ئا لەم خەونەش ڕاپەڕیم، بەڵام من هەر بەتەمام



سەیرە عەشق چی دەکا و چی بەسەر عاشق دێنێ
بەیارێکی خەوتوو بێ، تۆوی خۆی تیا دەچێنێ
کە تۆوی عەشقیش ڕوا، ڕەحمەتی خواش دەبارێ
هەر خەندەییێک لە لێوێ، هەرگوڵێکیش لە زارێ

***

## هەستێک

١٩٩٤/٤/١٦

هۆ کچەکە، ئەم باڵایەت عەلەمی کام دەوڵەتەیە
دەشنێتەوە و منیش لاوک و حەیرانم؟!
هۆ کچەکە، چ مەیێکت لە چاوانتا گرتۆتەوە و
من نایزانم؟!
هۆ کچەکە، چ قژێکت داهێناوە و فرێت داوەتە سەر شانت
وەکوو تاڤگەی زەردەپەڕە و دەم دەنێتە نێو مەمانت؟
هۆ کچەکە، چۆن دڵت دێ ئەو دوو مەمەت
وەکو چۆلەکەی ترسنۆک، لە سوخمەدا گیرت داون
بۆ حەز دەکەی پێ نەگرن و هەڵنەفڕن هەتا ماون؟
بۆ خونچەی دەم ناکەیتەوە، وتەی لاچۆ پێی نەزانێ
کە، وتم دەم، بڵێی هانێ ، کە وتم مەم. بۆی نەگەڕێیت
بڵێی کوانێ؟!
خۆم هەڵواسم بەباڵاتا و لێوم بگاتە لێوانت
دەستم وەکوو منالی هار، قژی خاوت دەشێوێنن،
دوگمەی سوخمەت دەکەنەوە و چۆلەکەکان دەترسێنن
دەستەکانم بێ چاوەڕوون لەباخچەدا...
هێلانەی مەل دەڕووخێنن.

***

## کۆتایی ئاهەنگەکان

١٩٩٤/٧/١٠

لەناو خەرمانەی جوانیتا دۆش داماوم
شەپۆڵ بەدوای شەپۆلا دێ و
دەڕژێتە نێو هەردوو چاوم

بێ دەنگ بۆ خۆم تەواف دەکەم
هەرچەند دەگەمە ئەو عاستەی
تیشکی نیگای تۆ لێم بدا، سوجدە دەبەم
من وا بەستەم، چ بمەوێ و چ نەمەوێ
بارم لەو ئاستانە دەخەم!
بێ خیبیارم
مەستی هەمیشە خومارم!
بەشێکم لە جەستەی شیعر و
ساڵەهایە بریندارم.
عەشق و عەقڵ، دوو مەسئەلەی نەگونجاون
عاشقێکی بێ بڕیارم
من بەگوڵێک بەهارم دێ و
بەکزەبێک چلەی زستانم سەختییە و
هاوینیشم بەتینێ دێ!
کۆتایی گشت ئاهەنگەکان
لەلای تۆوە خەندەبێکە و
لەلای منیش بەشینێ دێ!

***

## ئەندێشەیێک

١٩٩٥/٧/٢٤

هۆ ژنەکە... هەرچەند دەکەم بۆم ڕانایەیت
من ڕوو لەهەر کوێیەک دەکەم، تۆ وا نایەیت
تەماشام کە، لە پێش دەمتا ڕاکشاوم
ڕێگایەکی پوخت و بەرین، بێ ئەلغامم
فەرموو ڕێکە... وا نەزانیت هەرزەکارێکی بێ فامم
دەتۆ هێشووی مەمەکانت شۆڕکەرەوە بۆ ناو دەمم
ئەوسا دەزانیت، من زۆرم یاخود کەمم
یا تامەزۆر و برسییەکی بوردە ژەمم.
لەبەر تاڤگەی سەر تا پێتا دەبێ گوم بم



دەبێ تۆ کرژ و پنر بی
منیش شیعرێکی وەک خۆم بم
کە تۆ ڕژایتە نێو ناخم دەبم بەتاو
گۆم و شەتاو
کەچووینە یەک، تەماشاکە دنیا چەندێ ئاوەدانە؟
هەموو ڕێگە و بانەکانمان ڕوو دەکەنە شاری بانە.

***

## (بۆ .......)

١٩٩٥/٩/٦

خونچە گوڵی لێوەکانت زۆر پاراون
نوخشەی هەنگوینی پاڵفتە دەبارێنن
لە تویێ ئایەتی تەحریمدا
فریشتەی ماچی ترساوم بزێو دەکەن
سەر لە دەرەی پرسیار دەدەن
ئایا دەتوانن لەو خونچە، هەنسکی بۆنێ وەرگرن؟
نەوسم سەرکەوت...
دەرگای پرس و دەرگای ترسی دا بەیەکا
بوو بەگێژەڵووکەی گەرمێن، لەسەر گۆنات خولی خوارد و
سووری ڕوومەتی هەڵگرت و
ڕەشی چاوانی لوول کرد و بۆنی هەناسەی
لەخۆی دا،
لەسەر لێوت بوو بەگێژاو
خونچەگوڵت لە حەژمەتا خۆی کردەوە
ئێستە کە لێوت تەنکە...
چونکە یەکەم سوارچاکی ماچ
یاریی (گۆڵفی) لێ بردەوە!

***

# دوو کورتە شیعر

١٩٩٥/٦/٤

١- پرسیم... گوڵەگەنمی قەڵەو بۆ ملکەچی؟
وتی: سبەی دوای دروێنەم لەگەڵ
دوو سێ بەستە هەواڵ
دەمکەنە نێو فەردە و جەواڵ
بەنێو گەرووی گومرگێکی نهێنیدا
دەمکەنە ناو قەپی «سەدام»
کە تێری خوارد، خۆت دەبینی کوردی بەدبەخت
چیت بەسەردێ برای برام!

٢- لای حووتەکەی تەنشت باخی بەختیاری
کەمێک وەستام
وتم: سەلام،
بیست و چوار سات، ئەم دەمەی تۆ کراوەیە
بۆت تێدەکەن و تێر ناخۆی
کەی دەوەستیت، تا کوێ دەڕۆی؟
وتی: بۆ هەر منی بەدبەخت وا بەدناوم؟
ئەم کوردستانە حووت ڕێژە
زەردە حووت و سەوزە حووت و حووتی بێ ڕەنگ
حووتی هار و نهێنگر و حووتی بێ دەنگ
کاکی شاعیر... تۆش وەک زێوانی کەنیسە
خاچ بکێشە و بدە لەزەنگ.

***

# قەول

١٩٩٢

ئازیزەکەم، خۆ ئێستەش
دەست لەملانی خەیاڵم
هەر چاوەڕێی قومێک ماچم



بۆ نابیسی گڕ و گاڵم؟!
تۆ گۆمێکی ئێجگار مەنگی
منیش چەمی تیژ و خوڕم
تۆ کچێکی نۆ دەمیت و
منیش بەڕۆحم وەک کوڕم
من ئەو شاڵاوە ئاگرەم
هەر لە تۆدا دەکوژێمەوە
ئەو ڕەهێڵەم، هەورە برووسکەم تەقیوە
بەسەر تۆدا دەڕژێمەوە
ئەگەر دەڵێن دەوارێکی داخراوم
بەخوا بەخوا، کە تۆ ببیت بەمیوانم
بۆ پێشوازیت دەکرێمەوە
عومرم دەگاتە هەزار ساڵ
سەری مەرگیش دەنێمەوە
کوا قەولەکەت؟ چاوەڕوانم
دەبا ئیتر نەیلێیمەوە.

***

# حەوت خەونەکە

١٩٩٥/٤/١٤

١- خەونم بینی... سیامەندم، تۆ خەج نەبووی
چیای بڵندی سیپان بووی
من لەزەردی گەردنتەوە هەڵدێرام و
زوو بە وەنی مەمانتەوە گیرسامەوە
کە ڕاچڵەکیم، بەو خەمەوە لەنوێ بۆ خۆم برژامەوە

*

٢- خەونم بینی... تۆ قەفەس بووی منیش مەل بووم
خولیای خۆ ڕاپسکاندن و پەلە پەل بووم
کە ڕاچڵەکیم چرپایەکم تێ ئالابوو
لەجێی هاوسەر من هەر خەونم لە پالا بوو

*

٣- خەونم بینی من سەربان بووم، تۆش کۆتر بووی
نیشتیتەوە و دەشتگمان
ئیتر منیش هاتمە زمان
هاتمە یەک و بووم بەهێلانەی نەرم و نۆڵ
کە ڕاچڵەکیم جێگەکەمم گرتبووە کۆڵ.

*

٤- خەونم بینی... تۆ باخێ بووی منیش دز بووم
بەرکۆشێکم سێو کردەوە، پێیان زانیم
کە ڕاویان نام، وا ڕاچڵەکیم لە جێگەکەم کەوتمە خوارێ
تەماشام کرد، ڕەهێڵەی خۆر بەسەر سەرما دادەبارێ!

*

٥- خەونم بینی... تۆ مەی دێر و من خەیامم
دەستم بۆ جام درێژ کرد و لێوانت خستە سەر زامم
کە ڕاچڵەکیم... جامم خاڵی
نەفسم تولّفێکی بێ کەس بوو بۆیە منیش بووم بەباڵی.

*

٦- خەونم بینی من فەرهاد بووم، شیرین نەبووی
تۆ بێستوون بووی
تێشەیێکیان دایە دەستم، هەڵت کۆڵم
وتیان: ئەمە مەرجی عەشقە!
- من چۆن تێشە لەم شووشە دەم...
ئەشکی خۆمی تیا شەراوە؟
ئەوەی تێشە بدا لە شووشەی عەشقی خۆی
کێ پێی دەڵێ ئەمە پیاوە؟!
ڕانەچڵەکیم و خەونەکەم هەتا ئێستەش
وەک خۆی ماوە.

*

٧- خەونم بینی... کاکە مەم بووم
مەرگەوەڕێک ڕێی پێ گرتم
مستێ لە سووتماکی دڵمی کرد بە بتێک



وتی: فەرموو بیپەرستە، ئەمە زینە
تەماشام کرد چارشێوەکەی چیخی پەترۆی سەر برینە
وتم: زینی خۆم دەناسم، لێم ناگۆڕێ
ئەوی بوێری هاوار کات: کاکە مەمم.
عەشق دەڵێ: دەروێش وەلی...!
وا خۆم هاتم ئەمن شەمم.!

***

## وەڵامی چەند پرسیارێک

١٩٩٤/٨/٢٠

١- وتم بۆ واز بێنم لە مەی
کەپێکی پێ دەکەم لێوان
هەرچی شتە لەم دونیادا، هەمووی دەنێمە ئەولاوە
هەرچی ئاهی پیشخواردوومە هەمووی دەدەم بەدەم باوە
کە پێشەنگی کاروانی ئەو
دەدات لە دەرگای سەری من بەو بەهاوە
لەم دەیجوورە زۆر قووڵەدا، ئازیزەکەم
وەک ترووسکە بەتەنها تۆم لەبەرچاوە!

٢- وتم هەتا ئاهم تیابێ دڵم تەڕە
مەرجیش نییە وا بزانن نەوسم مەلێکی بێ پەڕە!
ئەو جوانییەی
لە کچێکی بەژن ڕێک و سینە پڕا خۆی دەنوێنێ
وەک سەرپەڵە لەبەیاری دەم و وشکدا
گوڵە عاشقانە دەڕوێنێ
بادەیش بەهاری وای بینی شووشەی پڕی خۆی دەشکێنێ
دەپێم بڵێن ئەگەر عەشق وەها نەبێ... ئەگەر دڵیش ڕەها نەبێ
خودی ژیان چۆن دەمێنێ، خودی ژیان بۆ بمێنێ؟!

٣- خەبات نەگاتە ئازادی و
عەشقیش ناگاتە ماچی لێو
شیعر دەبێ پەتیارە بێ

بەستە دەبێ باوکەڕۆ بێ و
منیش ببمە سیامەندێ
لە دارم دا هەڵدێری کێو
یا وەک (وەلی)... ڕۆندک بکەم بەمێخەک و
بیدەم لە گۆپکەی شەکرەسێو
بەڕۆژ چاومی پێ بڕێژم
بەشەو نوێژم بیکات بەشێو!

٤- جا با بمکەن بەتابلۆیەک، سیریالیزمی و کەس نەزانێ کامە ڕەنگمە
کەس نەزانێ کامە دەنگمە
هۆ خەڵکینە... منی دەرویش خۆم دەزانم یارم کێیە
خۆ من ڕەهای ڕێچکەکان نیم
ڕێبوارێکم بارم پێیە
لاڵە پەتەی زمانێک نیم
خۆ من کۆڵێ زارم پێیە...

***

## حەوت وێنە

١٩٩٥/٧/٦

**١- شەڕی ناوخۆ**

دوو گەلەگورگی زۆر برسی... ئەم لەملاوە و ئەو لەولاوە
بەرەو تارمایی ئاسکێکی پێکراو دەڕۆن
کە، کەڵبەیان کەوتە کیرە
بێگومانە یەکتر دەخۆن.

**٢- حیزبایەتی تەسک**

یەکەم... هەموو شتێک هەر بۆ من بێ
دووەم... هەموو شتێک هەر هی خۆمە
تۆ خانۆچکەی بەرهەتاوی،
ئەپارتمانی باڵای منیش سێ نهۆمە.

**٣- ئازادی**



مەلێکە جوان و ئێسک سووک
هەر کە گیرا، دەخرێتە نێو قەفەسەوە،
کێ دەیبینێ؟... مەگەر لەڕێی کەناڵێکی هەوەسەوە.

**٤- کچ**

خونچەییێکە، چاوەڕوانی ئەو ساتە بن دەکرێتەوە
گرەوێکە، چاوەڕوانی ئەو ساتە بن دەبرێتەوە.
پیاڵەییێکە، وەی لەو ساتەی دەگاتە لێو
یاخییەکە، هەر خواخواتبێ، نەداتە کێو

**٥- خامە (قەڵەم)**

شێسوارێکە ملی ڕێگەی خۆی گرتووە
هەر کە گەیشتە دوو ڕێیان، نیگایەکی پیا دەهێنێ
هەر خوا خوات بێ برسیی نەبێت
ئەینا ئەمیش ڕادەمێنێ.

**٦- ماچ**

برووسکەی، لێوە، دەینێرێ بۆ شاری دڵ:
(ئەوا من دێم
جێگایەکم بۆ قۆرخ کەن...
بەشکوو لەوێ وەکوو ئەمانەت دانرێم.)

٧- (....)

سەرەداوی ڕۆحی دوانە، بەیەکەوە پیرۆزەنە!
چرکەییێکە، وەکوو هەورێک دەگرمێنێ و
ئەم ژیانەی پێوە بەنە!

***

## ڕاوی حەڵاڵ

١٩٩٤/٩/١٥

١- وەکوو کۆرپەی بەرمەمکانە
سەرم بنێ بەسینگتەوە
تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە
دوگمەی یەخەت بکەیتەوە... دەم دەکوتم

بەغەریزە گۆی مەمانت دەدۆزمەوە
شەپۆلی بۆنی هەنگڵت
بۆ ناخی ناخ هەڵدەمژم
من تینوومە، بۆچ گوناحە...
دەروونی خۆم پاراو بکەم؟!
بۆچ گوناحە، قەترەی بارانی ڕوانینت
وەکوو سوورمە لەچاو بکەم؟
تۆ سروشتی و من برسیمە،
بۆچ گوناحە لەم دەبەرە...
جێ دەمێکی تیا ڕاو بکەم؟
چەند تاوانە؟ کە من گەیشتمە سەرکانی
بۆ هەر ترسێک مەلی نەفسم لەئاو بکەم؟
٢- خۆزگە دەبووم بەڕشێنە و
بەسەر بەهاری باڵاتا، دادەباریم
لە پەرچەمتا، دەبووم بەتۆزی مرواری
بەنەرمایی گوێچکەتەوە، دوو گووارەی ئاویی دەبووم
لە جۆگەلەی لاملتەوە، چاڵی تینەم پڕ دەکردی
بەهێمنی لەسەر سینەت...
شەپۆلی خۆم بۆ دەبردی
سووک سووک دەچۆڕام بەرەو خوار
بەدزەییێک دەچوومە نێوی مێرغوزار!
با بێ منەت بێ ئەو ساتە
چ داری حەد، چ حەدی دار
خۆ حەڵاڵە گۆشتی شکار!

***

## مەسافە

١٩٩٤/٣/٣

لەسەر مەسافەی تەمەنمان لە تۆ دوورم
وەکوو خەونی بێ سنوورم
ئەستێرەیەکی کزۆڵەم لەناو پۆلێ ئەستێرەدا لەسەر ئاسۆ



تۆ پێشەنگی کاروانیانی،
تۆ کازیوەی چاوانیانی.

***

لەسەر مەسافەی تەمەنمان تۆ لێم دووری و
دەمم گەیشتە ژێر چەنەت
وا کاراسکی پەنجەکانم کەوتنە نێو خەمی پەرچەمت
سەرم خستە سەر باڵینی هەردوو مەمت
لێوم بوو بەنەغمەخوانێ لەسەر پەڕەی گوڵی دەمت

***

لەسەر مەسافەی تەمەنمان، لە تۆ دوورم
کەچی لە ڕۆحما ڕاوەدەکەی
لە شیعرم ڕۆچ دەدەی لە رووت
لە چاوم کل لەچاو دەکەی
خاوەن ماڵیت بەبێ ڕوخسەت
ڕوو لە ناخ و هەناو دەکەی
پرزۆڵەی گیانی وشکەڵم هێدی هێدی لە ئاو دەکەی
دوگمەت بۆ شنەی شەماڵم دەکەیتەوە و
پشت لە تینی هەتاو دەکەی
بەرت نادەم، بەرم نەدەی
ژیان هەر ئەم دوو چرکەیە کاری وەها
نەکەی، نەکەی.

***

## بۆ مامی هەمووان، بۆ کاکی هەمووان

١٩٩٥/١١/٢١

*بۆ هەمووان- بەڕەوتی سوارچاکانی شیعر*

کە شیعرێکم پێشکەش کردن وا مەزانن کەم بەهایە
بەهای ئێوەش وەکوو گەوهەر لەناو دەریای شیعردایە
شاعیر کە دەنگی هەڵبڕی یا هەڵچوونە یا حیکمەتە
دەنگی شاعیر لای عاریفان بەشێک لە فەیزی خودایە

که خەمتانم لە کۆڵا بوو خەمم دەکرد بەباری خەم
ڕۆژێک خەمیش لەگۆڕ نرێ من هەر خەمم پێ ڕەوایە!
ساڵان لێرە لەناو خۆفا شیعرم دەکرد بەسەنگەرم
من هەر حیسابم لەسەر بوو دڵم تەپەی بهاتایە.
ئێوە بڵێسەی شۆڕش و منیش سروودی شۆڕشم
خەڵکی دەبێ ببنە حەکەم-خامە چەکی بێ بەڵایە
بیروباوەڕ و ئامانجێک ئەگەر بۆ کورد نەبێ چییە؟
سەرێک بەم خەمە مەست نەبێ تۆپە و پڕی لە هەوایە
خۆ من شاعیری دەربار نیم من لەدەربار بڵندترم
بار و باوەڕم یەکێکە و من دوو باریم پێوە نایە
ئاڵای هەمووتان هەڵدەکەم چەپکەگوڵی ڕەنگاوڕەنگ بێ
بۆ گەورەیی شەهیدانە. سەرم لە ئاستی چۆکایە
من هاودەردی هەژارانم. ئاوەدانبێ ئەم وارەمان
دەبا ڕێگەی ماندووەکان بکرێت بەسێبەر و سایە
بژی کورد و بژی ئاشتی. یەگرتوو بێ ئەم گەلەمان
شانازیمان ئەو ڕۆژەیە کە ڕەنگەکانمان تەبایە
من بۆ ئاشتی شیعری خۆمم وەکو گیتار هەڵگرتووە
شار و وار و گوند و دوندمان جێژوانی ئەم هەوایە
ئەگەر کورد و کوردایەتی. مەبەستە، بیرە، ئامانجە
با سروودی ئەمجارەمان. هەڵبژێرین لەم نەوایە
مامە، کاکە... منی هەژار هێندە ئەشکم داوەریوە
ئەمجارە گڕ بەربێتەوە. ڕۆندکێکم پێ نەمایە
سۆزی من و نزای شەهید لەسەر لێواری پێچاڵن
دەبا نەڵێم: خۆزگە دایکێ لەم کوردستانە نەزایە!
هۆ گەلەکەم! ستەمدیدەی دەستی ڕۆژگاری بێ ڕۆژمان
تاکەی بەستەی ژیانی تۆ لوورەی دەمی ڕەشەبایە؟!
تۆ خودانی ئەم خاکەیت و تۆ خودانی مامە و کاکەی
ئەم زریانە هەڵنەدەسا. کەمتەرخەمیی تۆ نەبایە!

***



## «بێکەس» شەهیدی وشەی ڕوو سوورە نەمانی نابێ
## دەروونی شیعری ئاگرە و کوورە تا، دێرێ مابێ

١٩٩٣/١٢/١٤

١- لە دەرگام دا... وتیان کێیە؟
وتم شیعرم
وتیان پێناسەی خۆت بڵێ
وتم مەفتوونی «بێکەس»م
شەیدای قژزەردی بەر دەرگای
دیوانەکانی «گۆران»م
خۆڵی کوردستان بەولاوە
خۆڵێ نییە بیکەم بەسورمەی چاوانم
لە کوردستانیش بەولاوە
قوڵغێک نییە بیکەم بەماڵە باوانم
٢- مەستی خەم بووم... دەرگای مێژووم دا بە یەکا
گەڕام بەناو دەیان ساڵا
وەستام لەگەڵ دەیان خاڵا
تا گەیشتمە لاپەڕەیێک بێکەس خۆی و شیعرەکەی بوون
ڕاوەستابوون
بەکارواندا بازی چاوی خۆی دەگێڕا
نیشتنەوەی بازی وەها زۆر حەستەمە
چنگێکی دا لە نێو چاوی «ئەدمۆنس»ەکانی ئەم دەمە
-بیست و حەو ساڵم کرد بەسی- بێکەس وای وت
هێشتا ئێوە هەر نام ناسن
هێشتاکە من پەراوێزم و ئێوە هەر ئێوە سەرباسن
هێشتاکە من هەر کوردەکانی شیمالم
ئێوە هەر ئێوە پیاو خاسن «بێکەس دەڵێ»:
دەعەجانێی ئەم سەدەن و مەڕی ناوپێستی بەرازن
ئا لەو سەردەمەی بەندەیی باو بوو          بۆ پارە و کورسی
جوابی داگیرکەر-ئەی بەسەرچاو بوو          هەرچی ئەپرسی

بێکەس بوو شۆڕش گەیشتە سەری      بەتانە و تەشەر
تفی کردە ڕووی ئاغا و نۆکەری      وەک تیری قەدەر
٣- وتم قەڵەم... دەستی من و داوێنی تۆ هەر ئەمجارە
بۆ ئەم شارە
برووسکەییێک بنووسەوە
ڕق و کڵپە و خاک و نەوە و ئازادی بێ
لەسەر مەزرای شەشی ئەیلوول بیخوێنەوە
ئەگەر وەکوو شیعری بێکەس نەتۆرا بوو
بەسەد ڕجا بیهێنەوە
بلێ ڕۆژگار و ئەم ئەزموونەم بەسەر خۆمدا مەشکێنەوە.
هەموو شیعرێکی بەستەی شۆڕشە      نابڕێتەوە
مەشخەڵی ڕێگای هەوڵ و کۆششە      ناکوژێتەوە
لە ئەیلوولەوە هەر ئەو ڕازەیە      لە خوێنجمانا
کە شیعری بێکەس چەکی تازەیە      ئەکرێ بەشانا.
٤- ها، مانگ چییە؟ ئێجگار کزی
ئارمسترۆنگ، کلی نێو چاوانتی دزی؟
لەناو خەرمانەدا گێلی
بەچرنووکە زەردەکانت گەواڵە هەوری پایزی خەم دەکێڵی
وتی نەخێر، بەدوای شیعرا ئاوارەم و
قەرزی بێکەسم لەلایە
شیعرێک ڕێگام بۆ بکاتەوە
شیعرێک سەلامم باتەوە
شیعرێک جامێکی زۆر خەست بێ
شیعرێکی شێت و بەدمەست بێ
چروچاوی واعیزەکان بەردباران کا
کارێزەکەی وەستا شەریف نەکات بەپۆیلانەی بەهەشت
(یەڵدز) هەر ئەو تەنوورەیە «زەکێ ئالکان»ی سووتانێ
(ڕەی)یش هەر ئەو ئامونەیە پێشەواییێکی خنکانێ
بادەیش دەرمانی دەردێکە ئەمڕۆ شیعریش دەتاسێنێ
ئەگەر دەنگی بێکەس نەبێ



ئەی کێ شیعر، بە خۆر و من، بە ئەستێرە
بە بورجەکان دەناسێنێ؟!
دەقی ڕێزی کەڕوو هێناوی زل پیاوان دەژاکێنێ؟!

*ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە*
*وەختی بەندیی و ئەسارەت، پێ بەتەوق و کۆتەوە*
*من لە زیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم وا تێنەگەی*
*حەپس و تێهەڵدان و زیللەت تۆی لەبیر بردۆتەوە*
*بەو خودایەی بێ شەریک و لامەکان و واحیدە*
*عەشقی تۆ جۆرێ لەدڵما ئاگری کردۆتەوە*
*ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر*
*قەت گڕ و کڵپە و بڵێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە.*
*بێکەس*

٥- بێکەسم بێکەس وام لە هاوارا
وەک هەڵۆ دەرچۆ بێ بەسەر شارا
خەونی گەورەی تۆ گوایا ساوایە
لەمەمکی نەزمی نوێی جیهانیەوە
دڵۆپێک چییە شیری بۆنایە!
خۆمان ناومان نا، کەس ناوی نابات
دەرگای بەختی کورد -لەخۆمان دەدەن- کەس لە تۆ نادات!!!
***

## بەبۆنەی کۆچی دوایی جەنابی پایەدار و شاعیری ناودار و بوزرگدار سەید طاهیری هاشمی

١٩٩١/٧/١٠

ئەوەن دوورم سەدام ناگاتە ئاستانەت
لەسەر سەوزەت بڕێژم ئەشکی خوێنینم
دڵی خۆم کەم بەمەدرەج بۆ کتێبخانەت
لە دێرێکی خەتی خۆشا خۆت ببینم

خـەت و خـەطت وەكـو بەهرەی خـوایی بوو
لە ئـالای شـــــۆرەتی تـۆدا ســـــەدا بـوون
ســـروودی من وەكــو ناڵەی جــودایی بوو
لەتەک گـــریان و شـــیــعـــرمـــدا ئەدا بـوون
ئەون گـــەورەی نـیـــیـــە ڕادەی بڵـــێم وای
وەكـو بەحـری لطافـەت بووی لطیف بووی
نەبی زادەی لە ئـیـــعــجــابی دەسی خــوای
وەكـو حـەبری حـصـیـفی بێ حـەریف بووی
دەســـا قـــوربان ئـەوا ناردم دڵی خـــۆم
وەكـــو گـــۆزە پری شـــینە و كـــە نەشكێ
هەتا دەمـــــرم خـــەتێكی بەر دەسی تۆم
لەڕێی كـــۆچت خـــوا نەمكا بـەئەركێ
لیـــقـــای تۆیە لەگـــەڵ یارت ســـەفـــایە
مـــەقـــامی تۆ ســـەروتر بوو شكۆیە
حـبـیب (طاهیـر) مـوحـیب ذاتی خـوایە
بەشی من باوكـــە ڕۆیە و كـــاكـــە ڕۆیە

***

## مەڕۆن

١٩٩١/١٠/١٠

مەڕۆن مەڕۆن خەڵكە مەڕۆن پایز خوێنە پایز خەمە
پایز وەرزی گەردەلوولە خۆڵە، تەمە
خەڵكە مەڕۆن وا خوێن ئاسۆی ئەم پایزەی سوورهەڵگەڕان
خۆڵە پەتانێی ڕێگەكان ژیلەمۆیە
پۆلی قاز و قولنگانی ئێوارانمان ڕۆڵە ڕۆیە، دایكە ڕۆیە، باوكە ڕۆیە!
خەڵكە مەڕۆن مەڕۆن مەڕۆن هێشتا زووە
خوێنجمانی پایزەیە و خوێن قوڵپ ئەدا و خوێن هەڵچووە
هێشتا زووە مەڕۆنەوە
توخوا جامی بیرچوونەوەی ئەم داخانە وا زوو بەزوو مەخۆنەوە
مەڕۆنەوە.
هۆ ئاگر و خوێن، ئێوە تاكەی بەشی ئێمەن، بۆ ئێمە چین؟



كێ ئەو پەیامەی ناردووە مەخابنە ئێمە بڕین؟!!
خەڵكە مەڕۆن پایز لێڵە. وا زوو گڵكۆی ئازیزانتان جێ مەهێڵن
وەرن لەگەڵ منی ڕەزمی خەم و خوێنا پەڕەی كتێبان بكێڵین
بەختی ڕەشمان لەناو دێڕی سەرە و ژێرا بەردباران كەن
واعیزەكان بەپەندی گوند و شاران كەن
ئەوا دوژمن دەست دادەگرێ
ئەوا لەناو خەم و خوێنا (خاتووزینی)كەشمان دەمرێ
ئەوا دوژمن پەل دەهاوێ، پەڵ دەهاوێ، كەس دەست نەكات بەقەڵغانی پشتی چاوی
ئەوا دوژمن چەپۆكانیە و خوێن نایگرێ
-هل من مزید- داوا ئەكا
وا گۆڕستان یەک لە دوای یەک ئاوا دەكا
ئاخۆ چەندین كاكە مەمی وەكو (عیزەت)
مەرگ یەخەی پێ دەگرێ؟
ئاخۆ چەندین (خاتووزینی تر لە خوێنا ناكام دەبێ)؟
ئاخۆ دڵی چەند (عومەری) ئەم شارەمان چەند (ڕەئوف)ی ئەم شارەمان
بە كوورەی سكڵ و زام دەبێ؟
خەڵكە بڕۆن، خەڵكە هەمووتان خەم بخۆن
خەڵكە وەڵڵاهی حەرامە ئەشكی ئەم سوێیە قەت مەشۆن!

***

## رۆژباش

١٩٩١/١٠/١٣

مامۆستایەک چووە نێو پۆل وتی ڕۆژباش
هەموو وەڵامیان دایەوە دەمی كتێب كرایەوە
لەسەر تەختەكە بۆی نووسین وانەی زمان
بابەت/ ستان
مێژوو/ شەممەی پێش سێ هەزار هەتاهەتا
قوتابیان/ لەیەكەوە تا دكتۆرا
لە ئەلفەوە هەتاكو یێ
ئەوەی بووە و ئەوەش كە دێ!
وتی: ستان دەخەینە نێوی ڕستەوە كێ دەزانێ؟

هورمز وتی: وەکوو کوێستان
ئەحە وتی: وەک دارستان
نەوزاد وتی: وەکوو هەستان
مامۆستا: پێویستە فێری زمان بی
بەر لەئەوەی خاوەن ژان بی
کافی نووسی... ئەمە چییە؟
هەموویان: -ک-
واوی نووسی... ئەمە چییە؟
هەموویان: و
ڕێ-یشی نووسی... ئەمە چییە؟
هەموویان:... ر-
- دەبێ بەچی؟ هەموویان- دەبێ بە-کور-
دالی نووسی... ئەمە چییە؟
هەموو وتیان: -د-
- دەبێ بەچی؟ -دەبێ بە-کورد-
- گەر ستانی بخەینە سەر
هەموو یەک دەنگ: کوردستانە، جێ و زەمانە، مایەی شان وشەرەفمانە
نەوزاد وتی: واتە واری ئەم گەلەیە
جوتیار وتی: شوێن خەرمانی ئەم خەلەیە
هورمز وتی: لەوساکەوە چاوەڕوانی ئەم هەلەیە
- دەوران ئێجگار بەپەلەیە.
قوتابییەکان ڕاتان بلێن-مامۆستا بوو:
ڕامان وایە: کوردستانمان گشت کوردستان یەک ئالایە
لە مادەوە دەست پێ دەکا ئەبەدییە و لەگەڵ خوایە
ئەوسا پێمان دەگوت دایە
ئێستە دەنگمان
ئێستە ڕەنگمان
ئێستە خەومان
ئێستە ڕۆژمان
ئێستە شەومان
کێش و سەرەوای شیعریشمان هەر لەودایە



ئێستە چۆپیمان یەک ڕیزە
سەر چۆپیکێش و گاوانی یەک ئاهەنگن
ئێستە ڕێسمان پەتک نییە وەک هەودایە
قسەمان ڕاست و دوروستە بێ پەنایە
بیرمان وردە
کورد مرۆڤە و کوردستانیش واری کوردە
هۆ نەیاران بۆ نەریت و دابتان نییە؟
کەی تێدەگەن کورد سەپانی بابتان نییە؟

***

## خاتووزین

١٩٩١/١١/١٩

لەگەڵ خورپەی دڵی تودا خاتووزینم
گەردەلوولی خەستی من بوو، هەڵی کرد و، بەرەو ئاسمان بەگژیا چوو
لەگەڵ خورپەی دڵی تۆدا وەهام زانی زەوی ڕۆچوو
ئەوا ئاسمان بەسەر مندا دەڕووخێت و هەناسەم توندە دەرنایە
سوئالی من گەلێک قورسە وەڵام کوانێ؟ لە جواب نایە
بەرەو رووی ذاتی ئەو خوایە!
ئەوە کورد و ئەوەش تۆ خوای، ئەوەش سۆز و برینی من
ئەوەش لۆلۆیە، حەیرانە، ئەوەش ئاو و زەمینی من
بەڵێ دوژمن لە دامێنی هەموو ئەم شارە ئازیزەم گڕی بەردا
خووا چ بکەم خووا گیانم هەمووی سوورە لەناو دەردا
ئەوە چەندجار قوڕی خەستم لەشانم گرت لەبان سەردا
خەبەر ئێجگاری ناخۆشە
خەمی کوردە و لەجامایە، دەڵێن یاشێخ ئەمە بەشتە
ئەوا داخێکی زۆر سەختت
ئەوا ڕۆژێکی زۆر کوێر و ئەوا عومرێکی بێ بەختت
ئەوا هاوڕێت دەکوژرێت و ئەوا ئاگر لەبن نایە
دەبا بۆ خۆم کەمێ بگریم.
کەچی یاران کەچی دۆستان ئەڵێن گریان لە من نایە!
ئەوە سی ساڵە من دەگریم

ئەوە سی ساڵە ئەم خاکە سەروچاوەی گڕ و مەرگە
ئەوە سی ساڵە ئاسمانمان هەزار کاکێشی فرمێسکی لە خوێ داوە
دەیان ساڵە کە خوێنی کورد لە فەرهەنگی ئەم و ئەودا غەریبە، وێڵە، بێ ناوە!
لەگەڵ خورپەی دڵی تۆدا لەسەر گڵکۆت گەلێ گریام
بەسەر گڵکۆی شەهیدانا گەلێ گریام.
بەدڵ کەیلم، بەچاو بیمار، بەسەر وریام
ئەوەن دەگریم ئەوەن گریام
لەگەڵ خورپەی دڵی تۆدا وتم کێیە؟
من نایناسم من نەم دیوە
کە (یادگارم) لەسەر گڵکۆت، بەدی کرد، نوقمی فرمێسکە
من ئەوساتە خاتووزینم لەبەر چاو بوو
من ئەوساتە بەیەکجاری هەنسکی من وەکوو دوو دەفری سوێراو بوو
دە خاتووزین دە کاک عیزەت شەهیدانی نەمردوومان
دروشمێ بن لەسەردابن
دەبا ئێوە سروودێ بن لەبەردا بن
هەتا ئەمڕۆش دەڵێم هەر شاخە باوانمان
دەڵێم سەنگەر دەبێ چڕ بێ
دەڵێم شەرمە، گوناهبارە ئەوی لەم ڕێگە دابڕ بێ
دەڵێم شیعریش هەمان کۆڵی لە کۆڵ ناوە
هەمان پشتێن، لەپشتی خۆی گرێ داوە
کە خورپەی تۆ کە خوێنی گشت شەهیدانمان لەسەرچاوە
دە خاتووزین ئەوە کوردە -بەمەرگی تۆ-
بەرەو بەختی هەزاران بازی هەڵداوە

***

## دوو چیرۆک و «سالومی» و مەلۆتکەیەکی تازە

**چیرۆکی یەکەم:**

هەر لەجێ پێی (موسۆلێنی)
لە شوێن ڕشانەوەی (ڕۆمێل)
قارچکێکی ڕەش دەرپۆقی لەسەر لێوی دەریای سپی
وتیان خاڵە، وتم نەخێر، دوومەڵێکە دەرهاتووە، لە چاوێکی پڕ زۆخ و کوێر



هەروا بۆنە ئەیدا لە خۆی، هەر وا ڕەنگە ئەیکاتە بەر
بۆدڕنی هەر لێ نابڕێ شوێن هەواری سۆزەنەکی لێ ناسڕێ
چڵکی ئاگر ئەخواتەوە گیرفانێکی خاڵی ئەکا دووانی کەی پڕ ئەکاتەوە
پەڕۆیەکی پیسی پێیە بەهەردوو دەست هەر بای ئەدا.
لە دەهۆڵێ نوختە نوختە لە کتێبی نوختە نوختە لە بازاڕی سەودای ئەدا
چاوی مۆڵگەی دیلەشڕە
مەیخانەی کۆڕی جەردەیە
عەورەتێکی بێ پەردەیە
وا بەلێوی شەیتانەوە
بانگ ئەکاتە پاشەڵ پیسان
ئەڵێ دیسان ئادەی دیسان.!!

**چیرۆکی دووەم:**

لەسەر سینگی ئەسمەری (نیل)
دەروێشێکی زۆر نوورانی نوێژی ئەکرد
بۆ پرچی دێزی دارخورما دەستی ئەبرد
لەگەڵ خوادا دەنگی ئەهات
باڕۆژ ئاڵای خۆی هەڵ بکات
ژێرەخەری شێ هێناوی
زنجەکانی لێ هەڵ بخات
نزای گیرا، ڕۆژیش هەڵهات یەک تان و پۆ
دای لە چاوی
داڵە کەرخۆرێکی تەپۆ
لێوی ئاسۆی بۆر کردبوو کەوتە ناو داو
کەوتە ناو عارەقی توونی باخی ئاڵەتی تێک ڕژاو
زۆر نەمابوو بتوێتەوە زۆر نەمابوو سەر و باڵی بەسەر یەکا بشکێتەوە
زۆر نەمابوو زۆڵەکانی بەیەک هێڵنج بێنێتەوە
دەم و چاوی وەرگەڕاوی حەرفەکانیش بێتەوە جێ
کتێبەکان بیوەرێنن کەرووی زەردی ناودەست و پێ
کە، زەماوەند گەرم کرا
شان و ملی (نیلی)ی چاوشین بەهەڵپەڕکێ نەرم کرا

بەیانیش کەوتە هەڵپەڕین لەسەر لێو و لەناو چاوا
بۆ پێشوازی تازە زاوا...
کەچی، هەی داخ کەچی هەی ئاخ
ئێستگە کپ!
(نیل) کش و مات پێشەنگی زاوا بۆ نەهات؟!
پرسیارێکە دێت و دەچێت
بەبێ وەڵام لەچاو ئەرژێت لە لێو ئەرژێت
بەناو کۆڕی زەماوەنی قپ و قڕا تێپەڕ ئەبێت
سەرچۆپیگر دەستی خستە سەری دڵی
دەستی برد بۆ چەکی شانی گورج و سڵی.

**سالۆمی:**

لەسەر باڵی مەلی شوومی ئەو دیو سنوور هەواڵێک هات
وا (سالۆمی) سەری زاوا لەبەر دەمی (هێرودسا)ا
لەگەڵ نەوتا تێکەڵ ئەکات
هەڵی ئەدات
بەریشی چەرموی (موختارا) هەڵی ئەدات.
شایی چۆڵ بوو، قوڕ خەست کرا
جلی زاوای بووکی ناکام لە خوێن درا، پڕ جوێن کرا
بە فەرمانی یاساوڵی زنجی مام تۆم
لەگەڵ فەتوای (ابو الهول)ا شەخڵ کرا
پێچرایەوە و فڕێ درا

**مەلۆتکەی تازە:**

داڵێکی بۆر، ئەهات، ئەچوو، قەلەڕەشێکیش ئەی قڕان
ئافرەتێکی سەر قوڕاوی سەری لە کوژراوێک ئەسو زریکانیو،
مەلۆتکەکەی لە خوێنی باوکی هەڵکێشا
لە بوخچەی بووکی پێچراوە
دەستەسرێکی دەرهانی، وەک قۆناغە پێوەی پێچا!

***

هەواڵێکی نوێی ڕۆژنامە وای ڕاگەیان:
منداڵێکی زرپ و زینوو لەناو مەمکی دایە (نیل)ا



مەلە ئەکا
بۆ ئەوەی زوو ببێ بە کوڕ پەلە ئەکا.

***

## لەپێش دەمی مانگرتووەکاندا

١٩٩١/١٢/٧

ڕۆژتان باش و ڕێزم هەیە
ئەرک نەبێ، ڕێپێوانی شیعرەکانم وا دەروونم جێ دەهێڵێ بەرەو ئێوە
زەنگی ئازاری خەمتانی لەسەر لێوە
هۆ کوڕینە وا کوردستان بوو بەسەنگەر
هۆ کوڕینە ئەوا ئەمڕۆ منی شاعیر
تەنها شیعری ڕەنگی ئێوە دەکەمە بەر
تەنها بۆ بانگی شۆڕشی بێ دەنگیتان، دێمە گوزەر
تەنها بۆ ئازاری ئێوە دێم بەچۆکا کوڕنووش دەبەم
تەنها بەرەزمی ئازارتان...
بیابانی ئازاری خۆم دەشێلم و نووچێ نادەم
هۆ کوڕینە دەبا زەنگی دەنگی ئێوە کلێسەکان بکاتەوە
هۆ کوڕینە دەبا مەسیح لە خاچی خۆی بێتە خوارێ
ئێوە مەسیحی سەردەمن!
ئێوە ئازاری گوڵگۆسان، ئێوە هیوان، ئێوە خەمن.
ئێوە بەژانی برسێتی، کێوی مێژوومان دەژەنن!
هۆ کوڕینە دڵم لەگەڵ دەروونتانە
چاوم وا لەخەونەکانتان
دەستم لەسەر زامی خۆم بوو
کە زامی ئێوە دەبینم، خوێ دەکەمە سەر زامی خۆم
دەبمە هەتوان بۆ زامێکتان
دەبمە دڵۆپێ ئاوی ڕوون بۆ جامێکتان!
خۆم و شیعرم لەناو بەهای باڵاتانا دەبین بە باز
لە داستانی میللەتانا، دەبین بە ڕاز
هۆ کوڕینە وا سەنگەرتان گەرم دەبێ

وا لاوکتان خۆی کرد بەگوێی زەمانێکا داخرابوو
ئاگرێکتان خۆش کردووە وایان زانیبوو خامۆشە
وایان زانی کاوەی ئەمڕۆ بێ چەکوشە و بێ بەرکۆشە!
بێ ئالایە!
وایان زانی کورتەبنە و بێ بالایە!
هۆ کوڕینە ئێوە دەبن بە بەسەتەمان
بەقەڵەم و بەدەفتەرمان
بەئایین و بەڕابەرمان!
هۆ کوڕینە خەمم وەکو خەمەکانتان گران دەبێ
وا لە کوورەی دەروونتانا دڵی منیش هاتۆتە کوڵ
وا لە تۆفی چاوانتانا شیعری منیش دەبێ بەگوڵ
لەناو خەوما ڕاچڵەکینن، لە دەروونما ئەندێشەمن
بەبارسایی سەد کێشەمن!
وەکو گیانی شەهیدانمان لە تەکتانم
وەک داستانی بێ ڕەنگ و بۆی ئەنفالەکان
وەکوو فرمێسکی بێ کسپەی چاوی منالی زنۆق چوو لە تەکتانم
کە سەریشم دەبێ بەپوورەی شیعرێکی بێ باڵ و دەم لە تەکتانم
کە بیریشم جەمام دەبێ بێ ماڵ و ژەم لە تەکتانم
ئەوە چاووم لە ئاگردانی شیعرمدا پشکۆی گەشە
کوێر بم ئێوەیش سەرماتانە
ئەوە گیانم، تینووتانە، لە خۆزگەما بیخۆنەوە
ئەوە فرمێسکی چل ساڵم شلەتینە دەست و پێتانی تێ بنێن!
ئەوە زامی پڕ لە سوێمە، ئەرک نەبێ، خۆڵی ڕێتانی لێ بنێن!
ئەمڕۆ خۆم و هەموو کۆرپە شیعرەکانم
ئەمڕۆ خۆم و هەموو ڕۆڵە شیعرەکانم
لەگەڵ زۆر و کەمتان دەبین
بەقوربانی خۆتان دەبین بەقوربانی خەمتان دەبین!

***



## برسییەکان ڕاپەڕینتان موبارەک بێ
## ئاوارەکان مانگرتنیتان تەدارەک بێ

١٩٩١/١٢/١٠

ئێوە نەمرن با دوژمنانی گەلی کورد سەرەوژێر بن
ئێوە بژین باگۆڕەپانی ئازادی پڕ کەنەوە
سەرکەوتنمان لەپێش چاوە
وەکو نەردی مسۆگەرە و لە دەستانا هەڵدراوە
لە ئەمڕۆوە ژیان لەمەرگ حەرام بکەن
سەنگەری نوێ لەسەر سنووری زام بکەن!
با دوژمنانی گەلی کورد خوێ نەکەنە زامی نوێمان
ئەوا ئەمڕۆ ئەو زامانەی وایان زانی پەڵی پەترۆیان پیاداوون
وەکو چرا هەڵکراوون
وان بەڕێوە زیارەتە
ئێوە ئەمڕۆ شەخص و بیر و باوەڕمانن!
ئێوە ئەمڕۆ ڕابەرمانن سەروەرمانن!
ئێوە بژین با ئازادی بەدیداری موبارەکتان چاو هەڵێنێ
ئێوە نەمرن با نان بەکۆشی هەژاران ئاشنای هەبێ
دەبێ چەمکی مافی مرۆڤ کەمێ نرخ و مەعنای هەبێ
ئێوە بژین شیر و شەکر دەگاتە زاری منالان
ئێوە نەمرن چونکە ئێوە چارەن بۆ حاڵی بێ حالان
ئێوە بژین با سروودی ئازادیخوا بگاتە خوا
ئێوە نەمرن با شیعری من دەستەئەژنۆ دانەنیشێ
گۆرانیمان بدا لە باڵ
ئێوە بژین با لەجەژن ملوانکەیەکی دەنک ئاڵ
بکەینەوە گەردنی ساڵ
ئێوە نەمرن یا ڕووی گەلان سپی دەبێ،
یا مۆری تف دەنێین بەڕووی ئەم سەدەدا،
سەر شۆڕ بکا
دەفتەرەکەی مافی مرۆڤ بەگۆڕ بکا!

ئێوە بژین وا کورد خاکی خۆی دەپێوێ
ئێوە نەمرن شیعر ڕەوتی لێ دەشێوێ
ئێوە بژین با ئاڵامان هەر باڵا بێ وەک دوند و کێو
ئێوە نەمرن با بەستەمان نەبێ بەبار بۆ زار و لێو
برسیتانە؟
ئەوە گیانم بیکەن بەژەم
ترسم هەیە لەبێ دەنگی
ئەوە شیعرم بیکەن بەدەم
دەبا سەرما خەجاڵەت بێ
ئەوە عومرم لەبەری کەن!
لە ئاستانەی پیرۆزتانا ئەوەی نەزرێ نەکا بۆتان
لە ئاستانەی کوردایەتی هەر بەلەعنەتێ دەری کەن!
ئێوە بژین، با سۆزی شوان...
لە زاخۆوە پردی دەلالێ دروست کا
(خانی) بێنێ بۆ خاک و خۆڵ
(سالم) بەرێ بۆ خانەقین
مژدە بدا بەکەرکووکی ئاگر و خوێن
ئێوە دەژین، ئێوە دەژین

***

## ئێرە چی بوو؟؟

١٩٩١/٢/١٩

ئێرە چی بوو؟ چ باسێکی ڕەش و سامناک؟
ئا لێرەدا خۆی مت دابوو؟
ئێرە چی بوو؟ خوێرێژگە بوو لەسەر برین هەڵخرابوو!
ئێرە چی بوو؟ کێڵگەی فرمێسک، ژاژ و قەڕەفی کێبڵ بوو!
کوورەی کەلەبچەی قەف قەف و شولگەی فەلاقەی ئەستوور و شیپی تەڕ بوو
ئێرە چی بوو؟ کولانەسەی نهێنگر و دێڵەبەبای پیس و گەڕ بوو!
ئا لێرەدا وەحدە و حزبیەت دوو قەحپەی لەش بەسۆزەنەک کێلراو بوو!
ئا لێرەدا لەناو زیرابی ناو دەمی ئەمنەکانا



هەرچی گەندوگوی مێژووە جهێلرابوو!
ئا لێرەدا گیانی کوڕە جەربەزەکانی ئەم گەلە
جێگە سەمای چەقۆ و قەمچی و شووڵەدار بوو!
ئا لێرەدا سەمفۆنیای داستانی خەم. نیوەشەوان
سۆزی سەختی جگەربڕی ژێر شاڵاوی قەپ و تەعزیب و ئازار بوو
لە بەهاری ئازادیدا لافاوێ هات، لافاو ڕقی پیرۆزمان بوو
پێشەنگی جەژنی هەڵاڵە و نەورۆزمان بوو
دوژمنانی ئەم گەلەمان وەک ئاوماڵک لە ژێر پێدا کوترانەوە
حەزیان ئەکرد بۆ ناو سکی دایکی خۆیانیان بەرنەوە، نەبرانەوە
ئا لێرەدا نێرگز ڕووا گوڵاڵەسوورە هاتە بان
دایکی دوو گیانی ئاواتمان کەوتە سەر ژان
قوتابخانەی خانزادمان نۆبەرە بوو
خوا شایەتی ئەو سەرەبوو کە ئێمەی کورد ئازادیخوازین
ئاشتیخوازین ژیان مافی ڕەوامانە
دیکتاتۆرییەت ڕیسوایە قێزەوونە،
گۆمە زووخاوی بێ بنە
ڕۆڵی نەما، ملی ورد بێ
با ئازادی باخی هیوای گەلی کورد بێ!

***

## برووسکەی ئەندێشەم بۆ کاک ئەنوەری کۆچکردوو

کەنیسە بوو، قداس ئایەتی ماتەمی دەخوێندەوە
دەستم لە ملی خاچێ کرد
حەزم لە چێژی ماچێ کرد
لە گەردنی مەسیحەوە بڕژێتە سەر لێوی وشکم
ئۆقرەم نەگرت خۆم دەمم برد بۆ گەردنی بەلارەوە!
هاوارم کرد ئەی خەرمانەی دەوری سەری، لە حەزم خۆت مەشارەوە!
وا لێو دێنم لێوی کوردێکی تامەزرۆ بۆ گەردنی شەهیدانی
کە بەماچێک دابمرکێ کەفوکوڵی تا ئێسقانی
کە لێوی وشکم پاراو بوو چاوی سوپاسم هەڵبڕی

بینیم وێنەی کاک ئەنوەرە ماچی دەکەم!
خاچ و مەسیح و ئەندێشەم هەمووی ئەوە باسی ئەکەم!
من لە دڵتا کاکە مەسیح خەمێکم دی زۆر بەسوێ بوو
منیش بووم بەهاوخەمی تۆ خەمی منیش هەر لەوێ بوو
خەمی من خوێنی جەرگم بوو
کاکە مەسیح برینی ناو برینی نوێ خەمی تۆیە
برام مەسیح خەمم لەگەڵ خەمی تۆدا هاتەوە کوڵ
کوڵی خەمت وەکو کوڵی خەمەکانم
لە ناخمدا بوون بەیەک و تاو دەسێنن
هەتا دەمرم ئەم دوو خەمە هەر دەمێنن هەر دەمێنن
***

## مەشخەڵانی نوێ

کوشتت، بڕیت، وێرانت کرد شار و دێمان
ئەمەک سوێر بوو، تۆ زەهریشت کردە خوێمان
چەواشە بووین، لێت شێوانین ئەمڕۆ و دوێمان
نەت ئەزانی چۆن هەڵپەکەی تا نەیهێڵی شوێن و ڕێمان
کوشتت، بڕیت، بۆ ئاگری برا کوژی هەمووت کردین بەزەنگەدار
لادێت نەهێشت هەمووت پێچاینە گۆڕی شار
هەموو دونیات لێ تەنین و سایقەیشت نەهێشتەوە
هەڵی بدەین وەکو دەوار
چاوت سوور بوو ڕاوت ئەکرد ئاسکی ئێمەت کرد بەشکار!
دانەکەوتیت سەگی ئەنفالت تێ بەرداین
نەورۆزت کرد بەتاعون و پەتای بەهار
بزەت لەسەر لێوی ساوا دەسووتان و
نەکەس بۆنی کیمیاوی کرد نەکەس بیستی داد و هاوار!
خۆت چەپەڵ و نیاز چەپەڵیت وەهات دەویست
کوردیش ببێ بەو گەلانەی هەر ناون و بێ ئاسەوار!
ئێمە لەشمان بێ پێخەف بوو ئێمە سەرمان بێ سەرین بوو
کاسە پڕ بوو، ئێمە هەڵسائین ڕاپەڕین بوو



قەڵای زۆر و زۆردارێمان تەقانەوە
ئەو دەستانەی لار پێچرابوون بەخواستی گەل جارێکی تر گیرانەوە!
بوون بەمشت و لەناو دەمی زۆردارانی بەردانەوە
زۆردار ئێمە نهێنیتمان والا کرد و دەرکەوتی چۆن شەیتانێکی
چۆن دوڕندە و حەیوانێکی
لەسەر گۆڕی جەنگیزخان و هۆلاکۆ تۆ
لەسەر گۆڕی موسولینی و هیتلەریش تۆ جانەوەرە زێوانێکی
لەنێوانی کورد و مافی ئازادیا تۆ چون بەشە نێوانێکی
ئێمە یەک بووین کە سینگمان نا بەئاگری خەشی تۆوە
ئێمە هەموومان دەنگێ بووین شاباشمان کرد
مۆری خەیانەتمان دەنا بەڕووی زەرد و ڕەشی تۆوە
ڕاپەڕین بوو... بۆ ستەمدیدە ڕاپەڕی بوو
لافاوێکی ڕامالێن بوو پێچ و پەنای تۆی دڕی بوو
ئیتر دەستمان بەدەستی تۆ چەپەڵ ناکەین
ئەوا ڕۆژگار سەلماندوویە لەگەڵ تۆدا قەت هەڵناکەین!
هەرگیز لەگەڵ تۆ هەڵناکەین
ئەوەتای هەیت تۆ ئاغایت و من بچووکم
تۆ هەر نەوتم هەڵدەلووشی و منیش هەر لێوە وشکەکەی
شارە گەرمەکەی کەرکووکم!
لەگەڵ تۆدا قەت هەڵناکەین...
دەستی پاکمان بەدەستی تۆ چەپەڵ ناکەین
سەرکەوتین و سەرکەوتووین!
گوم ناوێ بووین ئێمە ئەمڕۆ دەرکەوتووین
هەر چەند تۆ سەگی حەو ڕۆحیت بەڵام ئێمەش نەخەوتووین
ئاگری نەورۆزمان خۆش دەکەین
سەد ماشاللە مەشخەڵانە!
ئازادیخوازان سەربەرزن خائین ڕووی لە بێشەڵانە!
بەزمی خەندە لەسەر لێوی ئاڵ و تەڕە
کەژان سەوزن پێ دەشت هەمووی کێڵگەی فەڕە
ماچ وەک پەپوولە دێ و دەچێ لەم گوڵەوە بۆ ئەو گوڵە

لەسەر درەختی عەشقێنی ئەم دڵ هێلانەی ئەو دڵە
بەمیوانی ئەو دڵەت بم کچە کوردە نازدارەکە خەندە گوڵی بەهارەکە
بەمیوانی ئەو سەرەت بم کچە کوردە بەجەرگەکە
بەقوربانی فرمێسکت بم هۆ ئاوارە بێ بەرگەکە!
بەقوربانی یادت دەبم هۆ گەرمیانیی بێ ناو و شوێن!
بەقوربانی خەمت دەبم هۆ هەڵەبجەی ئاگر و خوێن!
هۆ پێشمەرگە نەبەزەکە قوربانی خۆت و سەنگەرت
تێکۆشەرە بەبڕواکە قوربانی خۆت و ڕابەرت!
هۆ شەهیدە نەمرەکان قوربانی بەرگی سوورتان بم
هەرچەند ئێوە بەڕێ دوورن قوربانی ڕێگەی دوورتان بم!
ئێمە یەکین خەمی گشتمان کوردستانە
چاومان لێیە بەهەشتێکی ئاوەدانە
خاکی عەشق و گیان بەخشینە، ئاوەدان بێ
ئەگەر هەتا مردنیشم کۆڵی ئەوم لەسەر شان بێ!

***

## شێ سوارەکان

نۆ شێ سواری بێ دەنگ و ڕەنگ
نۆ شێ سواری ئێجگار چەلەنگ
نۆ عومری کورت سەفەر درێژ
نۆ شێ سواری بەهاری خەم
هاوینی ڕەش، پاییزی سوور، زستانی شەختە و ڕەشەبا
کێیە بۆنی ئەم تاوانە، بەرەو هەموو دونیا دەبا ؟!
کاکە حەمەی جگەرسووتاو مامی کەژاڵ
چاوەڕێ کەی سوسەی هەواڵ
نۆ شێ سواری ڕێ ون کردوو
نۆ شێ سواری هەواڵ مردوو
نۆ مرۆڤی سەدەی بیستەم، سەدەی زوڵم و سەدەی ستەم
نۆ لاوچاکی چاک هەڵکراو
نۆ کورد نۆ کوڕە کورد، نۆ هەواری بێ شوێن هەوار



نۆ درەختی زۆر کەم بەهار
نۆ شایەتی تاوانی ڕەش
نۆ تاوانی فەرمانڕەوا فاشییەکان، هێز بەدەستە فاشییەکان
خوێنرێژەکان، خوێنمژەکان، ژنکوژەکان، پیاو کوژەکان
نۆ ئارامی ژێر باری گڵ، نۆ دار بەڕووی ڕەگ ڕاکێشراو
نۆ خەونی پاکی دابێژراو بەگوللەی خەش، خەشی ڕەگەزپەرستەکان
گورگی مەڵبەندی کارەسات، وەرزی خوێن و خەم و نەهات
نۆ فرمێسکی گەلی کورد و نۆ هەناسەی سەردی وڵات
نۆ کوڕ، نۆ پیاو، نۆ شۆڕشگێڕ بێ خەوش و خار
نۆ شەهیدی تازە مەزار
نۆ میوانی سەیوانی سوور، نۆ خەمی نالی و شارەزوور
نۆ تەکبیری –کورد گەورەیە– کورد نامرێ!
سەعاتی سفری تۆڵەمان دوا ناخرێ!
ئەوا پەیکی ئازادیمان بەڕێوەیە
ئێستە ئێمە چاومان لێیە ڕێی سوارەکان لەکوێوەیە
شەهیدەکان!
چەپۆکانی ئەسپی شێتان لەگەرداوا ئەم سەفەرە دەباتە سەر
ئەوسا کوردیش وەکو گەلان
خودا دەکا بەشایەت و تاجی ڕەواج دەکاتە سەر
هەموو کوردێ سروودی ئەم کوشتنەتان دەکاتە بەر
ئەمڕۆ کە خۆر سەری کێشا دوای کازیوە
تیشکی کەوتە سەر بەرانان
منیش باڵی چاوی خۆم دا
پێم وت سێ چوار هەزار ساڵە، بەم خاکەدا دێیت و دەچیت
لەگەڵ ئێمەی ستەمدیدە بەشەو دەمریت بەڕۆژ دەژیت
تۆ دەزانیت شەهیدانمان ئێستا لە کوێن
ئەمڕۆ لە پێش ئاوابوونتا سڵاوی منیان بۆ بەرە
پێیان بڵێ سوێند بەو خوێنەی ئەوان ڕشتیان
هێشتا ڕێگە هەر خەتەرە.
وتی بۆنی دزەکانتانم گرتووە

وتی بۆنی درۆی ئێوەم لێ نیشتووە
وتی ئاڵای شەرمەزاریم هەڵکردووە
ئەوان ڕاپۆرتیان دا بەخوا، لەناو کوردا تەباییە
ئەوان وتیان کوردایەتی تەنها بەری برایییە
ئەوان وتیان خوێنی ئێمە قیبلەی کوردە
ئەوان وتیان کوردستانیش قەڵای گەورە و باخچەی وردە
ئەوان وتیان کورد بێ خەمە
وتیان بەخوا ئاسۆ هەمووی ڕوون و پاکە بێ تەپوتۆز و بێ تەمە
ئەوان وتیان خوێنی ئێمە فیرۆ نەبوو سەرمان بەرزە!
بەخوایان وت لە پارەوە ساڵی کوردستان پێنج وەرزە!
بەهار، هاوین، پایز، زستان وەرزی پێنجەم ئازادییە
هەموو چەمە شێەکانی نیشتمانمان دەم پڕ لە ئاو لەسەرخۆنە
ئەوا کوردیش بیروبڕوای تەبایی ئەنجام و هۆنە
ئادەی بڵێ ئێوە ڕازین شەهیدانتان لێ هان بدەم!
تامی کردەی نارەواتان لە ڕوومەتی ئاسمان بدەم
بڵێم هۆ هۆ عەلی بەگ و هۆ کاک یاسین
وا خەریکە ساڵە ڕۆژتان دەکەن بەڕۆژی گەرمەشین
شەهیدەکان! زیندووەکان دڵیان بەردە هانام بۆ ئێوە هێناوە
بەخوا بڵێن: لەعنەت بکا لەو کەسانەی خەمیان لە ئاڵاتان داوە!

***

## برووسکەیەکی ڕەوا

١٩٩٢/١/١٢

*ئەم هۆنراوەیە لە چلەی م. فەرەیدوون عەلی ئەمین دا وەک بروسکە خوێنراوەتەوە*

بە چ سەنگێ پیاو دەکێشن؟
بە چ دەنگێ پیاو بانگ دەکەن؟
بە چ مافێک گەوج و گەمژە، پیاوی مەزن بن ئاو دەخەن؟
کاک فەرەیدوون من بەبڕوای کوردایەتی تۆ دەکێشم
بەهەنسکی فەرهەنگی خەم
وا لە نوێوە ئەشکی گەرمت بۆ دەڕێژم



من بەسۆزی پاڵەوانی دواڕۆژی کورد تۆ بانگ دەکەم
بۆ کۆڵ و باری ئەم کۆچەت لە دەروونما جێ ڕادەخەم
من دەمێکە ئەو گەمژانە ڕسوا دەکەم
لەپشتەوە پەڵی وشەی بێ هێز و پێز
دەهاوێژن بۆ هەر مەزن
ئێوە شاسواری ڕێیەکن
تەنها لەبەر ئاڵای کوردا و
هەر بۆ بانگی ڕەوای مردن دادەبەزن!

***

## سروودی پێشمەرگە

١٩٩٢/١/١٤

ئەی سروودی ئەو کەژانەی وا لە ئاسمان سەر دەدەن
ئەو کەسانەی دێنە ڕێگات سەر لەتاش و بەرد دەدەن
تۆ نیگای ئاسۆی بڵندی و دێیت بەرەو هەوراز و شیو
چۆن لە تیشکی تۆ دەئاڵێت تەمتومانی ڕێی بەزیو؟
ناوی پێشمەرگەت لە خۆت نا ، ناوت چەند خۆشە برام
من لە خۆشیی ناوی تۆ بوو وەک چرایێک هەڵکرام
ئەو چەکەی تۆ خامەمان بوو بۆ نیگاری ڕۆژی ڕوون
شایەتە ئەم خاک و خەڵکە بێکەس و داماو نەبوون
هەڵمەتی تۆمان بەدی کرد کەس نەکەوتە ناو هەرەس
کەوتە ژێر پێی ئەسپی تۆڵە دوژمنی خوێڕی و تەرەس
بۆ موفەڕک نانە وردەی پشتی تۆمان ماچ ئەکرد
هەریەکە و بۆ داخی دوژمن ڕووی لە داری خاچ ئەکرد
ئەو شەهیدانەش کە خاکیان کرد بەمەزرای خوێنی سوور
وان لەناو ناخی دەروونا بوون بە بڕوای بێ سنوور
من بەقوربانی خەمت بم تۆ خەمت زۆر گەورەیە
وا دڵم بانگت دەکات و پێت دەڵێ جێت لەورەیە

***

## سروودی ئاڵا

١٩٩٢/١/١٤

من کە ئاڵای تۆ دەبینم ئەی گەلی کوردی دلێر
خۆم بەشاخا هەڵدەشاخێم بۆ نەبەردیش دەبمە شێر
با لەسەر لوتکەی چیاکان بیشەکێنی بای شەماڵ
من لە خۆشی ئەو نیگایەی دەچمە سەر باڵی خەیاڵ
ئەی گەلی کوردی ستەم چێژ وا ڕقت پڕ کاسەیە
بەژنی ئاڵات بۆ هەبوونت شایەت و پێناسەیە
ئەو کەسەی ویستی کە ئاڵات هەر لەناو خەونا بژی
شۆڕشی تۆ زەبری تۆڵە و ڕاپەڕینی پێ مژی
با دڵی دوژمن لەداخا شەق بەرێ ئاڵات هەیە
ئەی قەد و باڵای هیواکەم ئێستە تۆ کاڵات هەیە
بەژنی ئاڵا ، ڕەنگی ئاڵا ، شیعر و تابلۆی سەردەمن
مان و بوونی تۆیە... ئاڵا ، نوێژی قووڵی سەرجەمن
تۆ پەیامی سەربەخۆییت... ئەمڕۆ زیاتر هەڵکەوە
ئەو دروشمەی هەر دەمێنی و وای بەزاری خەڵکەوە!

***

## نەورۆز و خەبات

١٩٩٢/٢/٢٣

هۆ ستەمدیدە گەلی کورد ، جەژنی نەورۆزت بەهات
ئاگری نەورۆز و کڵپەی، مەشخەڵن بۆ ڕێی خەبات
تۆ و خەبات و هەوڵ و کۆشش قەت لەیەک جیا نابنەوە
میللەتانی سەر زەمینیش، بەم خەمە دەتناسنەوە
تۆ لە کورەی مامە کاوە، پەنگری هەردەم گەشی
بۆ لە مافی زۆر ڕەوای خۆت تاکو ئەمڕۆش بێ بەشی
ئەی ستەمدیدە... گەلی کورد... ڕێگە هەر ڕێی کاوەیە
ڕابەری ئاڵاو دروشمت هەر هەمان سەرچاوەیە
بەشکراویت، بەشخوراویت، پێ لەگشت، مافت دەنێن
چوونە ناخت وەک جنۆکە و وا لە هۆشیشتا دەزێن



ڕاپەڕینێک، سا درەنگە، با هەموومان یەک گرین
گەردەلوولی ئێش و ئازار، ڕوو بکاتە یەک برین
با برینمان یەک برین بێ و با خەمیشمان هەر خەمێک
با سروودمان یەک سروود بێ وەک تیۆری سەردەمێک
خاکی کوردستانە خەممان، ناوی کوردستان ژەمە
کوردستانە موڵکی بابمان خاتووزینمان بۆ مەمە
قیبلەمان گۆڕی شەهیدە و جۆگەیەکمان زەمزەمە
داد و دوژمن با بزانن هەر (وەلی) یاری شەمە
هەر وەلی یاری شەمە
هەر وەلی یاری شەمە

***

## ڕێبوار و تۆڵە

١٩٩٢/٣/٢٥

ئێوارە وەختە ڕێبوار گیان، بۆ کوێ دەچیت
بەرەو کام لا ، کام پیاو خراپ، ڕێگە دەبڕیت؟
تۆڵە حەقی ڕەوای خۆتە. یەخەی کام جانەوەر ئەگریت؟
ڕێبوار توخوا ئێوارەیە و شار خامۆشە ئاگر مەگرە بەدەستەوە
ڕێبوار توخوا لە دەروونتا گڕی تۆڵە ببەستەوە
دوژمنەکەت هەر دوژمنی برا کوژی ئێمە نییە
دوژمنەکەت دوژمنی گشت گەلی کوردە
ڕێبوار ئەوا چەمی تۆڵە لرفە دەکات، بوار نادات و بێ پردە
ئێوارەیە دەخیلت بم مۆتەکەی مەرگ دێتە خوارێ
ئێوارەیە باران سوورە، بەفر ڕەشە ، خۆڵ ئەبارێ
دوژمنەکەت بۆ ئەجەلە ، بەرەڵایە ، -دەبوکاری وا نەبوایە-
مەرگی تۆیشی وەکو خوێنی سەرداری جوان لەچاوایە
ڕێبوار مەڕۆ مەڕۆ ڕێبوار
پێدەشت مەبڕە بەرەو بنار
هەوراز مەرگە و دوژمن سەگێکی هەوشارە
تۆش وەک تۆڵەی حەق و ڕەوا مەچۆرە ڕووی

خۆ خاوەن حەق هەر تۆ نەبووی
کورد و شۆڕش، باوەڕەکەت، هەر هەموویان
خاوەن خوێن بوون حەقیان دەویست
تەپەی دڵی ڕاچڵەکیوی تۆیان دەبیست.
هۆ ڕێبواری ڕێگەی مردن
تۆ مەرهەمی شیفا بەخشی ئەو زامە بووی...
مەرگی سەردار کردیە دڵمان
بۆ ئەو زامەت کولانەوە؟!
بۆ ئەندێشەی تۆڵەی ڕەوات لەناو خوێنا تلانەوە؟!
هۆ خەڵکینە بانگی دڵی شێخ عوسمانە
بانگی گەلی کوردستانە
تاکە پێڵاوێکی ڕێبوار نرخی هەموو دوژمنانە!
کاکە ڕێبوار ڕێبواری ڕێی خەم و تۆڵە
نەک هەر لە ماڵی باوکتا، لەم خاکەشدا جێگەت چۆڵە
مامە حەسیب بانگت دەکا...
ڕێبوار مەڕۆ جێگەت چۆڵە
ڕێبوار مەڕۆ شەهیدی ڕێی خەم و تۆڵە.

***

## نەورۆز

١٩٩٢/٤/١

نەورۆز هاتەوە وەرزی تین و تاو
نسرمی گیانمان پڕ بوو لە هەتاو
چەپکە نێرگزمان کرد بە بەرۆکا
بۆ خوای ئازادی هاتین بەچۆکا
ئەسپی (ڕاپەڕین) چەپۆکانی بوو
شاخ و دەشت و دەر خرۆشانی بوو
سواران تاو دەبەن پێشبڕکێ گەرمە
تازە کە سوار بووین دابەزین شەرمە
سەری شار شاری گڕ و هەتاو بوو
کە دەیان ساڵ بوو ناوی دزرابوو



سوێیی کورگەل بوو دەیهێننەوە
کەرکووک دزراوە دەیسێننەوە
خوێن جمانی گەل خۆی خوێن جمان بوو
خەنجەری دەست و چەکی سەرشان بوو
کە خۆری نەورۆز لە ئاسۆی سوورا
ڕووی کردە کەرکووک بەشارەزوورا
لەسەر مەرقەدی بابە گوڕگوڕمان
نەزرمان دەکرد بۆ کچ و کوڕمان
تەپڵی ئازادی لە گڕ و نەوتا
شایی ساز دەکرد لە گوێی سرەوتا
دوژمن وەک سەگی دزی نێو دەوار
کلکی شۆڕ کرد و هەڵات بەرەو خوار
بەڵام ئەفسوسە، داخە و هەزار داخ
چرۆی خۆشیمان نەکەوتە ناو باخ
شالاوی دوژمن بەچەکی نوێوە
کەس نەیدەزانی چۆن هات، لە کوێوە
سەرلەنوێ جارچی خۆی کرد بەشارا
دیسان وا کەرکووک ئەکرێ بەدارا
ڕۆژمان ئەمڕۆیە کورگەل وەرنەوە
با هەنگاو بفرێ هێرش بەرنەوە
با دوژمن باری لە کەیوان نەخات
کەرکووکی دڵمان لە لێدان نەخات
لەناو سوارانا (علي) هەڵکەوتوو
وەکو ئەستێرەی هەرگیز نەخەوتوو
ئاسمانی شینی هێنایە زەوی
لێوی پاراو بوو بەئاوی شەوی
بوو بەبرووسکەی هەڵمەت و هەنگاو
هەردە بەهەردی گەرمیان و سەنگاو
لە سیانزە بەدەر نەچووینە دەرێ
ئەی بۆ وەیشوومە هەتاومان بەرێ؟

کورگەل دەخیلە (علي) دەخیلە
خۆ دەمی دونیا چۆتە کلیلە
ئادەی ئەم جارەش هەڵمەت لە نوێوە
ئەو کەسە مەردە، دەمرێ بەپێوە!
(چیمەن) شەڕگەیە کورگەل هەرایە
دەنگی ئەجەل دێ وەک لوورەی بایە
بۆ شکاندنی ئەم ڕێ و مەردنە
چەک و سەنگەر و خۆڕاگرتنە
دەخیلە (علي) دەخیلە کورگەل
لەبەر بای ئەجەل لەدەست مەدەن هەل
ئەم گەردەلوولە وەیشوومەی ڕەشە
بەرپێ تاریکە، لیتەیە، هەشە
وا مەرگ ئەبارێ، خوا مەرگ ئەبارێ
زریان ڕووی کردە ناو گەرووی شارێ
عەلی شەهید بوو شەهید بوون کورگەل!
ئەبەد خرایە سەرپشتی ئەزەل!
بۆ بەختی کوردە ئەم کارەساتە
ڕێگەمان هەمووی هات و نەهاتە
خوێنی شەهیدان بەرگی بەهارە
بووکی ئازادی بێ دار و یارە
هەر بەختی کوردە وا خوێن جمانێ
تەنگە نەفەس بێ و کوڵی خۆی دانێ
هۆ کاکە علی، کورگەل، شەهیدان
هێژا و قەهرەمان، چەلەنگ، عەگیدان
وا ئەسپەشێکەی ڕاپەڕینی سوور
لە نوێوە بوو بەکڵپەی ناو تەنوور
چەک لەدەستایە و سەنگەریش ماوە
مەیدان چۆڵ نەبێ ئەسپیش بەتاوە
قودسی کوردستان شاری کەرکوکە!
باوەگورگورمان زۆر ئێسک سووکە



پیری ڕوو بەنوور، دەروونی تەنوور
شەوقی دەگاتە دەشتی شارەزوور
ڕێ بۆ ئاوارە ڕوون ئەکاتەوە
با دایکی ژیان خەم نەخاتەوە
خوێنی شەهیدان بەرگی باخانە!
باڵای شەهیدان باڵای شاخانە!
تەنها ئازادی هاوکێشی خوێنە!
هۆ گیانی عەلی ئەم موژدە بێنە!

***

*دڵم خۆشە کوێرەدێ نیم، من شارێکی ئاوەدانم. دەنگم ئەگاتە گشت شارێ*
*وەکو سروودی ئازادی، دەفڕم بۆ سەر هەموو زارێ.*

## چیمەن و خەم و خوێن

*پێشکەشە بەجوانەمەرگانی کاروانی خەم و خوێن، کاروانی ڕێی سلێمانی و کەرکووک،*
*پێشکەشە بە(حەمە عەلی)*

کەرکووک، چیمەن، گەرووی دەربەن بازبیان و چەمی تەیناڵ و تاسلۆجە،
جێ نەزەرگەی شەهیدانن
ڕۆژگار ڕۆژانی ئازادیی و پێکدادان بوو
دایکی دوو گیانی بەختی کورد، دیسانەوە لەسەر ژان بوو
پیری پیران، خوا ئامانە، هەرچی شێخ و مەشایخە چاوتان لێ بێ
با ئەم دایکە کلۆڵەمان ئەمجارەیان سەلامەت بێ
با بەختی خاس بخاتەوە
با دەرگای خێر لەسەر خۆی و لەسەر ئێمەش بکاتەوە
پیر و پیاوچاک دەخیلتانین
حەفتا ساڵە ئەم دایکەمان ژان ئەیگرێ و کەچی ئەنجام لەبارچوونە!
یا ژانی پێ دەخۆنەوە و دێتە مردن یا خەبەرێکی بێ نوونە!
ئەم دایکەمان هەرچەند دەکەوێتە سەر ژان، بێ مامانە
ئەم دایکەمان کە کۆڵوانە لە کۆڵ دەکا و بەرکۆشی خەم
دەچنێتەوە و ڕوو دەکاتە دەرگای مێژوو بێ باوانە!

ئەم دایکەمان شاژنێکە و وەکوو مریەم بێ تاوانە!
ئەو بەختی بوو مەسیحی بوو مەسیحیش بوو بەپێغەمبەر
حەفتا ساڵە ئەم دایکەمان دەکەوێتە سەر ژانی خۆی
هەزار مالوم ڕێی پێ دەگرن
تۆ ئەم سکەت لە کوێ هێنا خاکت بەسەر؟!
ناشێ بڵێی کوڕی خوایە، لە کاوەوە تۆ بێ بەری!
تۆ شارێکی داخراو و بێ گوزەری!
کەرکووک، چیمەن، تەق تەق، پردێ
هەموو شاخێ هەموو هەردێ
هیچیان نەبوون بەمامانی
هەموو بوون بەجێ کوشتنی پێچ و ژانی.
بەم باسەوە کوڕە کوردێکی هەڵکەوتوو: حەمە عەلی
چەکی لە شانی توند کرد و هاواری کرد: ئادەی کوڕگەل!
بەناو گەرووی ڕەشەبادا، خۆتان لوول دەن
وەک گەردەلوول
چیمەن بگرنە باوەش و پێ داکوتن
دایکی ژانگرتووی بەختی کورد نەزری باوەگوڕگوڕ دەکا!
گیانی لە مەترسیدایە، کەچی هەر داوای کوڕ دەکا!
کوڕگەل ئادەی. ئادەی کوڕگەل ئەمجارەیان ژانی سەختە
ئەم دایکەمان حەفتا ساڵە ژان دەیگرێ و هەر بێ بەختە
ئەمجارەیان لەمەرقەدی باوەگوڕگوڕ نەزر دەکا
ئێمەش کوڕی گڕ و خوێنین،
ئێمەش لە ڕێی ئەم ژانەدا دەمێ ساڵە شیعر و سوێنین!
ڕێ بۆ شەوارە خۆش دەکەین
ئەمجارەیان با ئەم سکە لەبار نەچێ
ئەمجارەیان، ئەم بارەیان لە گێژاوی ژان و پێچا ڕێ ون نەکا
با چنگی هاڵی نەگاتێ
بەڵکو خودا لە چیمەندا نەفخێکی (یُسر)ی بداتێ!
(حەمە علی)، ساڵانێک بوو هەر چاوەڕێی ئەم ڕۆژە بوو
بۆ ئەم خەونە هەموو کاتێک وەکو دەڵێن پڕۆژە بوو


حەمە عەلی! فەرموو ئەوا دایکی بەختە هاوار دەکا
وا بازنی هەزار سروود لە باسکی دەنگ و زار دەکا
حەمە عەلی! کوڕگەل، جەمن.
سەرچاوەیان هەر کوێیەک بێ زۆرن، کەمن،
چاویان لێیە وا ئەژدەهاک دڵی کوردی لەدەم ناوە
چاویان لێیە قودسی ئێمە دەمی وشکی نەپاراوە!
حەمە عەلی! داوی مەرگیان لە چیمەندا بۆ داناون
حەمە عەلی! بەسەر پشتی گەردەلوولدا بەرەو چیمەن ڕێ بەنە بەر
حەمە عەلی! گوللەبەنی بەردە گەورەکەی بازییان بکەنە بەر
حەمە عەلی! بۆ وەڵامم نادەیتەوە تا کوێ دەڕۆن؟
ژەمی نیوەڕۆی ئەمجارە لە کوێ دەخۆن!
بەئاوی کام چۆڕاوگەی خوێ دەست و دەمی خۆتان دەشۆن؟!
حەمە عەلی! خۆ من سۆزی دایە بەهێم
حەمە عەلی! خۆ من وەکو جەرگی حەپسەم
زامی دوو زامم هەر قووڵە و کۆڵ گرانم
حەمە عەلی! منیش هێشتا هەر چاوەڕێی کامەرانم
حەمە عەلی!
لە گەردەلوول کە دابەزین سەنگەر چۆن بوو؟
کەرکووک چۆن بوو؟ باوەگوڕگوڕ هەر دەسووتا؟
کڵپەیەکی سەر دەکەوت و کڵپەیەکی هەڵدەتووتا؟
ئەی سیامەند لەگەڵ خەجی خاک و خوێنا گەیین بەیەک
ئێستە گیانیان تێکەڵاوە؟
مەتارەکەی (بابە عەلی) لەناو دەستیایە بێ ئاوە؟
(نامق) چی وت بە(سەروەری) ئامۆزای و چیان بۆ تۆ گێڕایەوە
(نەوزاد) وتی سڵاوی من ببەرەوە بۆ دێوانە؟
لەبان مەقان، ڕاستە دەڵێن لە دوێنێوە قوڕ پێوانە؟
ڕاستە دەڵێن پەڵەی گەنم ئەمساڵ نایێتە کەروێشکە
جێ هێلانەی شەهیدانە؟
ڕاستە دەڵێن چیمەن دەڵێی دایکی بەختە و زەیستانە؟
حەمە عەلی... تۆ سوار چاک بووی بۆچی گلای؟

کوا سەنگەرت؟ کوا خەبەرت؟
کوا کڵاو و جامانەکەت؟ بۆ باوکی خۆت چیت ناردەوە؟
کە تۆ گلای، ئەڵبەت خەونت نەشاردەوە
کە تۆ خوێنت کرایە ناو دڵی چیمەن
خەونی چۆن چۆنت دەبینی؟
دایکی خەممان بارگران بوو؟
یا دەم وشکی پێچ و ژان بوو؟
باوەگوڕگوڕ لەسەر پێڵوت هەڵدەپەڕی؟
قەرە هەنجیر ئاوی ساردی بۆ دەناردن؟
بەردە قارەمانی کەفتە دوعای خێری بۆ دەکردن؟
بۆ مەرقەدی شێخ مارفمان تەپەی دڵی بۆ دەبردن؟
تۆ پێم بڵێ شوانەت بینی؟ ئاشتیت بینی؟
پاشا ڕێگەی جوانە مەرگان ڕەشبەڵەکە، کێی دیت بینی؟
چییان دەوت، چییان دەویست؟
چییان بیست و چییان نەبیست؟
(حەمە عەلی)!... سەر گورشتەی چیمەن و خوێن بگێڕەوە
من زۆر ماندووم من کۆڕەوێک چاوەڕێمە...
کێڵگەی شیعرم بەهاراوی ڕاپەڕینی لێ بڕاوە، لاڵ و پاڵە
هەر گێژاوی بێ خەیاڵە.
من ڕەو دەکەم وام لەڕێچکەی کۆڕەوێکا
ئەستێرەیەکی کشاوم، وام لە گەرووی وا شەوێکا،
مەگەر شەوی چیمەنی تۆ وا تاریک بێ!
پانیی ڕێگە جێ پێیەکە، مەگەر پردی سەرجەهەنم وا باریک بێ!
حەمە عەلی! وا من سەری خۆم دەشکێنم
لە کوێوە دێم بۆ کوێ دەڕۆم
ئاخۆ ژەمی مەرگ و ناسۆر ئەمجارەیان لە کوێ دەخۆم؟
باران ئەشکم دەخواتەوە
بەفر پێڵووم لێ قورسەکات، ئاژانس زامم دەکاتەوە
دەس لێ شتن وا خەریکە ڕێچکە دەکات بۆ ناو دڵم.
پەنا بەرمە بن کام دارێ؟



گمۆ ملی شۆڕ بێتەوە ملەکەوە بێتە خوارێ
تۆ سەیری کەن، تۆ سەیری کەن
ئەرژەنگی دێو بەدوامەوە چۆن دەخوێنێ و
بەسەر سەرما چۆن دەبارێ؟!
حەمە عەلی تۆ پێم بڵێ گەڕایتەوە لەم سەفەرە،
شەوان لە کوێ دەبەیتەسەر؟
ڕانک و چۆغە یا توێژاڵی گڵی چیمەن دەکەیتە بەر؟
من ئەم کۆپلە شیعر و سوێندەم
لەسەر گۆڕەکەت جێ دێڵم، لەبەری کە!
وەکو کاکۆڵ لەسەری کە!
*دایکی بەختی کوردستانمان!*
*پێڵووتە جێی حەمە عەلی*
*سەر و سەرای دوژمنانە*
*ئەو سەری ڕێی حەمە عەلی!*
کوڵەچوار شەمە زۆر بووە
من هەر دەستم لەسەر دڵمە
تۆ چی دەڵێی حەمە عەلی؟
وەک بسم الله پێش گشت شتێ دوای گشت شتێ
ئەم ئایەتە دەخوێنمەوە، ئەم سەدایە دەسێنمەوە:
*هۆ سوارەکان!*
*هەل ئەم هەلە، ڕۆژ ئەمڕۆیە*
*ئەمڕۆ هەر ڕۆژی کورد کوردە*
*نە من منە و نە تۆ تۆیە*

***

## بۆ یادی جەماڵە ڕەشی شەهید

١٩٩٢/٤/٢

کە دەمەوێ بۆ تۆ بگریم عەول دێتە فرمێسکمەوە
کە دەمەوێ بۆ ئەو بگریم تۆ دێیتە ناو فرمێسکمەوە
چۆنتان لەیەک دوورخەمەوە

چۆنتان لەیەک جیاکەمەوە
ئێوە دوو جەستە و گیانێ بوون
دوو ئەندێشە و ئیمانێ بوون
دوو دەفتەر و یەک چامە بوون
بەرهەمێک و دوو خامە بوون
چۆنتان لەیەک جیاکەمەوە
عەول پێی دەوتم کاکە، لەلای تۆش من هەر کاکە بووم
منیش وەکو ئێوە هەردەم هەر عاشقی ئەم خاکە بووم
ئەی پاڵەوان جەماله ڕەش، تۆ کەی ڕەش بووی
تۆ وەک دڵی ئازادیخواز لە زیندانیشا هەر گەش بووی!
ئەی قارەمان تۆ ئەشکەنجە بەزێنێ بووی
کە پێت داگرت، سوور بووی لەسەر ئەستێرەی سوور
تۆیان کرد بەکڵپەی تەنوور
وایان دەزانی سووتاوی
وایان زانی تویێ ئەستێرە تەواو کشایت و نەماوی
لەو ڕۆژەوە تۆ داستانی، داستانێکی ئێجگار جەنجاڵ
وەکو بازێکی تیژڕەوی دەدەی لەباڵ.
بەسەر شاری ساڵەکاندا چریکەت دێ و سروودی خۆر دەبارێنی
بەشاپەڕی شاباڵی خۆت تاریکایی دەتارێنی
تۆ نەمردیت، بووی بەپەیکی نامەی تۆڵە
وایان زانی دەرگای ماڵمان لەسەر پشتە و چۆڵ و هۆڵە
وەک سەگی هار وەک دڕندە وەکو و کولە.
وا دەهاتن، کووچە و کۆڵانیان پڕ دەکرد
وەکوو گورگی برسی خۆیان لە بۆنی خوێنێ خڕ دەکرد
هەتا مڕ بوون، هەتا پڕ بوون، دەستیان وەشان، خوێنیان ڕژان
بەڵام تۆ هەر نەمردیت و دەرگای ماڵمان لە ڕوویانا پێوەدرا
شکاندنی ئاسان نەبوو
کە نامەکەت گەیشتەجێ وەک ئەوسای خۆت بێ کەس و بێ باوان نەبوو
تۆ نەمردووی تۆ سروودی مافی گەلی کوردستانی
تۆ تۆوی نوێی وەرزی ئازادی ئینسانی
تۆ بەیانی، تۆ خۆر دێنیت، تۆ نەوروزی، تۆ بارانی



تۆ شەهیدی پێش کەوتوویت و کێ بەرکێکەیش هێشتا ماوە
شوکر سەنگەر نەڕووخاوە
ئەمڕۆ ئاڵای کوردستانە، نەخشی سەرڕوو و شێوەمانە
تەنها ئازادی کوردستان نرخی خوێنی ئێوەمانە!

***

## چەکەرەی کاوە

١٩٩٢/٤/٢٠

لە شارێکمان، پەیکەرێکی مامە کاوە
وەکوو ئاڵای ئازادی بێ هەڵکراوە
دڵم خۆش بوو وتم شانازی ئێمەیە
ئا لەم ڕۆوە چرای خۆشی ئەم ڕێمەیە
ڕێی ئەندێشەی کوردایەتی ئەم سەردەمە
پەیکەرێ وا بۆ ئێمەیشەو بۆ سەرجەمە
ئاڵای ئێمە پێچراوە بوو هەڵنەکرا
وەکو بڵێی قوربانیی هیچ بۆ نەدرا
ئاڵای هەڵکرد هەر میللەتێ قوربانی دا
بۆ قوربانیی گەلمان قوڕی لە شانی دا
نەم بیستووە هیچ میللەتێ بۆ پەیکەرێ
لەسەر دەستی سەری لاوێکی خۆی بەرێ
بۆ پەیکەرێ قوربانیشمان دا بەڕۆژگار
لێمانی داوە ڕەهێڵەی شەستی ئازار
هەر قایل بووین وتمان ئەمە مێژوومانە
یادی باوانی دێرینی بازوومانە
کەچی دوژمن وەها دڵی گەنیو بوو
ئەم کارەی لا کارێکی کەس نەدیو بوو
شەوێکی ڕەش وەک شەوانی دەیان ساڵمان
لەسەر خۆمان خڕ کردبوو دەرگای ماڵمان
گەردەلوولی خەشی دوژمن هەڵی کرد
بۆ مێژوومان بێ شەرمانە دەسی برد

بۆ سبەینێ کاوەی شکاو کە خۆر هەڵات
بای ڕەشەبا لێرەی دەبا و لەوێی دەخات
هەر کاوەیە و دوای کاوە دێ و ئێمەش دەڕۆین
دەڵێین سبەی بەیانی دا خەمێ دەخۆین!
زرمەی پیک بوو دەیانهاڕی لە گشت لاوە
جێگە پێەکەی پەیتا پەیتا دەکوتراوە
پیرەمێردێک لە لایەکی ڕاوەستابوو
بەو دیمەنە خەمی نوێی لە دڵ شکابوو
پرسی: کوڕم بۆچی وا توند دەیکوتن؟
خۆ ئەو بەردە و لێیان نایێتە وتن!
-ترسیان هەیە ڕقی ئێمە بێ و سەر بکا
بەرکۆشەکەی مامەکاوە لەبەر بکا!
نەخەیر مامە ئەم ترسەی خەواندووە
گوایا ڕقی ئێمەی کوردیان مراندووە
دەڵێن نەکوو گیانی کاوە ئالێرەوە
گوزەر بکا بەدەشتی گەرمەسێرەوە
لەجێی خۆیدا چەکەرەی نوێ هەڵباتەوە
دەرگای خڕی خەمی ئێمە بکاتەوە
حەوتی ئازار کاوە لە نوێ گەڕایەوە!
پێش لە نەورۆز ئاگرەکەی کرایەوە!
وەڵامی توو و مامە پیرەش درایەوە!

***

## بۆ دایە گەورەی پشدەر

١٩٩٢/٤/٢٠

ئەمجارەیان وا هاتمەوە قەڵادزێ بەهارت بێ
دەریاییێکی جموجۆڵ بێ و ئەمبەرە و بەر کەنارت بێ
ئەمجارەیان وا هاتمەوە...
لە بارمتەی چاوی تۆدا هەزار شیعری خۆم چاندووە
ئەمجارەیان وا هاتمەوە، خەم و داخم خەواندووە



با تێر تەماشای باڵات کەم، خەریکە خۆی دەگرێتەوە
با تێر تەماشای چاوت کەم، وردە وردە دەکرێتەوە
ئەمجارەیان سروودی من بۆ باڵای تۆ دانراوە
ئەمجارەیان بەستەی هیوام بەرماڵێکە... دایکی پشدەر
بۆ نوێژی تۆ ڕاخراوە.
ئەمجارەیان لەسەر گۆڕی شەهیدانت نوێژی ئیستیسقایێ دەکەم
بەناو گەردەلوولی خەما پەڵە هەوری وا دەهێنم
کە بتوانم ئەشکی خۆمی تیا بچێنم
بە بەستەوە بۆت بباریێ، بڕژێتە سەر هەموو زارێ
ئەمجارەیان لە هەردوو زێت ئاوی حەیات دەخۆمەوە
ئەمجارەیان -لە جۆلانەی چاوی خۆما دەتخەوێنم- ئەوساکە خۆم دەڕۆمەوە
ئەمجارەیان وەکو سارا گوڵاوڕێژی کۆڕت دەبم
دەستەسڕت بۆ هەڵ دەدەم
ئەمجارەیان حاجییەکم لە عەرەفەی قەڵاکەتا
شەیتانی نووی بەر پەڵ دەدەم
دەبمە نقێمی موستیلەی پەنجەیەکت تازە تازە دەڕوێتەوە
بەدەستەدووی هەوجاڕێکت تازە تازە دەکرێتەوە
بەستارەی سەربانێکت مەوجی سووری پیا دراوە
بەکلیلی دەرگای دڵی ئەو خەمانەت، چوارساڵ دەبێ داخراوە
شیعرم کلی کێوەڕەشە، چاوت لە نوێ بڕێژەوە
دایە گەورەکەی پشدەری، باراش لە نۆی ببێژەوە
مامانێکم لەم ژانەتا، زوو ئەم بارەت بخەرەوە
خۆم ناوکیت بۆ دەبڕم
هەر خۆم لانکە و بووکەشەشەی بۆ دەکڕم
هەر خۆم بەرگێکی بۆ دەکەم گوڵەکانی شیعری جوان بن
کوڵمەکانی سوور هەڵگەڕێن، نانی شوان بن!
دایە گەورەکەی پشدەرمان! کوانێ یەخەی پڕ شیری تۆ؟
وا بەهارە ئەمجارەیان یەخەی ئاسمانت بۆ دەگرم
ئەمجارەیان کرێوەیەکت لێ بدا خۆ من دەمرم
تەلمیت بەندانێ ڕێ بخە، بووکی سوار بێ
سوارەی شایی، با دێبەرە و باخ و کێڵگە و ڕەنگی شار بێ

ئەمجارەیان تۆ بمێنی و کوردستانیش ئاوەدان بێ
ئەمجارەیان لەبەر تاڤگەی ئازادیدا تۆ خۆت بشۆ
بەکورد بڵێ: دوژمن هێشتا چاوی سوورە، دەتۆش خەمێکی خۆت بخۆ
جارێکی تر کە دێمەوە، شەتەکم دە بەو شاخەوە
لەناو ڕەزێکی کێڵڕاوا کە هاتەبەر کوپەیەکی لێ پڕ دەکەم
کە بوو بە مەی دەڵێم ئۆخەی
من وەک خەییام ڕووی گومانم ناکەمە خوا
من عەشقی خۆم نادەم بە با
من لە دڵما هەستەی باوەڕ بەرجەستەیە
جا ببینە عاشقەکەت ئەو مەستەیە
لەناو هەموو عاشقاندا سەردەستەیە!
ئەی خۆ منیش هاوسەنگەری هەژارانم
دەنگم لەگەڵ هاواریانە
خەمم لەتەک ئازاریانە
پێش هەموو کەس قوربانتین
ئێمە ڕۆڵە و باوانتین
قەڵادزێ دایکی پشدەر
لە حوزورتا ڕاوەستاوم دەستەونەزەر.

***

## شاژنێک

١٩٩٢/٦/٨

بەدەفتەری شاژنانی گەلی کوردا چاوم گێڕا
تۆم بەدی کرد ناهیدەخان
دایکە خەمەی تێکۆشەران دایکە خەمەی ئازاری خوای ئەم گەلە بووی.
لەناو کێڵگەی هەوڵی پاکدا، گەورەییدا، پوختی خەرمانی خەلە بووی.
خەمی هەموو ئازادی خوای ئەم وڵاتەت، لەناو دڵە گەورەکەتا دەحەواوە.
دڵدارەکانی ڕێی خەبات خوازبێنییان لە قەولی تۆ دەبڕاوە
خوشکی گەورەی هەموومان بووی
ئاوی سازگار و چایی بووی بۆ تینوان
بەهەتوانی دەستی تۆ بوو زامەکانمان سارێژ دەبوو، پەترۆی دەبەست



تێکۆشەرێک کە دایکی خۆی دەدی تۆ بووی
چەکی هەڵمەت و ئاخێزی لە خۆی دەبەست
تۆ نەمریت لە دەفتەری جاویدانی سەفەرماندا سەردەفتەری
تۆ لە ڕیزی هاوڕێیاندا تا خەم بمێنێ ڕابەری.

***

## ئەیلوول بەپێوە وەستاوە

*بۆ شەهید مەلا ڕەسول*

١٩٩٢/٦/٢٦

ئەیلوولی سوور هەستایە پێ
شتی وەهاش دەبێ و دەشێ!
ئەیلوول بەپێوە وەستاوە، چاو دەگێڕێ، سەنگەر بەسەردەکاتەوە
سڵاوی گیانی شەهیدان دەداتەوە
ئەم سەنگەرە هەوەڵ تەقەی لێوەکرا
ئەو سەنگەرە بوو بەجێ مەشخەڵ و چرا
یەکەم شەهید ئا لێرەدا وتی: یا کوردستان یا نەمان
ئەم سەنگەرەش ئەوەیان بوو هاتە زمان، وتی بەسە شک و گومان
ئەم سەنگەرەش تینی ئەیلوولی لەبەرکرد
وەرزی هاتوو هاتە گۆڕێ سەنگەر دەبێ خۆی بگۆڕێ!
سەنگەر ڕیزن، ئەیلوول لەمیان سڵاو دەکا
لەگەڵ ئەویان مشت و مڕیە و بۆ ئەوی دی دێت بەچۆکا
سەنگەرەکان وتیان دەبێ ئەسپەشێکەت زینێکی نوێ لە خۆکا
هەندێک سەنگەریان شەرمن کرد
دەربەندەکان کرانەوە
سەنگەرەکان گوێزرانەوە!
لە ئەشکەوتەکەی سوولاودا، ئەیلوولی نوێ خۆی دامەزران
ئەیلوول بوو بەسەرکردەی نوێی وەرزەکانمان
ئەیلوولی نوێ ڕەشبەڵەکی بۆ خۆش کردین
سەنگەری نوێی پێ نۆش کردین
دەنۆشمان بێ ئەیلوولی نوێ و سەنگەری نوێ
دوێنێ لەدایکە پیر بووە، ئەمڕۆش نەوەی دوێنێمانە

ئەمە نەریت و ژانمانە، هەر کوردستانیش جێمانە
دوێنێ منیش سوارەکانی ڕێی ئەیلوولم
لە بازنەی ئەندێشەما کۆ کردنەوە
دۆستێکی خۆم ناسییەوە (مەلا ڕەسوڵ)
ئەندێشەم وا هات بەیەکدا... بوو بەزریان و گەردەلوول!
کاکە مەلا ئەوە لە کوێی؟
لەبیرت دێ کە دەمانگوت بەدەنگی بەرز هێجگار قایم
نوێنەرمان شێخ مارفە و کاک برایم(١)
لەبیرت دێ بەرەیەک بوو گشتمان لەژێر باڵیدا بووین؟
بابەتێک بوو لەناو ماڵیدا بووین
دایەیەک بوو گشتمان سەرمان دەخستە باوەشی؟
بۆ هەموومان نازی هەبوو هەڵۆی هەبوو بازی هەبوو؟
بۆ خەوتنمان هەزار باس و ڕازی هەبوو؟
لەبیرت دێ ئەیلوول زستانی لێ باری؟
ئەو باوکەمان نەخۆش کەوت و دایە گەورەش بێ پەل و پۆ
کە بانگێکی بۆ هەڵدەداین وای شێرە بوو باوکەڕۆ؟!
تۆ بەولادا و من بەم لادا، دوژمن بەردی خۆی دەهاوێشت
هەوەڵ گلّمتک بەرەو تۆ بوو
دوا بەدوای تۆ منیش هێندەم پێ بڕابوو
لە دەرەوەی ئەیلوولەوە دەرگام لەسەر خڕ کرابوو
ئازاری تۆ لە جەستەما بڕ کرابوو
سیاسەت بوو– هەزار لەعنەت لە سیاسەت!
هۆ سیاسەت هەزار لەعنەت لە لۆقەت و لەپیاسەت!
من لە بیرمە شارباژێرت دا بەشانتا و بەرەو پێنجوین هەنگاوت نا
پێنجوین بوو بەبێشکەی شۆڕش لە ژانتانا... تۆ شەهید بووی
ئەیلوول چاکی کرد بەلادا. نەکوژابووەوە، کە پێی خزا هەڵسایەوە
لە کوانووی پڕ ژێڵەمۆدا وەکو نەریت ئاگری نەورۆز کرایەوە
لەو ڕۆژەوە ئاگر خۆشە کلّپە دەکات و کز دەبێ
کز دەبێت و کلّپە دەکات، بەرەو ئاسمان نێڵەی دەبات

(١) مەبەست شێخ مارفی شەهید و ئیبراهیم ئەحمەدە کە پاڵێوراوی بەرەی نیشتمانی بوون لە هەڵبژاردنی ١٩٥٤دا لە لیوای سلێمانی.



کە کز دەبێ، دەرگا لەسەر براییمان واز دەکرێت و
هەموو بەرەو ماڵی بابە و بۆ ناو کۆشی دایە گەورە خۆ دەهاوین.
تۆ شۆڕەسواری ئەیلوولی و ئێمەش لە ئاستی ئێوەدا سەرمان نەوی و
دەستەو نەزەر ڕادەوەستین، تەلمیت بەندانی بووکی نوێ دادەبەستین
ئێمە تۆمان هەر لەبیرە، هەژارانی کوردستانین
ئێمە وەڵیای ئەو پێچەنەین ئەیلوولی تۆ پێوەی پێچرا
خۆی ڕاگرت و هەر مایەوە
دەرگای گەورەی ڕاپەڕینی کوردی لەسەر کرایەوە
دەرگەوانی ڕاپەڕینمان برسییانە و هەر دەپرسن
پێشڕەوەکان ئێمە لە کوێین. بۆ کوێ دەچن؟
برسێتیمان کورسی نییە، تێر ئاگای لە برسی نییە
کە ئێش گەیشتە ناو گەدە، وا گیانەڵای ئازادییە،
تەپڵی وادی بەوادییە
هۆ تێرەکان... زۆر تێرەکان ئێوەش سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بن
نان مەخۆن و مەخۆنەوە، بەئەشکی سوێری ئاوارە تەسەلیتان بشۆنەوە
وەرن، وەرن مەڕۆنەوە، مەخۆن مەخۆن، مەخۆنەوە
خەم هەر خەمی ئازادییە، خەم هەر خەمی کوردستانە
دایکی خەمان... خەمی ئێمەی بێ سەربان و بێ بن بانە
مەلا ڕەسول! سنوور بگرە دز بارانە!
دنیا دنیای بۆرجوازی ناو شارانە!
دز بارانە لە پێیان خەن لەپێیان کەن
با ئێش نەگاتە ناو گەدە با ڕۆژ نەگاتە ڕێی سەدە
با ئازادی نەبێ بەقوربانی نانێ
ژەمی بێ ژەم دەس نەنێتە بینی ژانێ
با نان بەرەنج و شان کوتان بخرێتە سەر هەموو خوانێ!
کوردستان کاتێ ئازادە کە کورد تێر بێ
کۆشکی ملیۆنێ قاچاخچی سەرەوژێر بێ
ڕەزمان ئەو وەختە دێتەبەر، هەژاری کوردی ئاودێر بێ
مەلا ڕەسول ئەم ئەیلوولە کە هاتەوە
ژان... ژانی کورد، وەڵیای چابوک دەخاتەوە
دەرگای بەیان لەسەر گەدەی دزەکانی ئەم دیوە و دیو دەکاتەوە

مەلا ڕەسول هەر شێ سوارە، ئازادی بووکی نازارە
گەدە مەڵبەندی هەرایە نەک قەرارە
کوردایەتیش درەخێتکە نان و ئازادی دەگرێت و
زەنگی دێرینی زەوارە... گوڵی هەمیشە بەهارە

***

## بۆ ئەندازیاری کارەبا حەمە سەعید گەڵاڵی

بەکوشتننت ویستیان دڵی ئەم شارەمان بکوژێننەوە
بەکوشتننت ویستیان داری خەم و خەبات بشکێننەوە
بەکوشتننت دوژمنانی تەبایی کورد تاوان ئەخەنە سەر تاوان
بەکوشتننت دەیانەوێ بووکی ئاواتیئەمگەلە ڕوونەکاتە ماڵە باوان
بەکوشتننت دەیانەوێ ئاگری خەش هەر نێلەی بێ لەم شارەدا
بەکوشتننت زۆڵە کوردیش کنە دەکات لەم دۆخەدا لەم بارەدا
حەمەسەعید! چرا بەدەست، ئەوچرایەی هەڵت دەکرد هەروا خۆشە
ئێمە دەردی دووریت دەخۆین تۆش شەرابیشەهادەتیخۆت بنۆشە
دەبا دەستی تاوانباران وا وشک بێ نەبێتەوە
ڕێگەی تاوان با داخرێ و هەتا هەتا نەکرێتەوە
هۆ خەڵکی کورد ئا لێرەدا سەری ڕێزتان دانەوێنن
لەعنەت بکەن لەو کەسانەی ڕیزی گەلمان دەشێوێنن!

***

## (......)

١٩٩٢/٩/١٤

با ئەمێستە ڕێگە بدەین بەفرمێسک و هەناسەیێک هەڵبکێشین
کە زووخاوی ساڵەهای ساڵ هەڵبرێژێ
با دەسرێژی ئازاری کۆن، دەردی تازە دابیێژێ
با بەتەزبیح لەعنەت بکەین لە دیدار و یادی بەعس و ساڵانی خەم
با لەجیاتی دەست بەئەژنۆ دانیشتنمان ئەو دەستانە لە گۆ بخەین،
دەیانەوێ دیسانەوە هەڵمان بکەنە سەر ستەم
ئەو ئاگرەی نایانەوە لەناو گیانی جەزا و جەمیل و شادمان
ببێت بەپەیک لە مێژوودا لەسەر زاری خەمی کوردی خۆی بێتە زار
ڕوو بکاتە شار



ببێت بەخۆری بەیانی ببێت بەخۆری ئێواران
ببێت بەلێزەمەی باران
بەبێخی زۆر بەقوڵاچوی هەموو داران
بە مانەفێستی بڕوای نوێ
بەسروودی نێو نەتەوەی ژێر سێبەری بەیداخی دوێ
وەک هەڵکەوتوو با هەڵکەوین
خوێنی شەهید شۆڕەسواری ئەم دنیایە، دەبا ئێمەی ڕەگەڵ کەوین
خەجاڵەت بن ئەو کەسانەی پێیان وتین ئێمە کەوین، ئێمە هەوین.
نەخێر ئێمە پیرەمەگروون و قەندیلین، شاهۆ و دوندی ئەراراتین
لوتکە دەکەین بەناو دڵی ئاسماناندا و دانانەوین
وەک هەڵکەوتوو با هەڵکەوین
ئەزنەقێکە هەرچەند قورسە، گەڕانەوە هێجگار شەرمە با سەرکەوین
سبەی دنیا پێ دەزانێ بەم خەبەرە
کورد کەو نەبوو کورد کەوەرە!

***

## برووسکەیەک بۆ شاعیر کەژاڵ خان

لەناو سەنگەری مەردانا
لە توێی ئەشکەوت و بەردانا
لە بەهاری ئازادیدا، گوڵێک ڕوا
سوور وەک خوێنی باوەگوڕگوڕ
بۆنخۆش وەکو بەهەشتی خوا
بەهێز وەکوو زەردە و سەفین
جوانتر لە شیعرێ بۆ ئەڤین
دەستەونەزەر لەبەردەمیا ڕاوەستام و نەویمەوە
تۆز و گەردی لێ نیشتبوو سڕیمەوە
وتی گوڵی ڕەنجدەرانم
هەر من ناوی خۆم دەزانم
من لە تۆوی کوردستانم
ئەستێرەی سوورە، نیشانم

من کەمالم... لە کاروانی ئازادیدا ئێمە پێکراین
دوور لە مەزرای خوێنی باوان، کراین بەخەرمانی شەهید
ئیمە حەوت بووین خولیا یەک بوو
هەنگاو یەک بوو، سەنگەر یەک بوو
باوەڕ چەک بوو، دوژمن یەک بوو
دواجار لەناو برینێکا مردن یەک بوو
هۆ شاعیرە دڵسۆزەکە، قەڵەمیی من زاری تۆیە وا خەمبارە
قەڵەمی من منارەی کۆلیلی شارە
پڕ چامەیێک ئەشکم پێیە
بۆ کەمال و هاوڕێکانی، بۆ ئەم ڕۆژە نالەبارە
بۆ ئەم ژینە پڕ جەخارە!
من برینی شەهیدانم
ڕۆژی سەد جار دەکولێمەوە و دڵم هەمیشە زامارە
کە ئەشکی من چکی کرد و قەڵەمەکەم کەوتە زەوی
لەگەڵ چاوی شێخ کەمالا چاوم لێیە تۆ پێشڕەوی

***

## برووسکە شیعرێک بۆ سەرچناری شاعیر

برام قادر...
ڕۆژێک کە شیعر و سەرچنار
قۆڵیان کرد بەقۆڵی یەکدا بەرەو بنار
من تۆم بینی ئیتر هەگبەم دا بەشانما
زامێکی کەم هێنا و چاندم لەناو کێڵگەی زامەکانما
جۆگەیێکم لە دڵتەوە هێنایە سەر چەمی خەمم
خەمی خۆمم خستە لاوە من خەمی تۆم کرد بەژەمم،
برام قادر
وەکو، منی جگەرسووتاو، کەم کەس دەزانێ خەم چییە
یاوەکوو تۆی برا کوژراو
جا ئەو ڕۆژە کە خەممان کردە یەک هەگبە
شیعرەکانمان وەک چەخماخە تەقینەوە
خوێیان بارانە سەرلێوی تەڕی سەدان برینەوە



تەقینەوە. ئەشک باران وەرزی نوێ بوو
تەقینەوە، لە کوێ ئێمە و شیعر هەبوو خەم لەوێ بوو
برام قادر خەمی ئێمە درەختێکە و هەزار ڕەگە
کێشەی شیعرم شەهیدانە و کێشەی شیعرت کەریم بەگە(١)

***

## قەڵادزێ

هۆ... هۆ شارە وێرانەکەی دڵی پشدەر
خۆ من سەرم لە قوڕ ناوە،
لە شوین ماڵێکی کاولتا دایک مردووم و شین دەکەم
لە وەتای تۆ لە وێرانی هەڵکێشراوی
لە هەرکوێیەک ئیسلام هەبێ و شار خاپوور بێ
بێ یەک و دوو ئامین دەکەم
بۆ تۆ بمری و قسەی زلی زەرد هەڵگەڕاو
باسی بەهەشت و جەحەننم بدا بەگوێی
ئەم و ئەودا؟!
هیچ میحرابێ نەی لاوانی
هیچ ئیسلامێ نەیخستیتە سەر باوانی!
کە تۆیان کوشت هەر کورد وتی ئای دایکەڕۆ
هەر کورد قوڕی گرتە سەری!
دانی شاشی ئومەمییەت بەدانەچۆقە هەڵوەری!
لەسەر گۆڕی تۆ وەستاوم،
چاوەڕوانم وەکوو مەسیح هەڵسیتەوە
خۆڵی مەزرات بکەم بەسوورمەی چاوانم
منیش وەکوو (سارا)(٢) خاتوونی هەڵکەوتووت
بێمەوە کۆشی باوانم
ئەگەر ڕۆژێ تۆم لەبیرچێ
ئەو کاتە من ڕشانەوەی ئێڵنجەکانی تاوانم!
قەڵادزێ، قەڵای دوو زێ!

(١) کەریم بەگ: برا شەهیدەکەی قادر سەرچناریی شاعیرە.
(٢) ساراخان شاعیرە هەڵکەوتووکەی قەڵادزێیە.

من زێیەکم لەو دوو زێیە...
ئاخۆ سارای شاعیری تۆ لەمەش زیاتر چی دی پێیە؟
تەنها دەنگی شاعیری کورد سۆزی شەقامە ڕێمانە
دەبا دوژمن خەمی بار بێ
قەڵادزێ بوو بە کەعبە و قیبلەگایەکی نوێمانە
دە ساراخان بە گەردوونا بانگێ بدە
قەڵادزێ دیوانی شیعری وێمانە(١)

***

## ڕۆژی شەهیدی شیوعی

چ ڕۆژێکە وەکوو ڕۆژتان پڕی خۆر و درەخشانە؟
لەگەڵ فەرقی سەماواتا بەباڵا بەرز و هاوشانە؟
سەرم هێنایە بەرپێتان ئەوەندە گەورەیە ناوتان
بەتەنها یادی ئەمڕۆتان پڕی دنیایە ڕامانە
شەهیدانی شیوعییەت قەسەم بەم ساڵ و ڕۆژەشتان
هەتا ئەمڕۆکە مەینەتتان برین وسوێی هەناومانە
چ ڕۆژێکی تەمەنتان بڵێین ئەو رۆژە بێ ناوە!؟
هەموو ساتێکی ئەم یادە جیهانێک سووری خەرمانە
بەڵێ گەورەن بەڵێ دەریای هەموو هۆشێکی پیرۆزن
بەتەنها یادی نەمریتان سروودی گەرمی خۆشخوانە
لە ڕۆژێکدا ئەگەر مێژوو لە دەرگای بەختی دا جارێک
بەتەنها دەفتەری ئێوە پەنایە و ماڵە باوانە
قەڵەم گەر بێتە سەرباسی خەبات و بیری زیندووتان
کتێبی سەد کتێبخان،ە کەمن، بۆ باسی ئەم وانە
شەهیدانی شیوعییەت سڵاو و ڕێز و تەقدیرم
لەسەر باڵی وشەی کوردی بەرەو لای ئێوە ڕێوانە
سروودی من سروودێکە لەسەر ئاڵای خەمی ئێوە
بەپەیڤی مانەفێست نووسراو لە جاما، تاکوو لێوانە!

***

(١) وێمانە = خۆمانە، ئێمەیە.



## وەڵامی شیعرەکەی کاکە عەتا

گوڵە ئازیزەی عەشقێنی کاکە عەتا
وشەت هەمووی تین و تاوە
قوڵپی دڵت وەکوو شەپۆڵی شەتاوە
ئەمڕۆ عەشق وەک ئەوەی تۆ
لە هیچ کوێیەک شوێن هەواریشی نەماوە!
ئەوەی کە تۆ خۆشت دەوێ دەبێ ئەویش تۆی خۆش بوێت
ئەوەی هەستی ناسکی تۆ دەدا بەزێر، بیکەرە پێت
گوڵە وەنەوشەی عەشقێنی کاکە عەتا
ئێمە نابێ عەشق بخەینە جێی خەتا
عەشق وەکوو چەپکە گوڵی تازە دەمە
عەشق چاوگەی هزر و خەمە
عەشق پەیامی ئەو خوایە
پەتک نییە وەک هەودایە
ئەوەی کە تۆ خۆشت دەوێ
دەبێ لە دڵیا جێ هەبێ... بۆ بازی تۆ
دەبێ لە سەریا جێ هەبێ... بۆ ڕازی تۆ
کە لێوی تۆی دی، تینووە، دەبێ شیلەی لێوت باتێ
باوەشت بۆ بگرێتەوە کە کەوتیتە هەر نەهاتێ
ئەوەی یارێک دەکا بەدوان، ئەوە عەشقی پێ حەرامە
ئەوە کێڵگەی ئارەزووە، کەی دڵی ئەو جێگەی زامە؟!
زام مەدالیای عاشقانە
بەلایەقی جۆرە کەسی وای مەزانە
شووڵە بەڕووی، سەر کەلی عەشق
تا ڕەشەبا لێت هەڵنەکا و هەتا شەختەت لێ نەبارێ
هەر نابیتە گەورە دارێ
مەبە بەجێی مەلی شەل و لانەواز و دارەودارگەڕ
تۆ هێلانەی تۆپی گوڵ بە!
تۆ سەرچڵ بە!

ئەگەر مەلێک عاشقت بوو بیگرەوە و گوڵپۆشی کە
ئا بەو جامەی خۆت پێی مەستی عەشقی بەرێ
بڵێ قوربان ئەمە شەرابی حەڵاڵە، دەسا فەرموو تۆ نۆشی کە!
***

## هەتا کەی

ڕۆژنامەی برایی، ژمارە (١٥) کوردی
ژمارە (١١٧) عەرەبی، ١٩٦٧/٨/٢٦

هەتا کەی مەستی بادەی خۆپەرستی بۆچی تێ ناگەی؟!
ئەگەر وا تاریک و لێڵ بێ بینایییت هیچ بەدی ناکەی!
لەسەر بەرزی، کە وەستاوی بچووک خەڵک دێتە پێش چاوت
کەچی نازانی تۆ وردتر ئەبینرێی هەستی پێ ناکەی
نەما ڕەفتاری ژیرانەت شەقاوت بێ سەر و شوێنە
لە ئاستی تیر و تانە و بەردی خەڵکی بۆچی سڵ ناکەی؟
لەبەرچی خوێنی من ڕشتن لەبەر کام هۆیە ئەو کوشتن؟
لەناو گەرداوی ئەم ژینە دەسا بەم چەشنە هەڵناکەی!
نەخۆشی دەردی بایی بوون کە سەرتاپای لەشی گرتووی
بەبێ باکی ئەڕۆی کاتێ ئەزانی قوڕ بەسەردا کەی!
بەبیرتا نایە ڕۆژێ بێ تەوژمی دەنگی بێزاری؟
وەها شالاوت بۆ بێنێ هەتا تینت هەیە ڕاکەی؟!
***

## ئەی شارەکەم

٩٦٧/٧/٣٠، برایی، ژمارە (١٣) کوردی
ژمارە (١٠٣) عەرەبی، ساڵی یەکەم، ١٩٦٧/٨/١٢

بۆ شارەکەم!
*«پێشکەش بەشاری سولەیمانی بریندار بێ»*

١

خۆشم ئەوێی وەکو ژیان
بەدڵ، بەگیان...
وەکو زەردەی دەمەوبەیان،



وەکو ئاوی ڕوونی کانی،
گوڵی پشکووتووی بەیانی،
وەک لێوی ئاڵ
وەک چاوی کاڵ
وەکو جووتیاری داس بەدەست
کرێکاری بەهەوڵ و هەست
وەکو پەڵەی گەنمی پڕ دان
وەکو نانی باوەشی شوان
وەکو هەموو شتێکی جوان
خۆشم ئەوێی...
ئەی شارەکەم!
ئەی شارە بێ بەهارەکەم!

٢

لەمسەر کۆڵان بۆ ئەوسەری
بۆ هەر پەنایە ڕێ بەری
پەپوویەکی چاو خوێناوی...
چنگ کۆڵەووز
سەرباڵ ڕەشی...
پۆپنە گژ...
لەگەڵ دێڵەشڕی شەوا
بەدەم یەکا ئەڕشێنەوە
ئەوەی ئەیلێن نایلێنەوە
لەسەر هەموو لقی دارێ
تەڵەی مەرگێ ئەنێنەوە
لەسەر دەنگی دەهۆڵی کۆن
بەجووت بەستەی مردن ئەڵێن
پێ بەخونچە و گوڵا ئەنێن
بەسەر هەموو ڕێچکەیەکا
ڕەنگی کینە و ڕق ئەرێژن
کە ڕۆژ هەڵهات
خوماریبیان

بەخوێنی لاوێ ئەشکێنن ئەی شارەکەم!
ئەی شارە بێ بەهارەکەم!

**٣**

تاکەی! شەو بێ؟!
شەو. بێ خەو بێ!
تینووی گەشتی مانگەشەوی
تینووی وەنەوز
تینووی خەوی
تینووی شەقامی بێ چەقەی
تینووی ساتێکی بێ تەقەی
تینووی خەندەی لێو و چاوی
تینووی دڵێکی نەشکاوی
تینووی باسیی خەم ڕەوێنی
تینووی مژدەی دڵدوێنی
تاکەی شەو بێ؟!
شەو. بێ خەو بێ!
پەپووی یاری تاریکەشەو
هەر بمێنێ!
دڵ بشکێنێ،
خوێن بڕژێنێ
بەستەی خۆشی
لەسەر لێوی...
دایک و باوک،
خوشک و برا
بپروێنێ!؟
هەر بمێنێ
ئەی شارەکەم!؟
ئەی شارە بێ بەهارەکەم!

***



## لەسەر چی؟!

برایی، ژمارە (٢٥) کوردی، ژمارە ١٨٧ عەرەبی
ڕێکەوتی ١٩٦٧/١١/٤

لەسەر چی بۆچی خۆت دانا؟ نەزانی کوێری نابینا!
ئەوەی (تۆی) نارد سەیر کە پێکەنینی وا لەبەربینا!

هەموو ئەو ڕەنجە تۆ دابووت بەفیڕۆ خستە گەرداوێ
ئەوەی بتناسێ تا مردن ئەڵێ پیس بووی لە ڕووی ژینا

بەناو (ڕەمماڵی) دەوران بووی گەلێ کەس (تۆی) بەژێر زانی
کەچی زوو مایەپووچ دەرچووی لە دەستە و کۆمەڵ و چینا

ئەگەر تێگەیشتوویی تۆ، بمێنی و خەڵکی تیا بروا
کە تاوانە گەلێ تیاچێ لە ڕێگەی تۆڵە و وقینا

سەری سەربەرزی نابینی لە خاکی کوردەواریدا
ئەزانی پێنووسی مێژوو ئەنووسێ (تۆ) لە نەفرینا

کەسێ تۆی ناوێ پێی ناوێ چرای زانستی بۆ هەڵکەی
لە مێژە خەڵکی ئەتناسێ لە ڕۆژی سەختی دێرینا

بەڵام بۆ کوێ ئەچی میللەت بەچاو لێکنانێ ئەتهارێ
بەدووتا وێڵە وا ئەتبا بەناخی مەینەتی و شینا

***

## هاوارێک

برایی، ژمارە (١٩) کوردی، ژمارە (١٤٥) عەرەبی، ١٩٦٧/٩/٢٣
*بەبۆنەی قەڵاچۆکردنی ناو شاری سلێمانییەوە «شاری بێ بەهار» لەم ڕۆژانەدا:*

ئەی کوردستان ئەی گەلی کورد
وا سەگی خوێڕی گورگی هار
کەڵبەی پیسیان لە لەش گیر کرد
ئارامیان بڕی لەبەر شار
چەند گوڵی پاکت جانەوەر
پچڕقانی و بێ هودە مرد

پیاوکوژ و بەد دز و چەپەڵ
کەوتوونەتە هاورد و برد...
وەک سەگی هار بەربوونە شار
گوێ نادەنە درشت و ورد
دەست و چاو و دەمیان خوێنە
تەیمورەی لەنگ کەی وەهای کرد؟!
نەشەرەف و نەگیان و سەر
نەخوێندەوار نەتێکۆشەر
نەپیاوچاکی بەڕێز و ناو
نەپێشڕەوی کاروان و بەر...
بەدوور نییە لە هێرشی...
پۆپنە لاری بێ هونەر
خۆڵ و خاک و بن بێژنگ و
ئەلەکە و وەلەکە و گەوجە و گوجەر
چڵکاوخۆری (کۆنگۆی) زەبوون
قەت وەک ئەمانە هەر نەبوون
بیانەوێ چەقۆ تیژکەن...
لە گەردنی کوردی بسوون...
بێ باوەڕ و بڕوا و شەرەف
چنگی خوێناوی ئارەزوون
پەیامی خوای چاو سووریانە
کوشتن بڕین بێ چەند و چوون
باوکە پیری ئەژنۆ شکاو
کۆرپە ساوای شیر لێ بڕاو
ئەی شاری نیوە خاپوری
شەقام تروسکە تیا نەماو
ئەی دەمی وشک ئەی لێوی زەرد
چاوی گریا و پێڵوو سوواو
ئەی داخ و دیق کۆلێل و شین
لاشەی کەوتووی بێ گۆڕ و ناو



ئەی کوردستان ئەی گەلی کورد
وا سەگی خوێڕی و گورگی هار
کەڵبەی پیسیان لەلەش گیر کرد
ئارامیان بڕی لەبەر شار

***

## زەنگی کاروان

برایی ژمارە (٢١) کوردی، ژمارە (١٥٩) عەرەبی، ٧/ ١٠/١٩٦٧ بەغدا

بدەن لە زەنگ
کاروان ڕەوکا
پشت ببەستن
ڕامەوەستن
کات یەک کاتە
ئەگەر هاتە یا نەهاتە

*

گوێ مەدەنێ لە زەنگ بدەن
چاوی نوستوو لە خەو بکەن
هەموو دنیای پێ دەنگ بدەن
گوێ مەدەنە ئامۆژگاری
بڕۆن بڕۆن
دیۆ و درنج لە داخانا
بەقەپ گیانی خۆیان ئەخۆن

*

شەو تاریکە...
لە زەنگ بدەن
ڕێگا بکەن بەمەشخەڵان...
با تاریکی بکشێتەوە...
دەنگی سروود
بزرێتەوە...
ئاسۆی هیوا
بکرێتەوە...

*

بدەن لە زەنگ
بدەن لە زەنگ
دەرودەشت و چەم و چیا
بێتە لەرزین
بەزڵە و دەنگ
ئالآی... ئاڵمان
بکەوێتە...
قاقای بەکوڵ
شەماڵ بهێنێ بۆنی گوڵ
بگاتە دڵ
با شەوغمی بەهاری تەڕ
لێوی بەبار
پاراو بکا
فرمێسکی چاو بشواتەوە
لەسەر لێوی گوڵ و چرۆ
مەلێ هیواش
بیخواتەوە

***

## بای بەڕە کۆن!

ڕۆژنامەی برایی ژ ٣٩٢ ساڵی دووەم شەممە ٥/ ١٠/١٩٦٨

وات کرد بە باو
ئەی پچڕێنی زنجیر و داو
خەریکی (کل) ئەکەیتە چاو
ئا ئەو چاوەی بەژیلومۆ
بەکلچێوکی ئاگری سوور
هەڵت کۆڵی
دەرت هێنا
ترس و بیم بێ بڕوابیت
هێنا و لەناویا دات چێنا!
جارچیت خستە ناو ئاوایی
کە دڵپاکی



کە زۆر چاکی
دیوەخانت لەسەر پشتە
دەمەتەقێ گەرم و گوڕە
یەکی یەکی و کوڕە کوڕە
هەموو جەمن
دەس لە دەس و، دەم لەدەمن
هەر کەس هەرچی ئەڵێ،
بلێ
جۆگە و سەراو جۆماڵ ئەکەی
تا ئاو بگاتە گشت گوڵێ

*

وات کرد بە باو
کە لەمەو دوا
پەنا بەخوا
پشت ئەکەیتە شەوانی ڕەش
ڕێگای کاروان ناکەی بە هەش(١)
پەرتووکی کۆن ئەسووتێنی
شتی خوراو کاوێژ ناکەی
هیچ فەرمانێ، هیچ کردارێ
بە بێ پرس و ڕاوێژ ناکەی
هەتا هەویر ئاو بکێشێ
تۆ ئەی شێلیت
جێی ناهێڵێت
لەسەر دەرخۆنەی گفتوگۆ
ئەیکەی بە نان
نوێردووی ئەکەی بۆ هەموومان
ئەوەش کەوا کاسەلێسە،
پاشخوان خۆرە
گێرەشێوێن و بێ بارە،

(١) هەش: قوڕی خەست.

جلوبەرگی جۆراوجۆرە
کەوچک نابن لە کاسەدا
نوختە نابن لەم باسەدا!!
ئێمەش هەموو وتمان:
کاکە
ئەمەی ئەی ئەیلێی شتی چاکە
نەوای سبەی – کە ڕۆژ هەڵات –
(سینەی بێ کینە سەڵاوات)

*

کەچی هەرچەند لات گرانە
وام لێ دیارە
چونکە جێگەت لەسەر شارە،
لووتت لە زۆر شتان خوارە!
دوێ کە چوویتە سەر کۆنەچاڵ
بێ پرس و ڕا
لە کای کۆنت بە با ئەکرد
ڕێت بە خەرمانی نوێ ئەبرد
فووت کرد بەکۆنە زوڕنایا
خەڵک هەڵپەڕن!
وەکوو بڵێی هیچ تێ ناگەن
لاڵ و کەڕن!
ڕێبازی خۆت هیچ نەگۆڕی
ئاشەکۆنت خستەوە گەڕ
باراشت لێ خستەوە سەر...

*

مام کەیخوا
بۆ خاتر خوا
چۆن وا ئەبێ، پێم بڵێ چۆن
هاتیەوە سەر بای بەرە کۆن!؟

***



## بۆ بژار و بۆ فرۆ(*)

١٩٩١/٨/٢٧

خۆ من ویستم دیارییەک بێنم بۆتان
کلا دیوارێ بنەخشێنێ
لە دوورەوە خۆی بنوێنێ
گوڵێک پایز. گوڵێکی کەی وەک بەهار بێ
سورەییا بێ، سورەییای چی
گەلاوێژی پرشنگدار بێ
مانگ بێ،
لە پەنجەرەی دووەم قاتا هەتا سەیوان
ڕوون کاتەوە
خۆر بێ و لە ئاسۆی خۆرنشینی شار
بەڵام ئەفسووس
دەک دەستکورتی خەجاڵەت بێ.
وەک ئەم ساتەم بێ حاڵەت بێ.
شیعر وتی خەمی ناوێ... ئەوە منم
بۆ، نازانی چەن مەزنم؟!
دەبمە هاوڕێی «بابی جوتیار»
وەکوو «فرۆ» دەبمە کۆرپەی دایە «زێنەب»
لەناو دەفتەری «وەرزێر»ا، دەبمە وانە
لەگەڵ مەلەکانی «بژار» دەچمە قەفەس و هێلانە
وەکو «فێنک» دەبمە فێنکایی بۆ «جووتیار»
بۆ ناو باخ و ئینجانەکان...
دەبمە گوڵباخ، دەبمە هەنار
ئەگەر لە تۆیی دەفتەرابم
ئەگەر لەسەر رەفەییێک بم
ئەگەر هاودەمی سۆزێ بم
ئەگەر ڕازی خەندەییێک بم

(*) بژار و فرۆ دوو منداڵی شەهید عەلی بۆسکانین و لە ساڵڕۆژی لە دایک بوونیاندا ئەم شیعرەیان پێشکەش کرا.

من هەر گەورەم
من جوانترین دیاریم و جێگەم دیارە
چەکی دەستی شۆڕشگێڕم
سروودی ڕێی هەژارانم
قوڵپەی خوێنی گەرم و گەشی دەمارانم
ئاڵتوون سارد و زەرد و سڕە
دەروونی من بە خەم پڕە
خەمی گەل و نیشتمانم
سۆزی کورد و کوردستانم
بیر و باوەڕ لەتەک منا پیرۆزەن و تێکەڵاون
لەکن هەموو خۆشخوانێک و خاوەن خوانێ
لەسەر سەرن لەسەر چاون
منی شیعر زۆر مەزنم، بەرزە باڵام
لەسەر شورفەی گشت بنیادێ
وەکوو ئاڵام
وا ئەم ساڵە بوو بە دڵ و من
لە ناخی گرتووە
خاو و خێزان بۆ پێشوازیم چرای ڕێزیان هەڵکردووە
هەموو بژین خۆشبەختانە
ئەمە هەوای ئازادییە،
ئەمە هەوای سەربەستانە

***

## خۆ تۆ دایکی!

قەت بە بیرو ئەندێشەما نەدەهات
دەنگ هەڵبڕم لە ڕووی ژنا
من دەروێشی جوانییان بووم
من فەرهادێکی شیرین و
کاکە مەمی خانییان بووم
تانسۆ خانی لەمەڕ ئەوان،



تانسۆ چیللەر
خوشکە تاقانەکەی هیتلەر
ئەو بوو بەهۆ، دەنگ لە ڕوویاندا هەڵبڕم
هەر دڵێکم بۆ بوون
هەمووی بە نەفرەت
هەڵدڕم!
ئای کە شاعیر بوو بە قوربانی تیلەییێک لە چاوی ژن ئای
کە فەرهەنگی هەڵتەکان
بۆ نازناوێک بۆ ناوی ژن!
ئای کە ئەستێرەی وشەی خۆی،
کرد بە بارانی مرواری
بەسەر خەندەی لێوی ژنا دادەباری!
ئای کە شاعیر بێ ئاگایە...
بۆ نەیزانی...
بەدفەساڵە ئەم دنیایە!؟
کە ژن بوو بە دێڵە گورگێ
ژیان چەندێ بێ بەهایە؟!
تانسۆ چیللەر! خۆ تۆی ژنیش
دێڵە گورگی ئەم سەردەمەی!
تۆش هەر لەنگەی ئەو بەرهەمەی،
کە سیستەمی نوێی جیهانی هێنایە گۆڕ
بەرهەمێکی بەدفەساڵی
نەڕەحمیت و نە ئامێزی... تۆ کۆسپیت تۆ
پێچاڵی
تانسۆ چیللەر!
دێڵە گورگی باڵداریت و چنگت هەیە...
تۆ لمۆزت خوێناوییە
تۆ زمانت بۆرە مارێکی دێمییە و نێزەیێکی ژاراوییە!
بنە پێکی «ئەتاتورک»ی جۆنتای تورکی دەتخۆنەوە!
هەمان بەرگی خوێناویشت لەبەردایە

هەزار جاریش بتشۆنەوە!
تانسۆ چیللەر!
ئەی دایک و ژن!
سەرو عوزری خۆت شوشتووە؟!
لەبەردەمی بێشکەیەکدا،
شەوێک خەوت لێکەوتووە؟!
«تانسۆ چیللەر»
ئەی دایک و ژن!
دڵی پیاوێکی بەدبەختت هەژاندووە؟!
ساوایەکت لە ئامێزا خەواندووە؟!
ئەی چۆن پەنجاو هەشت فڕۆکە
دەدەی بەدەم ئاسمانەوە؟!
دەیان فرسەخ ڕێگای مردن بپێچنەوە،
بۆ سەر دروشمی خنکاوی ئاشتیخوازان؟!
بۆ سەر منداڵی ساوامان
بۆ سەر داستانی داوامان
بەرەو هەناسەی بێ پشووی «پێ، کاف، کاف» مان!
بەرەو چاوی داپچڕاوی سینەی سافمان.
چۆن دڵت هات. خۆ تۆ ژنیت. خۆ تۆ دایەیت.
خۆ تۆ وتیان ئەوەندە نەرم و نیانیت، وەکو سایەیت!
خۆ تۆ، وتیان: چەپکە گوڵی ئەم سیستەمی نوێی
دنیایەیت
تانسۆ چیللەر!
دێڵە گورگی ئەم سەدەیە!
کورد کوژی نوێ...
لە کوێوە دێیت، دەچیت بۆ کوێ؟
تانسۆ چیللەر!
چنگ خوێناوی، لچ خوێناوی..
چەند بەدناوی
تۆ پاشماوەی پەتای باوی



پەتای باوی کورد کوشتنی جاری جاران..
ڕەگەزپەرستی قڵوولی ناو زێرابی کۆنە شاران!
وەکوو جەرگی ئێمەت سووتاند، جەرگت سووتێ...
گیانت وەکو دەرۆزەکەر
لە پێش دەمی بازاڕی نوێی ئەورووپادا، هەر هەڵتووتێ!
تانسۆ چیللەر!
تۆ، لە – ئەتا...– تیژتر نابی!
تۆ، لە – پەتا – پیستر نابی.
تۆ هەر ئەوێت..
تۆ هەر ئەمی
دێڵە گورگێکی سەردەمی!
بنە پێکی ئەوانگەلیت و جێماوی
بەڵام تۆ زیاتر ترشاوی
بەڵام تۆ زیاتر بەدناوی!
ئێمەی کوردیش خاک و خوێنین
مێژووی دوور و خاوەن شوێنین
تانسۆ چیللەر!
ئێمە هەر دێین! ئێوەش دەڕۆن!
ئێمە هەر نوێ دەبینەوە...
ئێوەش دەبنە زێرابی کۆن!
تانسۆ چیللەر!
خوشکە تاقانەکەی هیتلەر،!

***

## خاک و خەڵک

شۆڕەسواری ڕێی خەبات و ڕابەری...
چینی زەحمەتکێشی کوردی قارەمان
حیزبی فەهد و هاوڕێیانی حەیدەری
تۆی کلیلی قفڵ و بەندی چارەمان
ئەو سروودەی قەت لەبیر ناچێتەوە
تین و تاوی ڕەزمی هەوڵی ئەم گەلەی

ڕەوتی مێژوو شوێن دەسی ناسیتەوە
وەک چرای خۆش هەڵکراوی ئەم هەلەی

ئەمڕۆ ئامانجی گەلانی سەر زەمین
ڕوونە تانەی تیا نەماوە پوخت و پاک
مافی چارەنووسە مەرجی ڕێی ئەڤین
خۆشەویستی حیزبی ئێمەن خەڵک و خاک

ڕۆژی زۆرداری بەسەرچوو ئەم دەمە
تەخت و بەختی دادەڕووخێ و ڕۆدەچێ
حەشا و نەشری ملهوڕانی عالەمە
یەکێتی گەل، بانگی ئێمەی بۆ دەشێ

ئەی شەهیدانی وڵاتی خوێن و خەم
هەر لە دڵمانا دەژین و ڕابەرن
تا لە خاکمانا بمێنێ ڕووی ستەم
سوێندی خەڵکە دوا نیشانەی لابەرن.

***

## سلێمانی

که هەڵپەڕکێ ماندووی کرد و دەستی بەردا
لەناو کۆشی کورسییەکدا خۆی کردەوە
وەک بەیانی
وام دەزانی شەو تاریکە و لە بەرزاییی
تاسڵوجەوە دەڕوانمە سلێمانی

***



## کورتە شیعر

لەسەر گۆنات خەیاڵی ماچ وەکوو بولبول چریکەی دێ
لە دارستانی پەرچەمتا مناڵی دڵ زریکەی دێ

***

چاوەکانی «نازە» ئەمڕۆ پڕ لە سیحری ڕووی شەمن
جووتێ پێکی مەست و مەنگی دوو «خەیام»ی هاودەمن
بۆ یەکەم، ئاوی حەیاتە، چۆنی ویست ئەیخواتەوە
بۆ دووەم خۆزگە و هیوایە، خەم نەبێ نایباتەوە

***

ئەو هەناسەیەی هەڵدێ لەسینەت با بێ بەڕووما
بەناو تەمەنی پڕ لە ئەشکەنجەی ئەمێستا و زووما
وەک شنەی بەهەشت تەوژم ئەدا بەگیانی پەستم
بەهیوا و ئارام، بەخۆزگە و تاسە و بەشیعر و هەستم

***

هەڵی بێنە چاوەکەت، هەڵم پەڕێنە وەک شێت
وریا بە نەتسووتێنم ئاهم بدا لە هەر کوێت
تیری ئەو چاوە تیژەت مەگرە دڵی بێ نەوام
دڵم شووشەی ناسکە بەتیشکی چاوت ئەشکێت
مخیّر بم لە نێوان دنیا و پێکی چاوی تۆ
هەموو دنیا لەلایەک، مژێ لەو چاوەم ئەوێت

***

دەگێڕنەوە، دەروێشێ بوو، خۆفی عیشقی لەدڵا بوو
قەتار لەدەشتی گەرمیانا، وەکوو سمڵ، لەگڵا بوو
(ئەڵڵاوەیسی) زادەی بەهرەی ئەو دەروێشە دڵپاکە بوو
وەکوو ئاوی ڕەوانی گیان، تێکەڵاوی ئەم خاکە بوو.

***

هۆ... جوانکیلەکە، چاوانی گەشتم تێ بڕە
بەرەو مەزرای لەشی پاکت نەوسی ئاوارەم لێخوڕە
لە جۆگەلەی نێو مەمانتا تێر عارەقت بخواتەوە
بەزمانە تامەزرۆکەی جێ نەفخی خوا هەڵداتەوە

لەباوەشە نەرمەکەتا خەوێکی قوولّی لێ کەوێ
هەتا ئیتر بۆ یەکجاری بەدڵنیایی ئەسرەوێ

***

کە ڕوانیمە چاوەکانت هەموو دونیای گرتبووە خۆ
ئەی چاو پیاڵەی دەستی مەستان تۆ بۆ منو منیش بۆ تۆ
ئەوسا، کاری خوداوەندی نیگارکێشمان لا ڕەوایە
کە هەناسەی شاعیرەکان لە چاوی جوانی تۆ دایە

***

هۆ.. جوانکیلەکە، چاوانی گەشتم تێبڕە
بەرەو مەزرای لەشی پاکت، نەوسی ئاوارەم لێخوڕە
لە جۆگەلەی نێو مەمانتا، تێر عارەقەت بخواتەوە
بەزمانە تامەزرۆکەی، جێ نەفخی خوا هەڵداتەوە
لە باوەشە نەرمەکەتا خەونێکی قوولّی لێ کەوێ
هەتا ئیتر بۆ یەکجاری بەدڵنیایی دەسرەوێ

***

وام لە ترۆپکی بووندا دەخزێم بەرەو لێژگەی عەدەم
هەرچەند نەوەی سەدەی خەمم زەنگ و ڕەنگی دەیان سەدەم
بەشایەت بن، قودس و قیبلەم مەزرای شەهیدانی کوردە
بۆ ڕامووسانی خۆڵیشیان، سەر لە ئاستی سوجدە دەدەم
١٩٩٣/٩/٢٠

***

کەمن دەبمە ڕەوەزی جووتە ئاسکی چاوەکانت
خواوەند دەڵێ: ئیتر بەستە، ئەوە لەجێی ئاو و نانت

***

بەخ لەو چاوە، لە چاوی پیس بەدوور خوایە
تەپەی دڵمی شێواندووە، چ سیرێکی خوایی تیایە؟!

***

دەبێ شەڕێ بەرپا بکەم ئەمجارە دەستم بیگاتێ
دەم و لێوی ئەو نوقوڵە، بۆچی نوقڵانەم نەداتێ؟!

***



نزای من بوو قۆبچەی یەخەت دیسانەوە کرایەوە
دای مەخەوە، خۆ ئەمجارەش چاوم لەوێ جێمایەوە
١٩٩٠/١٢/٢٨

***

بەقوربانی خەمیشت بم
چونکە وەکوو خۆت نازدارە
خەمی تۆ گشتی خۆم ئەیخۆم
ئەگەر کێشی هەزار بارە...

***

لە ئولکەی عیشقدا بێ چوونە سەر دار
بەئاسانی مەزانە بوونە سەردار
هەیە گەر عیشقی سەرداری لەسەرتا
بکە مەشقێ لەوانەی چوونە سەر دار
١٩٩١/٢/١٥

***

خەڵەفاوێ پارێنێکیان بۆ ڕادەگرت
سواری ببێ
پارێن خۆی دا بەزەویدا بەبێ ئەوەی
باری ببێ
شێتێ بەوێدا تێپەڕی بەبێ ئەوەی
کاری ببێ
وتی تڕحێو لەم دنیایە
گۆماوێکە زۆر لیخنە و خەڵتە و خۆڵە
لە بنیایە

***

خۆزگە بەجامی لێوە ئاڵەکەت
شەرابی ماچم تێر ئەخواردەوە
لەناو بەهەشتی سینە و مەمیشتا
شەوێک تا بەیان، خۆم ئەشاردەوە
١٩٨٩/٨/٥

***

ئەپارتمانی شنەی باڵای
کۆی ئاژانسی دەنگوباسە
من چۆن نابم بە کۆمۆنیست
لەسەر مانەفێستی مەمکی
ئارمی سووری چەکوش و داسە؟!
***
بێجگە لە خوا، گەر مەوجودێک
بەپەرستن شایان بوایە
بێ گومان بە، تا مردنم
تۆم ئەپەرست، تۆ ئەی دایە
***
پێکی لێوت پێشکەش بکەی
موعتادەکان ئیتر بادە ناقۆزنەوە
خۆری چاوت بەپەرچەمت بشاریەوە
زاهیدەکان ڕێی مەیخانە نادۆزنەوە
***
ئەوەی بەتیلەی چاوی تۆ
دڵ و گیانی لەدەست بدا
ڕۆژی حەشر خۆی شەهیدە
ئەوەی لە تیری چاوی تۆ خۆی لابدا
دەروێشێکی زۆر بەلیدە
***
خوایە دەتۆ دەرگەی باخی
ئەو سینەیەم بۆ بکەوە
بەهەشت بەکێ دەدەی بیدە
عقبام دۆزەخ و ئاگر بێ
ئەمڕۆم کازیوە و سفیدە
***
بن باخەڵت بەو تۆزقاڵە
نەرمەمووەی تیا ڕواوە
وەک هێلانەی کەنارییە و



بەتازەیی چۆڵ کراوە
***
گەر سروەیەک لە سروەوە
بگاتە ناخی ئەم دڵەم
گوڵێک بدا لە بەرۆکی
باوەڕ بکەن من ئەو گوڵەم
لە پێشدەمی باڵای تۆدا
وەکوو بەندە لەسەرچۆکم
چاوم لەسینە و بەرۆکتە
من وەک ساوای گرینۆکم
***
سۆزان، شەهێنی چاوەکەت
کۆتری چاومی دا بەدارا
ئەبڵەق بووم و هیچ کەس نەبوو
پەلکێشم کات بەناو شارا
بۆی بگەڕێ دڵم لەلات بەجێماوە،
لە ئەبرۆتا، یا لەسەر لێو قەتیس ماوە
یا بەتاڵی برژانگێکتا هەڵواسراوە
یا لەسێبەری گەردنتا مابێتەوە
من چۆن بژیم. تۆ پێی بڵێ بابێتەوە
ئەگەر لەدادگای عەشقیشا بمدەن لە خاچ
مافی خۆمە و لە تۆم دەوێ... نوقڵێکی ماچ!
***
لە دەرگات دا...
ڕاچڵەکیم و بەبێ فەرموو هاتیە ژووریێ
ڕۆژباشت کرد وەڵام نەبوو
وەهات زانی کە من خەوتووم
خۆ تیرۆریستێ نەیکوشتووم
بێ بەڵا بێ پەخشی ئەمڕۆت
بۆ نازانیت من بەشەوارەی تۆ کەوتووم؟!
***
چەند جێژوانم دەستنیشان کرد

ئازیزەکەم تۆ نەهاتی
دەبوو ئێستە تۆ دادگابی
کەچی هێشتا هەر شکاتی!

***

١٩٩٣

کە سیاسەت بەقەیرانێ ئاوس دەبێ
دەترەکێت و شەڕێکی نارەوای دەبێت
زۆڵەکی وا کەڵەگاییێکی چەمووشە، لەباب و دایکی خۆی هەڵدێ
دەشبێ بەچێرێکی خوێڕی... کەوتە کۆڵان
لە بابی خۆیشی بەکەڵ دێ!
دێڵە شڕە و خۆی دەفرۆشێ فەرەنگی و ئایدزی پێیە
ناشێ لەلای ئەو نامێنێ هەموو گیانی هەردەشێیە!
گەڵی کولگەی دزەکانە و گوێی ئاپۆرای قاچاخچییە و
دەمی زێیە،
دووپشکە، مارە، سیسرکە، بزنمژە و هەزارپێیە!

***

دیققەت... دیققەت، ئەمجارەیان هەڵۆیەکی بەرزەفڕەو
بەئاسمانی کوردستاندا لە باڵ ئەدا
لەگەرمەسێری کەرکووکدا تینی گڕی ئاگرەکەی باوەگوڕگوڕ
لە فێنکایی بێخاڵ ئەدا...
بۆ پێشوازیی شەهیدانی ڕێگەی باوەڕ و ئازادی
گوڵاو لەڕێی شەماڵ ئەدا
شێرە کوڕە، کاکە (حەسەن) برای هەژارانی کوردە
بۆ سروودی ئازادیخواز وا لە زەنگی زوڵاڵ ئەدا
٩٦/١١/١١

***

خۆزگە بەجامی لێوە ئاڵەکەت
شەرابی ماچم تێر دەخواردەوە
لەناو بەهەشتی سینە و مەمیشتا
شەوێ تابەیان خۆم دەشاردەوە

***



قەت نەڵێن پیرە و هۆشی نەماوە
دەم دەنێم وەجێ نەفخی خوداوە

***

لە مەیخانە دوای مربوونم کە هەڵدەسم بڕۆمەوە
لێوت بکەی بەمەزەی نوێ
بەشی غوسڵی شەرابی تر دەخۆمەوە

***

## کوردم

کوردم، کوردێکی دڵسۆزی کوردان
گرتوومە ڕێگای ڕێبازی مەردان
کوردم، دڵسۆزی ئەم کوردستانەم
قۆچی قوربانی ئەم نیشتمانەم
کوردم، ئایین و باوەڕم دیارە
هاوڕێی زۆربەی کوردی هەژارە
دینم وەک دینی جووتیاری کوردە
ڕێگاشم ڕێگای زانیاری کوردە
لەگەڵ کارگەڕان ئایین و بڕوام
بیر و ئامانجم یەکن وەک هیوام(١)

***

(١) کوردم، ب. خەبات «باوکی خەبات»، حەسیب قەرەداخی، ڕۆژنامەی برایی ژمارە (٤٢٥) عەرەبی، ساڵی دووەم، ١٩٦٨ ل٩.



شاعير لە تافى لاويدا
قەرەداخ - سۆلە





دهۆک
١٩٧٨/٧/١٩



سلێمانی-زانکۆی سلێمانی
نیسانی ١٩٨١



له باخچەی یەکێتی نووسەران - سلێمانی
لەگەڵ مستەفا ساڵح کەریم



له نێوانی ڕۆشنبیراندا
هۆڵی گەل- هەولێر





له کۆڕێکدا
١٩٧٩/٢/١٩



شاعیر لە کۆنگرەی
یەکێتی نووسەرانی کورددا



لە ڕاستەوە: ئومێد ئاشنا ، شێخ حەسیب قەرەداخی، شێخ عەفان نەقشبەندی
١٩٩٢/٩/١٧





شاعیر لەگەڵ هونەرمەند لالۆ رەنجدەر
١٩٩٢/٩/١٧



لە ڕاستەوە: کەمال شاکر، عیزەدین مستەفا رەسوول، حەسیب قەرەداخی

## ناوەڕۆکی

### بەرگی یەکەم

# ناوەڕۆکی

بەرگی دووەم

## دوا سەرنج

لە ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەدا بەشێوەیەکی تایبەتی، بەڕێزان دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین و، ئەحمەد محەمەد ئابلاخی و ڕۆژنامەی کوردستان - ئۆرگانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و شێخ عەفان نەقشبەندی و لالۆ ڕەنجدەر چ بەناردنی دەستنووس یان وێنە و بەڵگەی جۆراوجۆر هاوکارییان کردین و سوپاسیان دەکەین. لەو بڕوایەشداین کە هێشتا شیعر و دەستنووسی دیکەی شاعیر لێرە و لەوێ لای دۆست و یارانی و لەناو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا ماون کە ئومێد دەکەین لە داهاتوودا بۆمانی ڕەوانە بکەن یان بیاندۆزینەوە و وەک پاشکۆیەک بۆ ئەم دیوانە سەرجەمە بڵاوی بکەینەوە.



## ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی

تکا لە نووسرانی بەڕێز دەکەین:

*بۆ بڵاوکردنەوەی نووسینەکانیان لە دەزگای ئاراس تکایە ڕەچاوی ئەم ڕێنووسەی خوارەوە بکەن کە پەسندکراوی کۆڕی زانیاری کوردستانە:*

**یەکەم:** گیروگرفتی پیتی (و).

نیشانەی (و) لە زمانی کوردیدا بە شێوەی خوارەوە دەنووسرێ:

١- پیتی (و)ی کورت، واتە (و)ی بزوێنی کورت (و: u)

بۆ نموونە: **کورد. کورت. کوشت.**

Kurd. Kurt. Kust

٢- پیتی (وو)ی درێژ، واتە (وو)ی بزوێنی درێژ (وو: û )

بۆ نموونە: **سوور. چوو. دوو.**

Sûr. Çû. Dû

٣- پیتی (و)ی کۆنسۆنانت (نەبزوێن). واتە (و: w)

بۆ نموونە: **ئاوایی. وەرە. هاوار. ئاو**

دەنگی (و) لێرەدا هەندێک جار لە زاراوی کرمانجیی سەروودا دەبێ بە دەنگی (ڤ)

Awayî (Avahî). were. Hawar. Av

٤- پیتی (ۆ)ی کراوە. واتە (ۆ: o)

بۆ نموونە: **دۆڵ. گۆڕ. نۆ.**

Dol. Gor. No.

**دووەم:** گیروگرفتی پیتی (و)ی سەرەتای وشە.

هەر وشەیەک بە پیتی (و) دەست پێ بکات بە یەک (و) دەنووسرێت.

بۆ نموونە: **وریا. وڵات. وشە. ورد.**

wirya. wilat. wise. wird.

**سێیەم:** گیروگرفتی پیتی (ی):

نیشانەی (ی) لە زمانی کوردیدا بە شێوەی خوارەوەیە:

١- پیتی (ی)ی بزوێن. واتە (ی: î).

بۆ نموونە: **زەوی** – Zewî

٢- پیتی (ی)ی کۆنسۆنانت. واتە (ی: y)

بۆ نموونە: **یار** – yar

• **سەرنج** ١: پیتێکی (ی)ی بزوێنی فرە کورت هەیە کە لە نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی لاتینیدا نیشانەی (i)ی بۆ دانراوە وەک لە وشەکانی: من – Min ، کن – Kin ، ژن – jin. ئەم نیشانەیە لە

نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبیدا نییە.

• **سەرنج ٢**: نیشانەکانی (ی)ی بزوێن و (ی)ی کۆنسۆنانت واتە (î) و (y) لە پیتی عەرەبیدا هەردووکیان هەمان نیشانەی (ی)یان هەیە بەڵام لە ڕاستیدا لە یەکتر جیاوازن و لە کاتی بە دوای یەکتر هاتنیاندا دەبێ هەردووکیان بنووسرێن.

وەک: **نییە. چییە. دیارییەکە. زەوییەکە.**

Nîye. Çîye. Dîyarîyeke. Zewîyeke

• **سەرنج ٣**: لە کاتی هاتنی سێ پیتی (ی) بە دوای یەکتردا وەک لە وشەکانی (**ئاوایییەکەمان**...) (**کۆتایییەکەی**...) (**وەستایییەکی**...) (**کۆتاییی بە کارەکە هێنا**) دەبێ بەسەر یەکەوە بنووسرێن، واتە سێ (ی) بە شێوەی (ییی) بە دوای یەکتردا دێن.

(Westayîyeki....) (Kotayîy be Kareke hêna)

**چوارەم**: گیروگرفتی پیتی (ڕ)ی گران، واتە (ڕ)ی نیشانەدار. ئەم پیتە لە هەر کوێیەکی وشەدا هات دەبێ بە نیشانەکەیەوە بنووسرێت. واتە لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی وشەدا هەر (ڕ)ی گرانی نیشانەدارە.

وەک: **ڕۆژ. بڕیار. کەڕ.**

**پێنجەم**: گیروگرفتی پیتی (و)ی بەیەکەوەبەستن (عطف):

پیتی (و)ی بەیەکەوەبەستن، بە شێوەیەکی جیاواز لە وشەی پێش خۆی و پاش خۆیەوە دەنووسرێت و مامەڵەیەکی سەربەخۆی لەگەڵدا دەکرێت.

بۆ نموونە: **من و تۆ. ئارەزوو و وریا.**

• **سەرنج**: لە هەندێک وشەی لێکدراودا پیتی (و)ی بەیەکەوە بەستن بووە بەشێک لە هەردوو وشە لێکدراوەکە و بە هەموویان وشەیەکی سەربەخۆیان دروست کردووە.

وەک: **کاروبار. دەنگوباس. ئەلفوبێ. هاتوچۆ.**

لەم بارانەدا مامەڵەی سەربەخۆ لەگەڵ پیتی (و)ی بەیەکەوە بەستندا ناکرێت و وشەکە هەمووی بەسەریەکەوە دەنووسرێت وەک لە نموونەکاندا پێشانمان دا.

**شەشەم**: وشەی ناسادە چ ناو بێ یان زاراوە دەبێ بەسەریەکەوە وەکو یەک وشە دەنووسرێن. وەک:

ناو: **چەمچەماڵ. بێکەس. دڵشاد. زوورگەزراو. بێخاڵ. ناڵپارێز. میاندواو. کانیکەوە. سپیکرە.**

زاراوە: **ڕێنووس. ڕێپێوان. دەسبەجێ. جێبەجێ. نیشتمانپەروەر. دەستنووس. دەسبازی. وڵاتپارێز. ئازادیخواز. دووشەممە. سێشەممە. پێنجشەممە. یەکسەر. ڕاستەوخۆ. یەکشەوە** (مانگی یەکشەوە).

**حەوتەم**: پیتی (ت) لە کۆتای کار (فرمان)دا دەشێ بنووسرێت و دەشێ نەشنووسرێت.

وەک: **دێت و دەڕوات** (یان) **دێ و دەڕوا.**

**هەشتەم**: نیسبەت لە زمانی کوردیدا زۆربەی جار بەهۆی پیتی (ی) لە کۆتای ناودا دەکرێت.

وەک: **پێنجوینی. هەولێری.دهۆکی. شێخانی.**

هەروەها ئەم نموونانەی خوارەوە:



ئەحمەدئاوا: **ئەحمەد ئاوایی**

یارمجە: **یارمجەیی.**

توززخورماتوو: **توززخورماتوویی.**

شنۆ: **شنۆیی.**

ئاکرێ: **ئاکرێیی** (یان) **ئاکرەیی.**

لادێ: **لادێیی.**

• **سەرنج**: ئەو ناوانەی خۆیان بە پیتی (ی) تەواو دەبن پێویست ناکات (ی)ی نیسبەتیان بخرێتە پاڵ. وەک:

سلێمانی: **کامەران سلێمانی.**

کانیماسی: **حاجی حوسێن کانیماسی.**

ئامێدی: **ئازاد ئامێدی.**

**نۆیەم**: هەر وشەیەکی بیانی چ هاتبێتە ناو زمانی کوردییەوە، یان هەر ناو و وشەیەکی تر کە لە نووسینی کوردیدا دێتە پێشەوە، دەبێ بەڕێنووسی کوردی بنووسرێت.

وەک: **ئەڵڵا. قەڵەم. ئەکبەر. قاهیرە. ئۆتۆمۆبیل. دۆستۆیڤسکی.**

**دەیەم**: ئامرازی (تر، ترین) کە بۆ بەراورد بەکاردێن دەبێ بەوشەکانی پێش خۆیانەوە بلکێنرێن. وەک:

**جوان: جوانتر – جوانترین.**

**خاو: خاوتر – خاوترین.**

• **سەرنج**: ئەم ئامرازەی (تر) جیاوازە لە وشەی (تر) کە بەواتەی (دی، دیکە) دێت. ئەمەی دوایی دەبێ بە جیاواز لە وشەی پێش خۆی دەنووسرێت.

وەک: **ماڵێکی تر، چیی ترم ناوێ.**

**یازدەیەم**: جێناوی نیشانەی وەک: ئەم. ئەو. ئەڤ.

ئەم جێناوانە ئەگەر ئاوەڵکاری (کات – یان – شوێن)یان بەدوادا هات پێیانەوە دەلکێن و دەبن بە یەک وشەی سەربەخۆ.

وەک: **ئەمشەو. ئەمڕۆ. ئەڤسال. ئەمجارە. ئەمبەر و ئەوبەر. ئەڤرۆ.**

**دوازدەیەم**: نیشانەکانی نەناسراوی وەک ( ...یەک، ...ێک، ...ەک) بە شێوەی خوارەوە دەچنە سەر وشەکانی پێش خۆیان:

١- ئەگەر وشەکان بە پیتە بزوێنەکانی (ا، ی، ە، ێ) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (...یەک)یان دەخرێتە پاڵ. وەک:

**چیا: چیایەک.**

**زەوی: زەوییەک.**

**وێنە: وێنەیەک.**

**دێ: دێیەک.**

٢- ئەگەر وشەکان بە پیتە بزوێنی (وو) یان هەر پیتێکی دەنگدار (نەبزوێن: کۆنسۆنانت) تەواو بووبن

ئەوا نیشانەی (ێک – لە کرمانجیی خواروو) و نیشانەی (ەک)یان لە کرمانجیی سەروودا دەچێتە سەر.

**خانوو: خانووێک، خانووەک**

**گوند: گوندێک** (کرمانجیی خواروو)، **گوندەک** (کرمانجیی سەروو).

**ژن: ژنێک** (کرمانجیی خواروو)، **ژنەک** (کرمانجیی سەروو).

**سێزدەیەم:** گیروگرفتی پاشگرەکانی (دا. ڕا. وە. ەوە)

ئەم پاشگرانە بە وشەکانی پێش خۆیانەوە دەلکێنرێن. وەک:

دا: **لە دڵدا** (هەر برینێ کە لە دڵدا هەیە سارێژی کەن). (خەمێکم لە دڵدایە).

ڕا: **لە ئامێدیرا** (لە وێرا بەپێ هاتووین). (لە خۆڕا دڵی گۆڕاوە).

وە: لە چوارچراوە (لە وێوە هاتووین).

ەوە: بە ماڵەوە (بە ماڵەوە ڕۆیشتین).

(جارێکی تر نووسیمەوە). (خانووەکەم کڕییەوە).

• **سەرنج:** پاشگری (دا) جیایە لە وشەی (دا) کە فرمانە و چاوگەکەی (دان)ە.

وەک: **تیرێکی لە دڵی دا. تیرێکی لە دڵی داوم.** ئەم (دا)یەی فرمان بەجیا دەنووسرێ.

**چواردەیەم:** گیروگرفتی پێشگرەکانی (هەڵ. دا. ڕا. وەر. دەر)

١– ئەم پێشگرانە کاتێ دەچنە سەر چاوگ یان فرمان یان هەر حاڵەتێکی تر، پێیانەوە دەلکێن بەمەرجێ جێناوی لکاو نەکەوتبێتە نێوان پێشگر و وشەکەی دوای خۆی. وەک:

* چاوگ:

**هەڵ: هەڵکردن. هەڵگرتن. هەڵکورمان. هەڵکێشان.**

**دا: دابڕان. داخستن. دارمان. داکردن.**

**ڕا: ڕاگرتن. ڕاکێشان. ڕاپەرین.**

**وەر: وەرگرتن. وەرسووڕان.**

**دەر: دەرکردن. دەرهێنان.**

* فرمان:

**هەڵ: هەڵگرە. هەڵمەخە. هەڵکشێ.**

**دا: دانێ. دامەبڕە.**

**ڕا: ڕاکێشە. ڕامەپەڕێنە.**

**وەر: وەرگرە. وەرسووڕێنە.**

**دەر: دەربێنە. دەرخە.**

* حاڵەتی تر. وەک:

**هەڵکشاو. هەڵنەکشا. دانراو. ڕاپەڕیو. ڕانەپەڕیو. وەرگرتوو. وەرگرتە. دەرخراو. دەرکراو.**

٢– ئەگەر جێناوی لکاو کەوتە نێوان پێشگر و فرمانەکەی دوای خۆی ئەوا بەجیا دەنووسرێن و جێناوەکە بە پێشگرەوە دەلکێنرێ.

**هەڵ: هەڵم گرن. هەڵیان کەن. هەڵمان کێشن. هەڵمان مەواسن.**



**دا: دامان نەنایە. دایان خەن. دای بڕە.**

**ڕا: ڕایان دەگرین. ڕام کێشە. ڕام پەڕێنە. ڕاشیان پەڕێن.**

**وەر: وەرمان گرتایە. وەری نەگری. وەریان سووڕێنەوە.**

**دەر: دەریان پەڕاندین. دەری خە.**

**پازدەیەم:** گیروگرفتی وشەی لێکدراو.

ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی فرماندا بوو، بەجیا دەنووسرێن:

**ڕێک دەکەوین. پێکیان هێنایەوە. پێک نەهاتین. یەکیان نەگرتووە. دەستمان نەکەوت.**

بەڵام ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی چاوگ یان حاڵەتی تردا بوو ئەوا هەردوو وشەکەوە بە یەکەوە دەلکێنرێن.

وەک: **ڕێککەوتن. پێکهاتن. یەکگرتن. دەسخستن. یەکگرتوو. دەسکەوتوو. پێکهاتە.**

**شازدەیەم:** ئامرازی (ش)ی تەئکید کەوتە هەر شوێنێکی وشەوە دەبێ بە بەشێک لە وشەکە و نابێ بە هۆی لەتبوونی وشەکە. وەک: **بشتەوێ ناتدەمێ. نەشخۆی.** گوتی دێم... **نەشهات. نەشمانگرتن. بشمانبەن.**